عەلی حەرب

# بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان

## دروستکردنی ژیانی هاوبەش



لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

عەلی حەرب

# بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان

## دروستکردنی ژیانی هاوبەش

لە عەرەبییەوە
**هەڵکەوت عەبدوڵلا**

هەولێر ٢٠١٢

**دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریان**

ناوی کتێب: بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان

نووسینی: عەلی حەرب

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

لایەنی هونەری: خودی وەرگێڕ

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٣٥٠٠ دینار

چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠١٢

چاپخانە: چاپخانی خانی (دهۆک)

ماڵپەڕ: WWW.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان سپاردنی ژمارەی (٣٩٦) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە**

**زنجیرەی کتێب (٦٤٢)**

# تۆڕەکانی خوێندنەوە

قەیرانی جیهانیی ئێستا، بە ناوە هەمەجۆرەکان و ئاستە جیاوازەکانییەوە، هەموو خەڵکی بەبێ هیچ هەڵاوێردنێک سەرقاڵکردوە، چونکە بەهۆی تەقینەوە یەک لە دوای یەکەکان و سەرەنجامە کتوپڕەکانیانەوە، گشت وەرەقەکانی تێکەڵدەکات و حساباتەکان تێکدەدات، بەئەندازەی ئەوەی لەناخدا دەستکاریی بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان دەکات.

ئەم کتێبە هەوڵدانێکە بۆ توخنکەوتنی قەیرانەکە، لە رێگەی تاوتوێکردنی ئەو مەسەلە و کێشانەی پەیوەندییان بە وشەکانی بوون و ناونیشانەکانییەوە هەیە، وەک مۆدێرنیتە و دیموکراسی، یان ئاسایش و ئازادی، یان فەندەمەنتالیزم و شوناس، یاخود شەریکایەتی و پەرەپێدان. ئەمە وێڕای مەسەلەیەک، کە دەستپێکی گشت ئەولەویەتەکانە، ئەویش ژیانی هاوبەشە: چۆن دروستدەکرێت و بنیاتدەنرێت، یان بەڕێوەدەبرێت و سەرپەرشتیدەکرێت؟

توخنکەوتنەکە فرە ئاست و دەروازەیە، دەشێت لەسەر ئاستی نیشتمانی یان هەرێمایەتی بێت، بەڵام لەوانەشە لەسەر ئاستی جیهانی بێت. باشتریشە بەوجۆرە بێت، چونکە ئەو واقیعەی کەوتوینەتە نارییەوە، واقعێکی هەسارەیی گەردوونییە، تیایدا بەیەکداچوون و تێکهەڵکێشیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەکان لەوپەڕیدایە، جا ئەوە بەشێوەی شڵەژان و کێشمەکێشەکان بێت، یان وتوێژ و دانوستاندنەکان، یاخود هاوکاریکردن و ئاڵوگۆڕکردن.

بۆیە لەمڕۆ بەدواوە، هیچ یەکێک ناتوانێت گۆشەگیربێت، یان بانگەشەی ئەوە بکات کە تەنیایە، چونکە هەموان لەمبارەیەوە وەک یەکن: هەر یەکێک، لە رووی کارتێکران و کاریگەریخستنەوەوە، بەشێوەیەکی جیهانی تایبەتمەندیی خۆی پیادەدەکات. جیاوازییەکە تەنیا لە شێوەی پیادەکردنەکەو بەرەنجامەکەیدایە.

توخنکەوتنەکان یەکلایەنانە نین، بەڵکو ئەنجامی فرە کایە و کەرت، یان فرە

هێز و کاریگەرێتی، یان فرە ئاراستە و لایەن، فرە دەروازە و میتۆد دەبن. بەوجۆرە هەریەکەیان، بۆ تێگەیشتن و دەستنیشانکردن، دەروازەیەکی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵگەیی، کولتووری و ئەوانیتری هەیە...

ئەوەی لە کایەی مەعریفەدا کاردەکات، لەسەر ئاستی فیکری توخنی قەیرانەکە دەکەوێت، بەوپێیەی کێشەکە لەو تیۆر و قوتابخانە، یان میتۆد و مۆدێلانەدایە، کە لە ڕووی توخنکەوتن و چارەسەرکردنەوە ڕاستبێژیی خۆیان لەدەستداوە. بەپێی ئەم دەستنیشانکردنە، کێشەی بیریارەکان- ئەوانەی لە کایەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان و کۆمەڵناسی و ئابووریدا کاردەکەن- بەپلەی یەکەم لە بیرۆکەکانیاندایە. بۆیە ئەو ئەرکەی لە بنچینەدا دەکەوێتە ئەستۆی بیریاری پیشەکار، جا فەیلەسووف بێت یان زانا، کارکردنە لەسەر بیرۆکەکان، لەبەر ڕۆشنایی ڕووداوەکان و ئەزموونەکاندا، لەپێناو نوێکردنەوەی کەرەستە فیکرییەکاندا، ئەوانەی پەیوەندییان بە چوارچێوەکانی ڕوانین، یان تۆڕەکانی تێگەیشتن، یان میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە، یان شێوازەکانی مەعریفە، یان فۆرمەکانی بەئەقڵانیکردنەوە هەیە.

ئەمە کێشەی فەیلەسووف و ئەوکەسەیە کە لە بوارەکانی دەروونناسی، کۆمەڵناسی، ئابووری، سیاسەت، یان کایەکانی تری مەعریفەدا کاردەکات و پەیوەندیی بە تێگەیشتنییەوە هەیە بۆ حەقیقەت، یان گرێدراوی تیۆرەکەیەتی دەربارەی واقیع، یان مۆدێلەکەی بۆ لێکدانەوە، یاخود ستراتیژەکەی بۆ دەستوەردان.

لێرەوە قەیرانەکە لەوەدا نییە خەڵک و کارکەرانی کایە و بوارەکانی تر پشت بە تیۆرەکانی زاناکان و شارەزایان و خاوەن پرۆژەکان نابەستن، بەڵکو لەوەدایە کە ئەوەی ئەوانە دەریدەبڕن ڕاستبێژی و کاریگەرێتی لەدەستداوە و چیتر واقعێک دیارناکات، یان کێشەیەک چارەسەرناکات، بەڵکو سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی خراپتر واقیع بەرهەمدێنێتەوە.

ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی ئەو ڕووناکبیر و بانگەشەکارانە دەگرێتەوە، کە تیۆریزە بۆ کارەکانی چاکسازی و نوێکردنەوەو پەرەسەندن دەکەن. بەشێوەیەکی تایبەتیتریش بەسەر ئەوانەدا جێبەجێدەبێت، کە سەرقاڵی پاراستنی چەمکەکانی خۆیانن، بۆ ئەوەی ببنە مایەی هەڵبەستنی وەهمەکان، یان دروستکردنی بتەکان، یاخود چاندنی مینەکان. سەرەنجامیش لێکدانەوەی دروشم و چەمکەکانە بە دژەکانیان، لەسەر زەمینەی واقیعی زیندوو، کە بەهۆی ئابڕووچوون و کارەساتەکانییەوە، خاوەن بڕوا دڵنیاکان و ئایدیۆلۆژیا پۆڵایینەکان و تیۆرە سەرتاپاگیرەکانەوە، بەبێ ئەوەی بە مێشکیاندا بێت و چاوەڕوانی بن، تووشی دۆشدامان دەکات.

ئەگەر توخنکەوتنەکە هەمەجۆرو جیهانی بێت، ئەوا بەمانا پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکەی ڕەخنەگرانە دەبێت، چونکە توخنکەوتنەکە توێکاری و هەڵوەشاندنەوەیە، بەئەندازەی ئەوەی دانان و پێکهێنانە، بەشێوەیەک کە دەرفەت بۆ تێپەڕاندنی ئاستەنگەکان و گەشەپێدانی ئامرازەکان بڕەخسێنێ، بەئەندازەی دەرفەتڕەخساندن بۆ خستنەگەڕی بەدەستهاتوەکان، بەمەبەستی هێنانەدیی چەند دەستکەوتێکی نوێ.

بەم مانایە، ڕەخنەگرتن پشت بە ڕەتکردنەوە و دوورخستنەوە نابەستێت، چونکە شاردنەوە یان ڕەتکردنەوەی ئەوەی ڕوویداوە و ڕوودەدات دەگۆڕێت بۆ تەڵە یان تەنگەژەیەک، کە ئاستەنگ بۆ پرۆژەکان دروستدەکات، یان کارەکان مینرێژدەکات، هەتاکـو بەهێزێکی دوو ئەوەندە کاری خۆی بکـات، بەڵام بەشـێوە نێگەتیڤ و خراپـەکـەی.

لێرەوە، گرەوی توخنکەوتنەکە لەسەر خوێندنەوەی ئەوەیە کە ڕوودەدات، بە لۆژیکی گۆڕانی داهێنەرانە و پێکهێنانی بنیاتنەرانە، بەواتا هەرە فراوان و دەوڵەمەندەکەی. واتە سەرلەنوێ گونجاندن و ڕاهێنانەوە، یان خستنەکار و خستنەگەڕ، یان داڕشتن و پێکهێنان، یان یەکلاکردنەوە و ڕێکخستن، یاخود تۆژەنکردنەوە و تێکەڵکردن... واتە ئەو خوێندنەوە و شیکردنەوانەی دەشێت لە چوارچێوە و فۆرمەکان، یان کایەو تەوەرەکان، یاخود ئامراز و میتۆدەکانەوە بەدەستبێن... چونکە هەر توخنکەوتنێکی فیکری جیدی و داهێنەرانە، بەهۆی ئەو چەمک و شێوازانەوە دەبێت کە بنیاتنەر و بەرهەمدار، یان کاریگەر و هەنوکەیین و گرێدراوی سەرکەوتنە لە کارەکانی دۆزینەوە و ئاشکراکردنی میکانیزمەکانی پەردەپۆشکردن، هەڵخەڵەتاندن، دوورخستنەوە، هەڕەمەکیبوون و دەستبەسـەراگرتن.

لەهەمان کاتدا توخنکەوتنی ڕەخنەگرانە کراوەیە، بەئەندازەی ئەوەی لە ڕووی ناسینی واقیع و وێناکردنی جیهانەوە ڕێژەییە. مەبەست ئەوەیە، توخنکەوتنەکەش بانگەشەی بڕوامەندیی یەکلاکەرەوە یان کۆنترۆڵکردنی تەواوەتی ناکات، بەڵکو لەژێر پێداچوونەوەدا دەبێت و گرەوەکەشی لەسەر دۆزینەوەی دەستدان و فراوانکردنیەتی لە ڕێی کردنەوەی ئاسۆیەک یان واڵاکـردنی داخـراوێک، بزواندنـی هێزێـک یان خستنەگەڕی دەستپێشکەرییەک، خوڵقاندنی چوارچێوەیەک بۆ ڕوانین، یان دانانی ڕێسـا بۆ کارێک..

لەگەڵ ئەوەشدا توخنکەوتنی فیکری، بانگەشەی دانانی چارەسەرەکان ناکات، بەهۆی جێبەجێکردنی چەند مۆدێلێکی ئامادە، یان چەند تیۆرێکی توندوتۆڵ، یاخود چەند بیرۆکەیەکی پێشوەختەوە، بەڵکو ئەو توخنکەوتنە تاوتوێکارە، بەو پێیەش

چارەسەر و لێکۆڵینەوەکان دەربارەی ئەوەی پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی گشتی یان چارەنووسە بەکۆمەڵەکانەوە هەیە، پرۆسەیەکی ئاوێتە و بەرپرسیارێتییەکی دوولایەنەیە و هەموان بەشداریی تێدا دەکەن، هەریەکە و لە بوار و بازنەی کاری خۆیدا، بە جۆرێک کە هەریەکێک ڕەوایەتی و بەشی خۆی، یان ڕۆڵ و بەشداریکردنی خۆی لە بەرهەمهێنان، داهێنان، دیالۆگ و تاوتوێکردنندا هەبێت.

ئەگەر ئەمە بارەکە بێت لەسەر ئاستی کەرت، دەوڵەت یان ناوچەیەکی هەرێمایەتی، ئەوا باشترە ئەوە بارەکەش بێت لەسەر ئاستی جیهانی، چونکە بەرژەوەندی و چارەنووسەکان تێکهەڵکێش بوون. ئەمە ئەگەر بمانەوێ لە شکستخواردنی تیۆرەکان یان سوانی قوتابخانە و مۆدێلەکان، بێفیزی و هەڵهێنجانی وانە و پەندەکان پیادەبکەین، بۆ دەستنیشانکردنی واقیع و دۆزینەوەی دەروازەی دەربازبوون لە تەڵە و تەنگەژەکان.

ڕزگاربوون لە تەنگەژەکە پێویستی بەوەیە بەشێوەیەکی جیاواز بیربکەینەوە، بەجۆرێک کە لەگەڵیدا مانای بیرکردنەوە و ڕۆڵی بیریار گۆڕانیان بەسەردا بێت، هەروەها خودی پیادەکردنە فیکرییەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت. ئەمەش پێویستی بەوەیە خۆمان لە بانگەشەکانی جڵەوکردن و دڵنیابوون پاکبکەینەوە و واز لەوە بهێنین ڕۆڵی نمایندەی ئەقڵ، یان بەرجەستەکاری بەهاکان، یان خاوەنی کلیلەکانی ڕزگاربوون، یاخود ئەو مامۆستایەی حەقیقەت بگێڕین کە لەئاست کۆمەڵگەکەیدا لوتبەرزە، یان پێش ڕۆژگارەکەی خۆی دەکەوێت. چونکە هیچ کەسێک حەقیقەت بەدەستەوەناگرێت، هیچ کەسێکیش لە مەملەکەتی چاکەکاریدا نیشتەجێ نییە، یان بەرامبەر خەوشی و پەتاکانی کۆمەڵگەکەی بێتاوان نییە.

هەروەها پێویستە واز لەوە بهێنین وەک ئەو قاڵبە توندوتۆڵانە مامەڵە لەگەڵ بیرۆکەکان بکەین، کە بوونی زیندوو بچووکدەکەنەوە، یان وەک ئەو بەناو ئەژدیهایانەی دیانپەرستین، هەتاکو بمانچەوسێننەوە، یان ببینە نێچیریان، یاخود وەک زیادەڕۆیی ئایدیۆلۆژیانە، کە نیشانەی تێنەگەیشتنە لە ڕێڕەوی جیهان و گەشەکردنی کۆمەڵگەکان.

بیرۆکە بەپیتەکان بونیاد و نەخشەکانن، ئەو پەیوەندی و ڕایەڵانەشن، کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی و دروستکردنی ژیانی هاوبەشدا، وزەو کاریگەریی گۆڕانکاریخوازانەی بێوێنەی خۆیان هەیە. بۆیە ناکرێت بگۆڕێن بۆ چەند ماهییەتێکی نەگۆڕ، یان حەقیقەتێکی باڵاڕەو (متعالي). هەروەها هێمانین بۆ چەند شوناسێکی بێگەرد، یان خودێکی دەسەڵاتداری جڵەوبەدەست، بەڵکو چەند ئەزموونێکی زیندوو و تیاژیانی بوونخوازین کە لە ئارەزوویەکەوە هەڵدەقوڵێن، یان ئامانجیان بەرژەوەندییەکە، بەئەندازەی ئەوەی مەعریفەیەک دێننەئاراوە، یان دەسەڵاتێک بەرهەمدێنن. ئەو

بیرۆکانە جۆرێک ئاخاوتن یان شێوازی بەکارهێنانن، بەئەندازەی ئەوەی وێناکردنی تیۆری، یان دابینکاریی بەکردەوەن. هەروەها چەند زمانێکی چەمکناسا یان چەند پەیوەندییەکی لۆژیکین، بەئەندازەی ئەوەی لە ڕووی پەیوەندییانەوە بە واقیع و حەقیقەتەوە، گێڕانەوەخواز و ڕاڤەکردنەکانن. ئەو بیرۆکانە تۆڕەکانی خوێندنەوەن کە بەردەوام زیاددەبن و دەگۆڕێن، بەئەندازەی ئەوەی ئەو بژار و گرەوانەن کە شایستەی بەکارهێنان یان وەرگێڕانن بۆ ڕووبەرێکی تاوتوێکار، یان ڕەوایەتییەکی گشتی، یان چارەسەرکردنێکی داهێنەرانەی گرفتەکان، یاخود چەند فۆرمێکی بەرهەمدار بۆ ژیان و کار و بینای هاوبەش.

## مرۆڤایەتی لە داوی دەستەوسانی خۆیدا

ئەوەی ئیمرۆ بیەوێت دەستنیشانی واقیع بکات، جا لەسەر ئاستی نیشتمانی بێت، یان هەرێمایەتی، یاخود گەردوونی، دەبینێت وشەکانی وەک قەیران، یان ڕاچڵەکین، یاخود کارەسات بێسوود یان سواون، چونکە قەیران و هەرەسهێنان و کارەساتەکان بەدوای یەکدا دێن یان کۆمەکیی یەکتر دەکەن، هەتاکو شایەتی لەسەر پەککەوتەیی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی بدەن لەئاست ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەدداکاندا، یان کۆنترۆڵکردنی ئەو کێشانەی لە یەکترییەوە پەیدادەبن.

ڕاستە مرۆڤ توانیویەتی ئەوە بهێنێتەدی کە خەوی پێوە نەدەبینی، وەک ئەوەی لەسەر ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیا ڕوویداوە و دەرگاکانی مەحاڵیان لەبەردەمیدا واڵاکردوە، ئەوەش لە چەندین کایە و بواردا، وەک لە جینەکان و گەردیلەکاندا، یان لە بۆشایی و گالاکسییەکاندا. ئەمە سەرەڕای بێوێنەبوون لە بواری دروستکردنی کەرەستە وردیلەکاندا و کارکردن لەسەر ئاستە میکرۆسکۆبییەکان.

کەچی وێڕای پێشکەوتنی زانستیی بێشومار لە بواری زانینەکاندا و بەدەستهێنانی چەندین ئامرازی بێهاوتا لە بواری پشکنین و چاودێریکردندا، یان لە بواری کۆمۆنیکاشیۆنی تێپەڕێنەری بەربەستەکانی شوێن و کاتدا، مرۆڤایەتی دەریدەخات کە دەستەوسانە لەئاست چارەسەرکردنی گرفتەکانی هەژاری، ستەمکاری، گەندەڵی، توندوتیژی و پیسبوونی ژینگەدا. ئەو گرفتانەی گۆڕاون بۆ ئەو دەردە کوشندانەی هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان دەکەن.

بۆیە دەبینین هەرەسهێنانە داراییەکان، سەرباری بوونی کۆمەڵێکی گەورەی پسپۆڕی خاوەن کۆمپیوتەری بێهاوتا و عەمبارێکی پڕ لە تیۆر و شیکردنەوەکان، ڕوودەدەن. لەوانەیە لەبەرئەوە بێت، چونکە واقیع لەوە ئاڵۆزترە مرۆڤ بتوانێت جڵەو یان کۆنترۆڵی بکات. بەتایبەتی چونکە هەوەس، چاوچنۆکی، گرێ و ڕقەکان، کە ڕەفتاری مرۆڤ کۆنترۆڵدەکەن، وادەکەن تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی بەرژەوەندییەکان

لە دەست دەسەڵاتی سیستەمەکانی مەعریفە و پرۆگرامکردنی ئەقڵانی دەرپەڕێت، هەتاکو مرۆڤ- بەبێ ئەوەی چاوەڕوان بێت یان بەمێشکیدا بێت- تووشی شتی کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو، ئابڕووبەرانە یان کارەستائامێز ببێت.

ئەمەش ئەوەیە کە نموونە و ڕووداوەکانی ئارەزووە کاتییەکان و ئابڕووچوونەکانی سەرۆکەکان، هەتا دەگاتە هەڵسوکەوت و هەوەسەکانی تاکەکان، کە وردە وردە و لەسەرخۆ و نەبینراوانە کاری خۆیان دەکەن و ئاسەوار لەسەر سووڕی ئابووری و بزاوتی کۆمەڵایەتی جێدەهێڵن، دەریدەخەن. تەنانەت ئەگەر تاکەکە بێکاریش بێت، چونکە کارکردنی ئەو تاکە بەشێوەی بەهەدەردانی سامانەکان، یان مینرێژکردنی کار و پرۆژەکان دەبێت.

لە نموونەیەکی تردا دەبینین، سەرباری بەدوای یەکهاتنی قوتابخانە و ڕێبازەکان لە کایەکانی کۆمەڵناسی و دەروونشیکاریدا، کەچی سەقامگیری یان دڵنیایی لەئارادانییە، بەڵکو دڵەڕاوکێ، شڵەژان، پشێوی، یان لادان زۆربووە. چونکە ئیمڕۆ تاک هەستدەکات ڕاونراوە و سڵ لە ڕۆڵ و پێگەی خۆی لە کۆمەڵگەی نمایشکاریدا دەکاتەوە، کە تیایدا ئەستێرە بەخێرایی هەڵدەکشێ و بەخێرایش دەکەوێتە خوارەوە، یان هەستدەکات سەرەڕای کۆشش و دەستکەوتەکانی هێشتا کەمتەرخەمە، لەبەرئەوەی لە سەردەمی هرۆژمهێنـان و بزووتنەوەی بەردەوام و خێـرادا، ئامرازەکـان و فرمانەکان بەخێرایی دادەخورێن و بێکەڵک دەبن.

لەبارەی ئاسایشیشەوە، ئەوا ڕوو لە خراپبوونە، وەک توندوتیژیی کوێرانە بەشێوە تیرۆریستییەکەی دەریدەخات، بەجۆرێک خەریکە چەندین شاری سەردەمیانە، ئەنجامی زیادەڕۆیی لە دابینکاری و قایمکارییەکانی ئاسـایشدا، دەگۆڕێن بۆ سـەربازگەکان. ئەمەش نیشانەی مایەپووچیی مرۆڤە لەئاست پاراستنی سەلامەتیی گشتیدا. خۆ ئەگەر توندوتیژی بەم شێوازە- لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە- هەڵکشێت، ئەوا ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکدا دێت، کە هەر کەسێک پێویستی بە یەکێک بێت بۆ پاسەوانیکردن و پاراستنی ئاسایشیی تاکەکەسیی خۆی. ئەمەش کارەساتەکەیە.

هەموو ئەوانە نیشـانەی ئەوەن، مرۆڤ سـەروەریی بەسـەر خۆی و شتەکانییەوە لەدەستداوە و دەستەوسـانە لەئاسـت چارەسەرکردنی مەسەلەی خۆڵ و خاشاک و پاشماوەکانی خۆیدا، کە زەوی و ئاووهەوا و دەریا پیسدەکەن. هەروەها دەسـتەوسـانە لەئاست جڵەوکردنی هەوەس و ئارەزووە کاتییەکان و ڕقەکانی خۆیدا. وەک ئەوەی مرۆڤایەتی بوویێتە دیلی ئەو داواکاری و پێداویستیانەی تولناکانی ئەو تێدەپەڕێنن، بەئەندازەی ئەوەی بۆتە نێچیری ئەو ترس و مەراقانە، کە لە ڕێگەی پشێوی و شڵەژان و

ململانێکانەوە لەسەر پێگەو دەستکەوتەکان یان بیروباوەڕ و بڕواکان، گوزارشت لەخۆیان دەکەن، بەشێوەیەک کە دەبێتە مایەی زیانگەیاندن بەو بەرژەوەندی و چارەنووسانەی لە سەردەمی زانیاری و جیهانگیریدا بەناویەکداچوون و تێکهەڵکێشن، چونکە زیان لە شوێنێک یان کایەکەیەکی دیاریکراودا، زیان بەهەموو شوێن و کایەکانی تریش دەگەیەنێت.

بەوجۆرە، پێدەچێت مرۆڤایەتی لەنێوان دەمەکانی مەقاشێکدا بێت، واتە هەتاکو بەشداریکردنی لە کار و پرۆژەکاندا زیاتربێت، زیانی لە قازانج زیاتردەبێت: چونکە ئاکامی بەکاربردنی زیادەڕۆیانە، تیاچوونە و دەشبێتە مایەی پیسبوونی ژینگە و بەفیڕۆدانی سامانەکان و هۆی پاراستنی ئاسایش لەسەر حسابی ئازادیی تاکەکەسی، بەڵکو بەهۆی هەژموونی ئامێرەکانی کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردنەوە، یان بەدزییەوە چاوتێبڕین و سیخوڕیکردنەوە ژیان دەگۆڕێت بۆ دۆزەخ. پەرەسەندنی لەدەست ڕاپسکاو کارەساتەکان بەرهەمدێنێت، بەئەندازەی ئەوەی دەبێتە مایەی تاڵانکاری و گەشەکردنی مافیاکان، بەشێوەی کۆن یان نوێ، نهێنی یان ئاشکرا، ڕەوا یان ناڕەوا.

ئەوەش باجی ژیریی مرۆڤە: مرۆڤ ئەوە دروستدەکات کە ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات، یان ئەو کارانە ئەنجامدەدات کە توانای نییە چاوەڕوانی ئاسەوار و کاریگەرییە نێگەتیڤ یان وێرانکارییەکانی بێت، بۆ سەر بەرژەوەندییەکان و چارەنوسەکان لە هەمان کاتدا.

ئەوەش پاردۆکسەکەیە، چونکە پرۆژەکانی مرۆڤ دەبنە هۆی سوانی بیرۆکەکانی مرۆڤ، کارەکانیشی دەبنە مایەی بەفیڕۆدانی سامانەکانی. لەوانەیە ئەمەش بەهۆی سوڕی ژیان و نەشونماکردنی کاتەوە بێت، بەڵام ئەوەی ئێستا ڕوودەدات ئەوەیە، کە کۆشش و داخوازییەکانی مرۆڤ مینرێژکراون، بەشێوەیەک کە دژی هەڵدەگەڕێنەوەو بە وێرانکاری و لەناوچوون بۆی دەگەڕێنەوە.

لە جیهانی عەرەبیشدا، کە بەڵگەی هەرە دەرکەوتووی کێشەکەیە، قەیرانەکە دووجارەیە. یەکەم/ لەبەرئەوەی عەرەب فێری ئەوەن خۆ لە بەرپرسیارێتی داماڵن و بیخەنە ئەستۆی ئەوی دیکە. دوەم/ چونکە هیچ کۆمەڵێک یان شوناسێک وەک عەرەب ڕابردووەکەی کۆنترۆڵی ئەقڵ و جەستەکانی ناکات. سەرنجامیش شێواندنی ئێستا و وێرانکردنی داهاتووە، یان لانی کەم دەستەوسانە لەئاست بیرکردنەوەی زیندوو و داهێنەرانەدا، بەمەبەستی خەمڵاندن و ئامادەکاری.

بەهەرحاڵ، جیهانی عەرەب بەشێکە لە جیهان و دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە و جیهان بەم یان بەو شێوەیە و بە چاک یان خراپ کاری تێدەکات. جیهانیش ئیمڕۆ

بێبەڵا نییە، بەڵکو لە تەنگەژەی خۆیدایە، وەک ئەوەی چارەنووسە بێدەرەتانەکانی پرۆژەکان بە ڕاست و چەپدا دەریدەخەن، جا ئەوە لای خەڵکانی بڕوا ئایینیەکان بێت، یان لای خاوەنەکانی ڕێبازە عەلمانییەکان.

بەوپێیەی سۆشیالیزم کۆتایی سەلما، پاش ئەوەی مۆدێلەکەی بێکەڵک بوو و پرۆژەکە گۆڕا بۆ چەند سیستەمێکی تۆتالیتار، کە نموونە کاریکاتۆرییە فشۆڵ و هەژارەکانیمان لە هەندێک دەوڵەتی جیهانی سێ و جیهانی عەرەبدا بینی. سەرمایەداریش گەیشتۆتە قەیرانی خنکێنەری خۆی، لەبەر زاڵبوونی لۆژیکی کاڵا و بازاڕ و قازانج، کە دەبێتە مایەی هەرەسهێنان و کارەساتەکان. لە هەردوو بارەکەشدا بەخوابوون و تەنهابوون لەئارادایە. بەوپێیەی لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا سەرۆک بەخواکرا و تاکپەرستی پەرەیسەند، بەهەمان ئەندازە چەمک و تیۆرەکان گۆڕان بۆ ئەو بت و کەسایەتییە پیرۆزانەی حەشاماتی تێکترنجاو و ڕەوە نادیدەکانی مرۆڤ دروستدەکەن. لە سیستەمی سەرمایەداریشدا ئەقڵ خرایەگەڕ بۆ بەخواکردنی بازاڕ و کاڵا و قازانج، بەشێوەیەک خەریکە دەبێتە مایەی لەناوچوونی دەستکەوتەکانی ڕۆشنگەری، ئەقڵانییەت، ئازادی و دیموکراسی.. بەوجۆرە لە هەردوو شێوازەکەدا بەخواکردنی مرۆڤانەی شاراوە یان ئاشکرا، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ هەیە و بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی ئەو درندەبوون و خراپەکاری، یان ستەمکاری و گەندەڵییەی لەئارادایە.

ئینجا فەندەمەنتالیزمی ئایینی هات و خۆی وەک ئەڵتەرناتیڤ و چارەسەر ڕاگەیاند. سەرەنجام کێشەکان ئاڵۆزتربوون و چارەسەرەکانیش سەختتربوون، هەتاکو خراپییەکان و مەترسییەکان و کارەساتەکان زیاترین. ئەمەش سەیرنییە، چونکە لەگەڵ فەندەمەنتالیزمدا، وەک کاردانەوەیەک دژی جیهانی نوێ، بەشێوەی تۆڵەسەندنەوە و تۆڵەکردنەوە، مەیلەکانی هەڵبژاردەخوازی و تاکڕەهەندی و دوژمنکاری دووقات دەکەونە کار، هەتاکو کێشەکان ئاڵۆزترین.

ئەمەش سەرەنجامەکانی بەخواکردنی مرۆڤە بەهەردوو ڕووەکەی، جا بەخواکردنی خۆی بێت، یان بەخواکردنی ئەویتر بێت: خوڵقاندنی جیهانێک کە وەهم و هەڕەمەکیبوون، یان جادووگەرێتی و بەتارماییکردن، یان گاڵتەجاڕی و شێتی، یاخود پشێوی و تیرۆر زاڵە بەسەریدا.

پشتئەستوور بەم بڕوایە، ئەوەی لێرەدا هەوڵدەدەم ئەنجامیبدەم، پێداچوونەوەیە بە کەرەستە فیکرییەکاندا، جا لە ڕووی تۆڕی ئەو چەمکانەوە بێت کە بۆ خوێندنەوەو دەستنیشانکردن خراونەتەگەڕ، یان لە ڕووی ئەو دوانانەی بۆ هەڵسەنگاندن و پۆلێنکردن بەکاردەهێنرێن، یاخود لە ڕووی ئەو ستراتیژانەی بۆ دەستوەردان و کاریگەریخستنەوە

پشتیان پێ بەستراوە، بەجۆرێک کە دەستبەرێت بۆ ئەقڵییەتەکان و میتۆدەکانی بیرکردنەوە و پیادەکردنە فیکرییەکان.

## ١ - مەیلی پەرستنخواز:

ئەم مەیلە ڕەچەڵەکی دەردەکە و ڕەگی کێشەکەیە و لە پیرۆزکردنی بنچینە و دەقەکان، یان پەرستنی شت و کەسەکاندا بەرجەستەدەبێت. ئەوەش سەرچاوەی دەستەوسانبوون و هەژاری و دروستکەری بێتوانایی و پاشکەوتنە.

یەکەم لەبەر ئەوەی پیرۆزی ئامرازی قەدەغەکردن و سڕینەوەیە، بەئەندازەی ئەوەی سەرچاوەی ترس لێ نیشتن و تۆقانە. دوەم چونکە پەرستن سەرچاوەکانی هێز لای تاک وێراندەکات و وزەی زیندووی بۆ بیرکردنەوەی داهێنەرانە ئیفلیجدەکات، بەئەندازەی ئەوەی بەلانسەکەی بەهەدەردەبات و خەسڵەتەکەی وەک بونەوەرێکی خاوەن فیکر، کە توانای بیرکردنەوە و بەڕێوەبردنی هەیە، لەدەستدەدات. ئەو پەرستنەی پیادەشدەکرێت دوو جەمسەرەیە: جەماوەر و حەشاماتێکی بێئەقڵ، کە سروتەکانی پەرستن بەرامبەر بە خواکان، پێغەمبەرەکان، ئیمامەکان و سەرۆکەکانیان پیادەدەکەن، هەتاکو ئەوانیش ببنە کۆیلەکانی نازناوەکان، ئارەزووە کاتییەکان، دەسەڵاتەکان و ئەفسانەکانی خۆیان.

ئەم دەردە لای عەرەب بەشێوەیەکی دووقات کاردەکات، بەهۆی پەیوەندییان بە پێشینە و کەلەپوورەوە، کە پشتبەستووە بە پەرستنی ڕەچەڵەکەکان و پیرۆزکردنی دەقەکان. سەرەنجامیش کۆمەڵگە عەرەبییەکان بەدەست تەمبەڵیی ڕووناکبیری، پاشکەوتنی ئابووری، دواکەوتنی ژیواری و لاوازیی بوونەوە دەناڵێنن. لێرەدا مەبەستم لە عەرەب ئەو ئەقڵانە نییە، کە ئەنجامی دینامیکبوونی بنیاتنەرانە لە کایە و بوارێک زیاتردا و لە ڕێگەی کارەکانی دۆزینەوە و داهێنانەوە بەرهەمهێنن، بەڵکو بەتایبەتی مەبەستم ئەوانەیە (بانگەشەکار و ڕووناکبیران) کە خۆیان بەچاودێر بەسەر مەسەلەکانی نەتەوە و شوناسەوە دەزانن و حەشامات و گرتبوونەوە ئاسیدەکان ملکەچیانن.

ئەگەر ژیوارەکانی پێشوو لەژێر دروشمی پیرۆزی و خواپەرستی و باڵاڕەویدا سەریانهەڵدابێ و پێشکەوتبن، ئەوا ئیمڕۆ سەختە کۆمەڵگەیەک بەو جۆرە وشانە پێشبکەوێت و پەرەبستێنێ، چونکە پەرەپێدانسازی پێویستی بە تاکێکی بەتوانا و کارامەیە، کە بتوانێت بە کار و بەرهەمهێنان و داهێنان بەشداری لە بنیاتنانی کۆمەڵگەکەیدا بکات، ئەوەش بەئەندازەی پیادەکردنی سەربەخۆیی فیکری و زیندوێتی بوونخوازیی خۆی، بەگشت ڕەهەندە مەعریفی، سیاسی، ئەخلاقی و ئەوینداریەکانیەوە.

## ٢ - هۆگربوونی ناوەکان:

یەکێک لە کاریگەرییەکانی پیرۆزکردن و پەرستن، هۆگربوونی جادووگەرانە یان خورافەکارانەی ناو و دەستەواژەکانە، بەجۆرێک کە دەبێتە مایەی ڕەتکردنەوەی واقیع و حساب نەکردن بۆ بوون. ڕووەکەی تری هۆگربوونی کوێرانە، دوورخستنەوەی ئەویتر و دوورکەوتنەوە یان ترسانە لە ناو و سمبولەکانی، بەشێوەیەک کە نیشانەی ساویلکەیی ئەقڵ و ساوایی مەعریفەیە.

یەکێک لە پارادۆکسەکانی لەمبارەیەوە ئەوەیە، هەندێک لە مۆدێرنیستەکان پەرستنی مۆدێرنیتەیان پیادەکردوە، بەئەندازەی ئەوەی وەک شتێکی توقێنەر مامەڵەیان لەگەڵ پۆست مۆدێرنیتە و ناودارەکان و میتۆدەکانیدا کردوە. هەڵوێستی نێگەتیڤ و دوژمنکارانەشیان بەرامبەر بە زاراوەی «هەڵوەشاندنەوە» بەڵگەی ئەوەیە، لەکاتێکدا ئەو زاراوەیە دەرگای بە ڕووی دەستدانی نوێ و بەپیتی بیرکردنەوەدا کردۆتەوە.

لێرەدا ئێمە لەبەردەم لەکارکەوتنێکداین، کە لای لایەنگرانی تایەفە ئایینیەکان و پێڕەوکارانی سیستەمە ئایدیۆلۆژییە نوێکان، لەنێوان هەردوو گرووپ و دژی یەکتر دەرکەوتووە، ئەویش لە ڕێگەی ململانێ و شەڕەکانیانەوە لەسەر ئەو ناو و سمبول و شوناسانەی بە ڕەچەڵەکیان ناشنانین، یان بە هەڵگەڕانەوە لێیان...

لەمبارەیەوە بانگەشەکارانی ئۆردوگای ئایین و ڕووناکبیرانی بەرەی عەلمانییەت چون یەکن، چونکە لە هەردوو ئۆردووگادا، بە لۆژیکی تەماهیکردن و پەرستن و توانەوە، مامەڵە لەگەڵ ناو و ناودارەکان، یان دەق و چەمکەکاندا کراوە.

نموونەی ئەم دراوە کولتوورییە نابێتە مایەی هێنانەدیی پێشکەوتنێک، یان ئەنجامدانی پەرەپێدانێک، یاخود دروستبوونی پەرەسەندنێک، بەڵکو پەیوەندییەکانی نێوان خەڵک لەناوەوەڕا مینرێژدەکات، بەئەندازەی ئەوەی دوژمنایەتی جیهانی دەرەوەش دەکات. لەگەڵ ئەو دراوەدا، دەستدرێژیدەکرێتە سەر دروشمەکان و مەسەلەکان وێراندەکرێن، بەئەندازەی ئەوەی ڕووناکبیر دەگۆڕێت بۆ دیناسۆرێکی مۆدێرنیست و بانگەشەکار دەگۆڕێت بۆ ئەژدیهایەکی تیرۆریست. ئەمەش بەرەنجامی سەنگەرلێدانە لەپشتی ناوەکانەوە و مامەڵەکردنە لەگەڵ وشەکانی بوون، وەک حەقیقەتگەلی نێردراو، ڕەها، نەگۆڕ، بەهەشتی، کۆتایی...

## ٣ - بڕوای هەڵبژاردەخوازی:

بنچینەی ئەمەش قۆرخکردنی ڕەوایەتی و پیادەکردنی تاقە نوێنەرایەتیکردنی کاروبارەکانی میللەت وگشت مرۆڤایەتییە، لە ڕێگەی بانگەشەکردنەوە بۆ بەدەستەوەگرتنی

کلیلەکانی حەقیقەت و سەرراستی و بەختەوەری، یان نهێنییەکانی پێگەیشتن و پێشکەوتن و گەشەکردنی ژیواری. بەمجۆرە فەندەمەنتالیستە جۆربەجۆرە دژبەیەک و پێکهاتووەکان پیادەی شوناسەکانی خۆیان دەکەن، جا ئایینی بن یان ناسیونالیست، کولتووری بن یان تایەفەگەر...

هەڵبژاردەخوازی لە ساوابوونێکی نەرجسیانەوە سەرهەڵدەدات و سەرچاوەی لەخۆباییبوونێکە، کە وادەکات خاوەنەکەی پێیوابێت لەناو مرۆڤایەتیدا بێوێنەیە، یان وای لێ دەکات بڕوای بەوە هەبێت هەقانیتر، ڕاستگۆتر، بەشەرەفتر و چاکترە... سەرەنجامی ئەوەش تیرۆرە بەشێوە و پلە جۆربەجۆرەکانیەوە، کە بە ڕەتکردنەوە و فەرامۆشکردن و دوورخستنەوە دەستپێدەکات، هەتاکو بە سڕینەوەی سمبولی، یان ڕیشەکێشکردنی مادیی جیاواز و ئەویتر، یاخود دژ و نەیار کۆتاییدێت.

ئەمە لە ڕووی پەیوەندی بەویترەوە، بەڵام لە ڕووی پەیوەندی بەخۆوە، ئەوا هەڵبژاردەخوازی سەرچاوەی خەیاڵپلاویی خودگەرانە و جادووگەرێتی فیکری و بەتارماییکردنی ڕووناکبیرییە. هەروەها بەجۆرێکی تایبەتی دزینی ئەو زانین و تیۆرانەیە، کە زاناکانی ناوەندەکان بەرهەمیاندەهێنن و گێڕانەوەی ڕەگوڕیشەکانیانە بۆ ئیسلام و قورئان. ئاکامەکەش لەسەر ئاستی زانستی، پاشەکشەکردنە لە کاروانی جیهانی و ڕاوەستانە لە پەراوێز و ڕیزەکانی دواوەدا، یان مامەڵەکردنە لەگەڵ جیهان بەزمانی دوژمنایەتیکردن و تیرۆر، وەک ئەوەی ڕێکخراوە فەندەمەنتالیستە سیاسی و سەربازییەکان دەیکەن.

## ٤ – فیکری تاکڕەهەند:

ئەمەش دوو ڕواڵەتی هەیە: یەکەم/ بڕوابوونە بە تاقە پرنسیپێک بۆ لێکدانەوەی جیهان و دیاردەکان. دوەم/ پیادەکردنی تەنهابوونە لەلایەن مرۆڤەوە، لە ڕێگەی خۆبەخواکردن و بەخشینی سیفەتەکانی خواوەندی و هەڵەنەکردن بە وتە و کارەکانی خۆی.

فیکری تاکڕەهەند- لەسەر ئاستی مەعریفی- بەشێوەی سادەکاری و کورتکردنەوەو تێڕوانینی یەکلایەنە سەبارەت بە دیاردە ئاڵۆزەکان و ڕووداوە نادیارەکان و پرۆسەکانی گۆڕانکاری دەخرێتەڕوو. لەسەر ئاستی سیاسی بە دەرکەوتنی تاقە سەرۆک یان ئیمامی ڕێبەر دەخرێتەڕوو، کە میللەت تیایدا دەتوێتەوە و جێی سەرتاپای کۆمەڵگە دەگرێتەوە، هەتاکو زیندوێتیی ئیفلیج بکات و ئاستەنگ بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی دروستبکات. وەک ئەوەی ئەزموونەکان شایەتیی لەسەر دەدەن، کاتێک کۆمەڵگەکان

لە ژێر ئاڵای ڕێبەر یان سەرۆکەکانیاندا دەگۆڕێن بۆ ئەو ئامێرانەی گوێدێر و جێبەجێکارن، یان ئەو ژمارانەی لە گرتبوونەوەکاندا بروادەهێنن و چەپڵەلێدەدەن، یان مەستدەبن و هاواری خۆشی دەکەن...

بەو جۆرە تاکڕەهەندی: تاکڕەهەندیی پرنسیپ، جەمسەر، سەرۆک، بیروڕا، یان دەنگ لەسەر بنچینەی ڕەتکردنەوەی فرەیی، هەمەجۆری، جیاوازی و ناکۆکیی جیهان یان کۆمەڵگە دادەمەزرێت، هەتاکو ستەمکاریی سیاسی و سیستەمی تۆتالیتاری، یان هەژاریی مەعریفی و تیرۆری فیکری، واتە لاوازیی بوون دروستبکات. کاریگەریشی لەسەر ئاستی کۆمەڵگە، بنیاتنانی چەند یەکەیەکی فشۆڵی مینرێژکراوە کە بەئاسانی هەڵدەوشێنرێنەوە. وەک ئەوەی مێژووی ململانێ و لێکترازانەکان دەیخەنەڕوو، جا ئەوە لە ئایینە یەکتاپەرستییە کۆنەکاندا بێت، یان لە ئایدیۆلۆژیا ڕزگاریخوازە نوێکاندا.

## ٥ – ئەقڵی دۆگمایانە:

ڕووەکەی تری فیکری تاکڕەهەند، ئەقڵی دۆگمایە کە خاوەنەکەی بەئەقڵییەتی یەقینی تەواو یان مەسەلەیەکی بڕیارلێدراو سەیری بەرهەمی فیکری دەکات. ئەمەش ئەقڵ دەگۆڕێت بۆ کارگەیەکی بەرهەمهێنانی کەللەڕەقی، داخران، نەگۆڕیی هەڵخەڵەتێنەر و یەکسانیی بۆش لەگەڵ خود. هەروەها پەیوەندیی لەگەڵ بیرۆکە و چەمکەکان دەگۆڕێت بۆ باوەڕێکی ئیماندارانە، یان مەسەلەیەکی لاهوتیانە و دەشێت گفتوگۆکان بگۆڕێن بۆ شەڕفرۆشتنی تیۆری، یان داداگاییکردنەکانی تۆمەتبارکردن.

بۆیە هیچ شتێک زیاتر لە ئەقڵی دۆگمایانە نابێتە مایەی کوشتنی زیندوێتی فیکر و ڕێگەگرتن لە نوێبوونەوەی بیرۆکەکان. هەروەها ئەقڵە دۆگماییە ڕەقهەڵاتوو یان ژەنگگرتوەکان سڵ لە هیچ شتێک ناکەنەوە و ناچن بەگژیدا، جگە لە ئەقڵی ڕەخنەگرانە، کە خاوەنەکەی کار بە لێپێچینەوە و پێداچوونەوە و لێپرسینەوە دەکات و مانای دژە هوشیاریی کراوەیە بەڕووی ئەویتر و ڕووداودا، یان بە ڕووی ئەو فیکرە ئیشکالیەتئامێزەی بە شکاندنی قۆزاخە فیکرییە خنکێنەرەکان نوێدەبێتەوە و سود لە تێڕوانینی ڕێژەیی وەردەگرێت بۆ ڕوانینە بەرهەمی فیکری یان زانستی.

## ٦ – هێڵی فەندەمەنتالیستانە:

دەشێت هێڵی فەندەمەنتالیستانە کۆکەرەوەی زۆرترین دەردەکان بێت: مەیلی پەرستنخوازی، هۆگربوونی ناوەکان، بڕوای هەڵبژاردەخوازی، شەیدابوونی نەرجسیانە و ئەقڵی دۆگمایانە. جا ئەگەر دۆگماییبوون لە یەکسانیی بۆش لەگەڵ خوددا

بەرجەستەبێت، ئەوا فەندەمەنتالیزم لە تەماهیکردنی تەواو لەگەڵ ڕەچەڵەکەکان یان بەدەستهێنانی مانای دەقەکاندا بەرجەستەدەبێت. ئەمەش مەحاڵە، چونکە ناکرێت لە جیهانێکی چنراو بە نەشونماکردنی گۆڕانکاری و بازدان و ڕووداوە نوێکاندا شتێک لەگەڵ شتێکی تردا هاوجووت بکرێت. ئەی چۆن ئەوە لە جیهانی مرۆڤدا ڕوودەدات، کە پێکهاتووە لە خود و شوناسەکان، ئەوانەی زمان، خوازراو، ڕاڤەکردن و گێڕانەوەکانی خۆیان هەیە و خاوەنی ئەو بەهەڵەتێگەیشتن و شڵەژان و کەرتبوونانەی خۆیانن، کە دەبنە مایەی دروستکردنی جیاوازی و پارادۆکسەکانیان.

ئەمەش وادەکات فەندەمەنتالیزم بەشێوەی وەهم، بانگەشەکردن، پێشێلکردن، ساختەکردن، یان ڕیشەکێشکردن پیادەبکرێت... بەو جۆرە فەندەمەنتالیست بانگەشەی هاوجووتی لەگەڵ ڕەچەڵەکدا دەکات، لەکاتێکدا ئەو بە قسە و دەقەکەی خۆی جیاوازە لەگەڵیدا. بانگەشەی ئەوە دەکات بەوەفایە بۆ ئەو ڕەچەڵەکە و بەرگریی لێ دەکات، کەچی پێشێلی دەکات و جێی دەگرێتەوە. بەو جۆرەش پەنادەبات بۆ ڕیشەکێشکردنی ئەویتر، بەئەندازەی ئەوەی بانگەشە بۆ قۆرخکردنی مانا و ڕەوایەتی دەکات. دەشێت فەندەمەنتالیست تەواو هەڵگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی دزینی ئەو زانین و تیۆرە نوێیانە پەردەپۆشبکات، کە لە پەیمانگەکانی خوێندن و توێژینەوەدا بەرهەمدەهێنرێن و ڕیشەیان بگێڕرێتەوە بۆ قورئان، وەک ئەوەی فەندەمەنتالیستە ئیسلامییەکان دەیکەن. ڕووەکەی تری ئەم دزینە ئەوەیە، فەندەمەنتالیست ڕایدەگەیەنێت کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچەڵەکەکان، لەکاتێکدا ئەو لە ڕۆژگاری نوێ و جیهانی هاوچەرخدا دەژی، بەڵام بێگومان بەشێوەیەکی ئاوەژوو، خراپ، نەزۆک، یان وێرانکەر.

لێرەوە فەندەمەنتالیزمەکان، جا کۆن بن یان نوێ، ناسیونالیست بن یان ئایینی، ئیسلامی بن یان مەسیحی، عەرەبی بن یان خۆرئاوایی، بەشێوەی چەند بانگەشەیەکی مەحاڵ یان چەند ستراتیژێکی کوشندەی بەرهەمهێنی شەڕەکانی ناوخۆ و بەیەکدادانی کولتووری لە ناوەوە و دەرەوە خۆیان دەخەنەڕوو، هەتاکو خراپترین شتەکانی ڕۆژگاری کۆن و سەردەمە نوێکان پێکەوە کۆبکەنەوە. دیارترین بەڵگەش، ڕێکخراوە فەندەمەنتالیستە ئیسلامییەکان دەیدەنەدەستەوە، چونکە ئەوەی کردویانە پێچەوانەی بانگەشەکردنەکانیانە: نەیانتوانیوە بەباشی بەرژەوەندییەکان بەدەستبهێنن و خراپەکارییەکان بەدووربگرن، بەڵکو خۆیان بوونەتە هۆی لەدەستدانی ئەو دەستکەوتانەی کۆمەڵگە عەرەبییەکان، لەپێناو پێشکەوتن و نوێکردنەوەدا، کۆششی بێوچانیان بۆ کردون.

## ٧ – مەیلی تەوباویانە:

بنچینەکەی چارەسەرە لەرادەبەدەرەکان و وەڵامە کۆتاییەکانە، لەژێر خانەی رەها، نەگۆڕ، تەنهاو کامڵدا. وەک ئەوەی لای خاوەنی کۆمارە نموونەییەکان و شارە چاکەکارەکان دەردەکەوێت... سەرەنجام پێشێلکردن و ئابڕووچوون، یان پاشەکشە و هەرەسهێنانەکانە، بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی خراپتری ئەو واقیعەی مەبەستە بگۆڕێت.

چونکە لە زەمینەی واقیعی زیندوودا کە ئاڵۆز و نادیار، یان شڵەژاو و گرگرتوو، یاخود مینرێژکراوە بە هەوەس و چاوچنۆکیەکان، یان گرێ و رقەکان، تەنیا هەمەجۆر و پارچەپارچەکراو، یان رێژەیی و گۆڕاو، یان جیاواز و جیاکارە، یاخود کاتی و لەناوچوو لەئارادایە... لێرەوە چارەنووسی پێڕەوکارانی تەوباوییەت لەبەردەمی کەللەڕەقیی واقیعدا، گۆڕانە بۆ چەند نموونەیەکی تیرۆریستانە، یان پەنابردنە بەر گۆشەگیرییە بۆ شارەزابوون لە زمانی سکاڵاکردن و تۆمەتبارکردن و تاوانبارکردندا.

## ٨ – بەهەشتی رزگاریخواز:

رووی دووەمی مەیلی تەوباویانە، بەهەشتی رزگاریخوازە، کە شێوەی نوێی باوەڕی مەهدەوییانەیە، ئەوەی بەڵێنی دەرکەوتنی فریادڕەسێک بەخەڵک دەدات، بۆ هێنانەدیی دادپەروەری لەسەر زەوی، پاش ئەوەی لێوانلێوبووە لە زۆرداری. ئەم وەهمە لەلایەن شۆڕشانێکی نوێوە لە مێشکەکاندا چێنراوە، ئەوانەی لە ژێر دروشمەکانی دادپەروەری، برایەتی، سۆشیالیزم، پێشکەوتن و ئاشتیدا بەڵێنی رۆشنکردنەوەی ئەقڵەکان و رزگارکردنی جەستە و ئارەزووەکانیان داوە.

ئەم وەهمە بەشێوەیەکی دووقات لەلایەن خاوەن بڕوای سۆشیالیستی، رژێمە پێکەوتنخوازەکان، بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی و هەموو ئەوانەوە پیادەکراوە، کە بەڵێنی بەهەشتێکی سەرزەمینیی بێ چەوساندنەوە و جیاوازیکارییان بەخەڵک داوە کە تیایدا خەڵک یەکسانن، بۆ ئەوەی بەوپەڕی ئازادی دەربڕین، رێکخستن، بەکاربردن، سەرگەرمی و رابواردن پیادەبکەن...

ئەمەش ئەوپەڕی ساویلکەیی و سادەکاری و نەشارەزایی ئاوێتەیە سەبارەت بە دەروون و کۆمەڵگە و جیهان، یەکەم چونکە ئەوەی یەکێک لەناو هاوشێوەکانی خۆیدا پیادەیدەکات دادپەروەری، ئازادی، یەکسانی، یان حەقیقەت نییە، بەڵکو سامان، دەسەڵات، پۆست، ناوبانگ، بێوێنەیی، یان جیاکارەبوونە... دووەم چونکە کۆمەڵگە – بە کۆمەڵگەی رووناکبیرانیشەوە – شانشینی چاکەکاری، یان مەملەکی بەختەوەری

نییە، بەڵکو کارگەیەکی دەسەڵاتخوازانەیە، کە دەست لە بەرهەمهێنانی جیاوازی و پێشبڕکێ، یان پێشێلکاری و خراپەکارییەکانی دژ بە یاسا و مافەکان هەڵناگرێت. لەکۆتاییشدا لەبەرئەوەی جیهان لەوە ئاڵۆزتر و سەختترە یاساکانی جڵەویکەین، یان ئاراستەکەی کۆنترۆڵ بکەین، یاخود پێشبینیی نەشونما و چارەنووسەکەی بکەین.

لێرەوە خەونە ئەرخەوانییەکان تێکشکان و دروشمە بەهەشتئاساکان بەپێچەوانەکانیان گۆڕان: ئازادی ستەمکاریی زیاتری بەرهەمهێنا، یەکسانی کەلێنی نێوان دەوڵەمەندەکان و هەژارانی پڕنەکردەوە، کۆمەڵگەی مەدەنیش لەبەردەمی پێکهاتە تایەفەگەرییەکان و مەیلە رەگەزپەرست و فاشییەکاندا پاشەکشەیکرد، شۆڕشیش گۆڕا بۆ تیرۆرێکی سیاسی یان بڕوامەند و کەوتە خواردنی نەوەکانی خۆی و لەناوبردنی دوژمنەکانی، وەک ئەوەی نموونە نوێ و هاوچەرخەکانی دەریدەخەن. ئەمەش مانای ئەوەیە، باشترە هەریەکێک بێفیزی بنوێنێ و ئەو بانگەشە ئایدیالیست و فریادڕەسانەی خۆی خاوبکاتەوە کە پرۆژەکانی مرۆڤایەتی مینرێژدەکەن، چونکە ژیان لەوە ئاڵۆزتر، نادیارتر، شڵەژاوتر، پارچەپارچەترە کە بە مێشکی خاوەن بەهەشتەکاندا دێت. بۆیە کارەکان تەنیا گرەوکردنەکانن، کە پڕن لە سەرچڵی و سەرکێشی، یان تیۆەگلان و پێکهاتن. ئەمەش پەردە لە ڕووی فشۆڵیی مرۆڤ هەڵدەماڵێت و بەشێوەیەکی بەردەوام بڕوا و پرۆژە و دروشمەکانی لە ژێر پێداچوونەوەدا دەهێڵێتەوە.

## ٩ – هەڵوێستی دژبوون:

بنچینەکەی، مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەویتر بەشێوەیەکی نێگەتیڤ و دوژمنکارانە، بەو پێیەی دژێکە ناکرێت پێکگەیشتن لەگەڵیدا هەبێت. سەرەنجام هەڵگەڕانەوەی هەمان لۆژیکە دژی خاوەنەکانی هەڵوێستەکە. پاش دوو سەدە لە مامەڵەکردنی عەرەب لەگەڵ خۆرئاوا، وەک دوژمنێکی مێژوویی یان نەیارێکی ژیواری، ئێستا برای ئایین و برای نیشتمان بۆتە دوژمن، وەک ئەوەی شەڕەکانی ناوخۆ و فیتنە مەزهەبییەکانی زیاتر لە وڵاتێکی عەرەبی دەریدەخەن.

ئەمە سەیرنییە، بەتایبەتی لە ئیمڕۆدا کە بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان تێکئاڵاون، کێشەکان و شوناسەکان و خێروبێرەکانی سەر گۆڕەپانی گەردوونی بەجیهانیبوون. ئەمەش مانای ئەوەیە، بەڕێوەبردنی مەسەلەکان بە ئەقڵییەتی دژ و لۆژیکی دوورخستنەوە بێسوودە، چونکە ئەوە عاقڵ و کارسازە کە شارەزایە لە هونەری مامەڵکردن بە ئەقڵییەتی دیالۆگ و تاوتوێکردن، یان شەریکایەتی و ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ ئەویتر.

## ١٠ - زیادەڕەویی ئایدیۆلۆژیانە:

یەکێک لە کاریگەرییەکانی مامەڵەکردنی نێگەتیف و دوژمنکارانە لەگەڵ ئەویتر، پیادەکردنی زیادەڕەویی ئایدیۆلۆژیانەیە و بنچینەکەی ئەو بڕوایەیە کە سەرچاوەی کارەسات و خراپەکارییەکان خۆرئاوا و ئەو داگیرکاری و هەژموون و تاڵانکاری یان قاتوقڕیانەیە کە پیادەی کردوە و دەیکات، وەک ئەوەی خاوەن بانگەشە ئایینی و ناسیونالیستی و چەپڕەوەکان تیۆریزەی بۆ دەکەن. ئاکامی ئەو زیادەڕەوییە، سەنگەرلێدانە لەپشت شوناسەکان و بەسەربازکردنی کۆمەڵگەیە بەشێوەیەک کە چەمکی پێکدادانی ژیواری و دوژمنایەتیکردنی کولتووری بەهێزدەکات.

ئاکامێکی تری لۆژیکی دژایەتیکردن، فرێدانی بەرپرسیارێتییەکانی هەڵە وکارەساتەکانە بۆ سەر شانی ئەوانیتر، بۆ هەڵهاتن لە ئەنجامدانی کاری پێداچوونەوە و لێپرسینەوەی ئەقڵانی. بەرەنجام، پەردەپۆشکردنی هەڵە و خراپەکارییەکانە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دووقات کاری خۆیان بکەن. هەروەها گۆڕینی نەگۆڕ و دروشمەکانە بۆ بتگەلێک کە دەپەرسترێن و پیاوانێکی ئایینی پایەبەرز کە پیرۆزدەکرێن. بۆیە عاقڵ ئەو کەسەیە بەباشی بیردەکاتەوەو دەنرخێنێت و تەگبیردەکات، ئەوەیە کە دان بە ڕێژەییبوونی بیروڕاکانی خۆیدا دەنێت و هەڵەکان دەسەلمێنێ و تێکشکانەکان چارەسەردەکات.

## ١١ - دەردی کولتووری:

مەبەست لێی دەردی شوناسە، وەک ئەوەی لایەنگرانی هەڵبژاردەخوازی و دەمارگیری و داخران مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، بۆ ئەوەی بیگۆڕن بۆ جروجانەوەر، تێکچوونی دەروونی، زیندان، یان دادگا... لە نیشانەکانی ئەم دەردە، پێشخستنی باوەڕ، تایەفە، مەزهەب، یان حیزبە لەسەر حسابی نیشتمان، وڵات، دەوڵەت، دامەزراوە و یاسا... وەک ئەوەی خودی خاوەن باوەڕ و ئایدیۆلۆژیا کۆن و نوێکان خۆیانی پێ دەناسێنن.

لە کاریگەرییەکانی ئەم دەردە، ئەزۆکی و تەمبەڵی و پشت بەخۆ نەبەستنە، ئەمە سەرباری بەهێزکردنی کێشمەکێشەکانی نێوان تایەفە و گرووپەکان. ئەمەش سەیرنییە، بەوپێیەی کاری بەرهەمهێن و بنیاتنەرانە، کە لێهاتوویی و شایستەبوونی خاوەنەکەی دەخاتەڕوو، باشترین ناساندنی شوناسە، چونکە ئەوە پاسپۆرتی تێپەڕینە بۆ بەدەستهێنانی ڕەوایەتی و پیادەکردنی کارامەبوون، ئامادەگی، بەشداریکردن و شەریکایەتیکردنی گەردوونی. بۆیە ئەوە خاوەن شوناسە دەوڵەمەند، بەهێز و گەشەکردوەکانە کە تایبەتمەندیی خۆیان بەشێوەیەکی ئاوێتە و جیهانی و

گەردوونی پیادەدەکەن، ئەوەش لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە لە ئەو کاری نۆژینەوە و داهێنانانەی کیشوەر و کۆمەڵگە و کولتوورەکان دەبڕن...

## ١٢ - تەڵەی مرۆڤزانی:

ڕووەکەی تری دەردی کولتووری، کۆتوبەندی مرۆڤزانییە، کە لە بەرەگەزکردنی ئەقڵەکان و بەئیسلامکردنی زانینەکاندا بەرجەستەدەبێت، لەکاتێکدا زانست هیچ شوناسێکی نییە و داهێنانە ڕووناکبیرییەکان و دەستکەوتە فیکرییەکان ئەو نۆژینەوانەن کە سنوورەکانی زمانەکان و کولتوورەکان دەبڕن (١). ئەم دەردە، کە تایبەتە بەوانەی لە بواری فەلسەفە و زانستە مرۆڤایەتییەکاندا کاردەکەن، وا لە خاوەنەکانیان دەکات لەپشت شوناس و گۆشەگیریی خۆیانەوە سەنگەرلێدەن، بۆ ئەوەی بایەخپێدانە ئایدیۆلۆژی و خەباتکارییە ئایینی، یان ناسیونالیستی، یاخود ڕزگاریخوازییەکان زاڵبن بەسەر چەمکسازی و خولیا مەعریفییەکاندا. ئەمەش فەیلەسووف، زانای کۆمەڵناسی، یان دەروونناسی دەگۆڕێت بۆ بانگەشەکار، تێکۆشەر، ڕیفۆرمخواز، یان پەیامبەر... سەرەنجامیش تێکشانێکی دووجەمسەرە: شکستخواردن لە خەباتدا، نەزۆکی لە بیرۆکەکان و دەستەوسان لەئاست نوێکردنەوەیاندا، جا بەبەرهەمهێنانیان بێت یان نوێکردنەوەیان. ئەمەش سەیرنییە، چونکە بایەخپێدانە ئایدیۆلۆژییەکانی تایبەت بە شوناس یان ئازادی تەنیا ئەو هاندەرانەن بۆ شارەزابوونی زانا یان فەیلەسووف لە پیشەکەیدا پێویستن، ئەمەش لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕووداوەکان، لێکۆڵینەوەکردن دەربارەی دیاردەکان، شیکردنەوەی پێشهاتەکان، یان هەڵوەشاندنەوەی کێشەکانەوە، بەمەبەستی تێگەیشتن و دەستنیشانکردن...

## ١٣ - ئەقڵی دەستەبژێرانە:

ئەم لەکارکەوتنە لای ئەو ڕووناکبیر و بانگەشەکار و خاوەن پرۆژە ئایدیۆلۆژیانە دەردەکەوێت، کە ویستی ڕزگارکردن و گۆڕین و نوێکردنەوەیان هەیە و بانگەشەی ئەوە دەکەن بەرجەستەکاری بەهاکانی حەقیقەت و دادپەروەرین و داکۆکی لە بەرژەوەندییەکانی جەماوەر یان ئازادیی میللەتان دەکەن. ئەم دراوە نەرجسییە بە دژەکانی گۆڕاوە، وەک ئەوەی ئەزموونە شکستخواردووەکان دەریدەخەن. چونکە خاوەنەکانیان ئەو بیرۆکانەیان دەربڕیوە کە شایستەی تاوتوێکردن نین، بەڵکو چەند قاڵبێکی حازربەدەست و چەمکێکی ڕەقهەڵاتوو، یان بەکاربراون. لەئاکامدا ڕووناکبیر، خاوەنی هوشیاری و نوێنەری بەهاکان و گوێزەرەوەی مەعریفە،

ڕاستبێژی و کارامەیی لەدەستدا و کەوتە پەراوێزی کۆمەڵگەوە، بۆ ئەوەی ئەو گرتبوونەوانە لە دژی وەرچەرخێن کـە بەرگریی لـە بەرژەوەندییەکانیان دەکرد. ئەمەش کۆتایی دوانەی دەستەبژێر و جەماوەرە: ئەو ڕووناکبیرانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەقڵەکانی نەتەوە و سەرکردەکانی بیروڕان دەکەونە دواوە.

ئەمەش سـەیر نییـە، چونکـە کارەکانی ڕیفـۆرم و ڕابـوون، یان نوێکردنەوە و گەشەپێدان چەند کارێکی هاوبەشن گشت چالاکوانەکان بەشدارییان تێدا دەکەن، هەریەکە و لە کایەی کاری خۆی و بازنەی شارەزایی خۆیدا. ئەمەش مانای پووچەڵبوونەوەی چاودێریکردنی شکستخواردوی دەستەبژێرە بۆ کۆمەڵگە و خەڵک، یان بەهاکان و مافەکان، جا ئەوە لە ڕووی پرۆژەکانیانەوە بێت بۆ پێشکەوتن و نوێکردنەوە کە تێکشکان و شکستیانهێنا، یان لە ڕووی دروشمەکانیانەوە دەربارەی سەرڕاستی و دادپەروەری و ئازادی، ئەوەی خۆیان یەکەمین کەسانێک بوون پێشێلیانکردن. وەک شەڕە سمبولییە توندوتیژەکانیان دەیخەنەڕوو، کە بەرجەستەکاری پەراوێزخستن و ڕەتکردنەوەی هاوشان و هاوەڵەکانیان بوون (٢).

### ١٤ - گۆشەگیریی ئەکادیمیانە:

ڕووەکەی تری ئەقڵی دەستەبژێرانە، ئەو ئەقڵە ئەکادیمیەیە، کە ئەبستراکتخوازانە یان دابڕاو لە کایەکانی چالاکیی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و ڕووەکانی دیکەی ژیان مامەڵە لەگەڵ بیرۆکەکان دەکات. لەوانەیە ئەم پەککەوتە بنچینەییە کەلێنی گەورەی نێوان گوتـار و ژیـان، یان نێوان دەستەبژێری ڕووناکبیری و ئەکادیمیی بەرهەمهێن، یان گوێزەرەوەی مەعریفە و کۆمەڵگە و خەڵک لێکبداتەوە. بێگومان ئەو بیرۆکەیەی لە کایەیەکی مەعریفەدا بەرهەمهێنراوە، دەستدانی گرنگ دەخاتەڕوو بۆ تێگەیشتن لە واقیع و دەستنیشانکردنی کێشەکان، بەڵام ئەوانە تەنیا چەند تیۆرێک نین بۆ جێبەجێکردن، بەڵکو پێویستیان بەوەیە لەلایەن کایە و کەرتە بەرهەمهێن و چالاکەکانەوە بخرێنە سەر مێزی تاوتوێکردن، هەتاکو بگۆڕێن بۆ واقیعێکی زیندوو، یان چارەسەرێکی سوودبەخش، یاخود چالاکییەکی کۆمەڵگەیی. بۆیە بیرۆکەی زیندوو بەخودی خۆی نوێ نابێتەوە، بەڵکو خۆراک لە بزووتنەوەی کرانەوەی دوولایەنە وەردەگرێت، جا ئەوە لەسەر ئاستی یەکەم لەنێوان لقەکانی مەعریفەدا بێت، ئینجا لەسەر ئاستێکی تر لەنێوان ئەو لق و کایە کۆمەڵگەییەکانی تردا.

### ١٥ - گرێی نێرسالاری:

یەکێک لەو وەهمانەی لـە زەینەکانـدا جێگیـرە ئەوەیـە، پیاوان لە ژنان ژیرتر و

عاقڵترن، ئەمەش وایکردوە پیاو وەک سەرپەرشتیار و چاودێر و گەورە ڕەفتاربکات. بۆیە لێرەوە باسی ئەوە دەکات، کە لای ژن ئارەزووهەڵسان زاڵە بەسەر ئەقڵدا، یان ڕەوایەتی دەداتە فرەژنی، یاخود کاردەکات بۆ سەرتاپاپۆشیی ژنان، لەبەر سڵ لێ کردنەوەی نەک پاراستنی. کەچی پیاو جگە لە بەدرۆخستنەوەی پاساوەکە شتێکی دیکەی پێ ناکرێت، چونکە ئەو ژن بە کەم ئەقڵ وەسفدەکات، ئینجا بەوە تاوانباریدەکات کە پیاوان لەخشتەدەبات و گەمە بە ئەقڵیان دەکات، هەتاکو پەلکێشیان بکات بۆ ئەنجامدانی سەرپێچی و گوناهەکارییەکان. ئەمەش ئابڕووچوونی ئەقڵی نێرسالارە.

ئەمە ئەو شتەیە کە لە شەریعەتە ئایینیەکان و بیروڕای هەندێک فەیلەسووفدا بەرجەستەبووە و ژن وەک بوونەوەرێکی پلە دوو مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت. تەنانەت لەم سەردەمەدا پیاوی وەها هەن دەڵێن ژن وەک پیاو ئامادەنییە بۆ شارەزابوون لە ماتماتیکدا، لەکاتێکدا تاقیکردنەوە و بەڵگەکان - لە ڕابردوو و ئێستادا - سەلماندوویانە، ژنانی وەها هەن پشتگیریی مێردەکانیان کردووە و لەپشتیانەوە وەستاون بۆ خستنەگەڕ یان بەدیهێنانی چەندین بانگەواز و پرۆژە و دەستکەوت. بێگومان ژنانی وەهاش هەن لە مێردەکانیان زیرەکتر و لێهاتووترن. ئێمرۆش ژنان لە چەندین بواردا، تەنانەت لە بواری سیاسەتدا، دەستیانکردۆتە کێبڕکێ لەگەڵ مێردەکانیاندا.

بەهەرحاڵ، چیتر دراوی نێرسالاری، پاش ئەو تێکشکان و نشوستیهێنانە، بەکەڵکی بەڕێوەبردنی کاروبارە مرۆڤایەتیەکان نایەت، بەڵکو بۆتە بارگرانی و تەنانەت گرێیەک کە پێویستە هەڵبوەشێنرێتەوە، لەپێناو سەرلەنوێ بنیاتنانی پەیوەندییەکان لەسەر بنچینەی چەند بنەمایەکی هاوسەنگتر و ئەقڵانیتر. چونکە ئەوەی بە پاشکۆ، ملکەچ، یان کۆیلەی دادەنێین، بەبێ ئەوەی بەمێشکماندا بێت بەشداریی لە دروستکردنماندا دەکات. ئەمەش مانای پووچیی چەمکەکانی سەروەری و چاودێریکردنە. کەواتە باشترە پەیوەندییەکان لەسەر شەریکایەتییەک بنیاتبنرێت کە پشتبەستوونییە بە فەرامۆشکردن یان سڕینەوەی جیاوازی، بەڵکو دەرفەت بۆ ئەوە دەڕەخسێنێت ئەو جیاوازییە دەرکەوێت و گەشەبکات.

## ١٦ - مرۆڤسالاری:

لە دواییدا نەک لەکۆتاییدا مرۆڤسالاری، کە ڕووەکەی تری نەرجسیبوونی دەستەبژێرانە و دراوی هەڵبژاردەخوازییە، بەرجەستەکاری ئەو لەکارکەوتنە

بنچینەییەیە، کە گشت دەردەکانی تری لێوە دروستدەبێت و بریتییە لەو بڕوایەی مرۆڤ بڵندترین و باشترین و بەهێزترین بوونەوەرەکانە و مافی زیاتری بوونی هەیە، ئەوەش لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئاژەڵەکان و ڕووەکەکان و گشت سامانە سروشتییەکانەوە بە قازانجی خۆی و بۆ خزمەتکردنی ئارەزوو و چاوچنۆکییەکانی خۆی کە لەسنوورێکدا ڕاناوەستن، جا ئەوە ببێتە مایەی پیسبوونی ژینگە و بەبیابانبوون، یان نەمان و بەفیڕۆدان، یاخود کوشتن و وێرانکاری. ئەمەش بەری لۆژیکی خۆپەرستییە: لەدایکبوونی مرۆڤی بەرخۆری چڵێس، کە دڕندەیی بەرەو لەناوچوون و وێرانبوونی دەبات.

بەڵکو نەرجسیبوونی مرۆڤ پاڵی پێوەناوە خواوەندی وەها دابهێنێت، کە دەیانخاتەگەڕ بۆ هەوەس و ئارەزووە کورتخایانەکانی خۆی، پشتئەستوور بەو بڕوایەی خوا ئەم گەردوونەی لەپێناو ئەودا خوڵقاندوە، یان ئەو گەورە و خاوەنداری سروشتە. بەوجۆرەش مرۆڤ جێگەی خوا دەگرێتەوە، لە ڕێگەی خۆ شکۆدار و مەزن کردن، یان فیزلێدان و تۆڵەسەندنەوەوە، بەوپێیەی خۆی خاوەنی موڵکەکەیە و چۆنی بوێت وا ڕەفتاری لەگەڵ دەکات. سەرەنجامیش ئەو بێهودەیی، بەهەدەردان، جادووگەری، شێتی، جەنگ، دڕندەیی و بەربەرییەتەیە، کە مرۆڤایەتی بەدەستیانەوە دەناڵێنێت. لێرەوە چیتر دراوی خواوەندانە سوودی نییە، پاش ئەوەی پەردە لە ڕووی گەمەکە هەڵماڵراوە و تەڵەکەبازییەکە ڕیسوابووە.

ئەگەر لەناو ئەو وێرانەیەدا هیوای کرانەوەیەک بخوازین، ئەوا سەرەتا پێویستە بێفیزی پیادەبکەین، بەشێوەیەک کە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی دنیایی پرسیار دەربارەی چارەنووسی زەوی بکات، بەجۆرێک کە کاروباری مرۆڤانە لەسەر حسابی کاروباری گەردوونی بەڕێوەنەبرێت.

ئەوە دیارترین وەهم و دەردەکانن کە لە ئەقڵەکاندا هێلانەدەکەن و کۆمەڵگەکان وێراندەکەن، بۆ ئەوەی قەیران و دەردەکان بەرهەمبهێنن. ئەوەشمان بە پوختی و چڕی لەم دەستپێکەدا خستۆتەڕوو، هەتاکو بە فراوانی و درێژی لە بەشەکانی کتێبەکە و وتارەکانیدا باسیان بکەین.

## پەراوێزەکان:

١- لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەو ڕووناکبیرانە دەبینینەوە، کە وەک جۆرێک لە گێڕانەوەی کاریکاتۆرانەی چەمکە نوێکە، باسی فیکری هاوردە دەکەن. ئەمەش مانای تێنەگەیشتنە لە واقیع، بەئەندازەی ئەوەی ساختەکاریی هەڵوێستەکان دەخاتەڕوو، چونکە ئەوەی ئەوانە بە

هاوردەی دادەنێن، تیخیکردون و بۆتە بەشێک لە کولتوور و پێکهاتەی فیکرییان.

٢- ئەمەش ئەوەیە کە نموونەکانیان دەیخەنەڕوو: ئەوانە باسی زەوتکردنی عەرەبایەتیت بۆ دەکەن، لەکاتێکدا خۆیان بەشێکن لە سیستەم و کولتوور و تۆرەوگا و تەوەرەیەک کە کاردەکات بۆ پارچەپارچەکردنی ڕیزەکان و لێکترازانی نەتەوە. ئەوانە بانگەشە بۆ ئازادی دەکەن، بۆ ئەوەی ستەمکاریی پێ ئەنجامبدەن، یان خۆیان ببنە قوربانیی. ئەولنە دلوای دادپەروەری و یەکسانی دەکەن، لەکاتێکدا خەمیان چنینەوەی خەڵاتەکان، یان بەدەستهێنانی پۆستە. ئەوانە هێرشدەکەن سەر بازاڕ و جیهانگیری و بەڵێندەرایەتی، کەچی سەقاڵی بڵاوکردنەوەی ناوەکانیان و ساغکردنەوەی کاڵاکانیان و کارکردنن وەک بەڵێندەر یان بزنزمان، بەڵام بەشێوەیەکی خراپ. ئەوانە دلوای دەستپاکی و سەرڕاستی دەکەن، لەکاتێکدا متمانەی پاراستنی بەرهەمی هاوەڵەکانیان پێ ناکرێت. سەیرتر ئەوەیە هێرشدەکەنە سەر فەندەمەنتالیزم، کەچی خۆیان بەرهەمی ئەوانیتر بەتاڵاندەبەن، وەک ئەوەی شیکەرەوەی جانووگەر دەیکات و تیۆرە زانستییەکان دەدزێ و ڕیشەیان دەگێڕێتەوە بۆ قورئان. ئەمە سەرباری ئەوەی هێرشدەکاتە سەر ئینتیما تەقلیدییەکان بۆ تایەفەو هۆز، لەکاتێکدا خۆی تەنیا دەتوانێت لەناو گرووپێکی بچووکدا بژی، کە ستایشی یەکتر دەکەن و پاساو بۆ یەکتری دێننەوەو هەڵەو سەرسمدانەکان دەکەنە دەستکەوت و داهێنانەکان و چاویان بە دەستکەوتەکانی ئەوانیتر هەڵنایەت و بەخراپیان دادەنێن، بەهەمان شێوەی ئەو فەندەمەنتالیستەی چاکەکانی ئەوانیتر دەکاتە خراپەکاری و بەپێچەوانەوە. ئەمانەش خراپترینیانن. بۆیە سەیرنییە سەرەنجامەکە ئەو خراپەکاری و کارەساتانە بێت کە بەدەستیانەوە دەناڵێنین و پەراوێزکەوتنی دەستەبژێرەکان و لەدەستدانی ڕاستبێژی و ڕەوایەتیان دەخاتەڕوو.

## تونکاریی ئەقڵی فەندەمەنتالیستانە(*)
## دەردی هەڵبژاردەخوازی و تەڵەی هەڵاوێردن

یەکێک لە ڕووداوە مەزنەکانی سەردەم ئەوەیە، کە فەندەمەنتالیزمی ئایینی، بەتایبەتی ئیسلامی، ئێمڕۆ بۆتە یاریکەرێکی بنچینەیی لەسەر شانۆکە و بکەرێکی بەهێز لە نیمەنی عەرەبی و جیهانیدا، بۆیە بۆتە تەوەرەی خوێندنەوە و شرۆڤەکردنە جیاواز و هەمەڕەنگەکان.

جا ئەگەر سەرلەنوێ خوێندنەوەی خۆم دەربارەی فەندەمەنتالیزمی ئایینی پێشکەشبکەم، ئەوا مەبەستم لەوە چەند پرسیارێکە، ڕووداوێک لە مێشکدا دەیانوروژێنێ کە دروستماندەکات و دەشێت بەشداریمانکردبێ لە دروستکردنیدا، ئەوەش لە ڕێگەی شکستخواردنی پرۆژە ژیوارییەکان و کۆششە بوونخوازییەکانمانەوە.

گەڕانەوەی بەو هێزەوەی ئایین بۆ سەر شانۆ چۆن لێکدەدەینەوە؟ ئایا پرۆژە فەندەمەنتالیستەکان بەرەو کوێمان دەبەن؟ مۆدێلی فەندەمەنتالیستانە چۆن پێکدێ و کاردەکات، یان چۆن ئەقڵی ئاییندار لە کۆمەڵگەیەکی فرەلایەن و نائاییندار‌دا دروستدەکرێت؟

لە دواپرسیارەوە دەستپێدەکەم، هەتاکو بڵێم: ئەوەی ئەقڵی ئاییندار دروستدەکات، بەتایبەتی ئەوەی سەر بەیەکێک لە ئایینە یەکتاپەرستەکانە، کۆمەڵێک بڕوا و نەگۆڕ، یان گرێ و مەراق، یاخود حەسیاسیەت و کاردانەوەیە دژی خود و ئەویتر و جیهان، کە لە شەش کۆڵەکە، یان بنەچەدا پوختیاندەکەمەوە:

### شوناسی ڕەگەزپەرستانە:

١- یەکەمیان بڕوای هەڵبژاردەخوازییە، کە لە ئەقڵی موسڵمان و کاتی لاوییەوە هەستێکی بەرووژم بە نەرجسییەت دەچێنێ و وای لێدەکات پێیوابێ دەستوپێوەندی ڕێبازەکەی، یان گرووپەکەی وەک خەڵکانی تر نین، چونکە خوا هەڵیبژاردوون بۆ

ئەوەی ببنە قسەکەر بەناوی ئەوەوە، یان بەرجەستەکاری وتەکانی ئەو بن، یاخود هەتاکو بەهۆی ئەوانەوە کۆتایی بە سروشەکەی خۆی بهێنێ و دواپەیامی بە دنیا رابگەیەنێ. بۆیە- لە روانگەی ئەوەوە- تەنیا ئەوان ئیمانداری دروستن و رێگەی راست و رێبازی راستیان گرتۆتەبەر و ئەوانیتر بەرِوونی رێگەیان ونکردوە. ئەمەش دەردی **هەڵبژاردەخوازی** و **تەڵەی هەڵاویردنە**.

٢- رووەکەی دیکەی بڕوای هەڵبژاردەخوازی، **دڵنیایی دۆگمایانەیە**، کە وای لە ئایینداری- بەتایبەتی موسڵمان- دەگەیەنێ، کتێبەکەی کە بەلایەوە دەقێکی پیرۆزە و لەلایەن خواوە نێردراوە و پوختەکراوە، تەنیا کتێبێکی راستە و بەهیچ جۆرێک هەڵەی تێدا نییە و سەر بە گرووپێکە کە بەتەنیا **کلیلەکانی حەقیقەت**، سەرراستی، رێنیشاندان و بەختەوەریی بەدەستەوەیە.

لە دوائەنجامدا ئەو وەهمە دوو جەمسەرە لە شوناسێکی رەگەزپەرستانەدا بەرجەستەدەبێت، کە وا لە خاوەنەکانی دەکات پێیانوابێ خاوەن زانست و ئەخلاقێک، یان ناوبانگ و پێگەیەک، یاخود کار و سامانێکی هەقانیتر، راستگۆتر، کامڵتر، بەشەرەفتر، چاکتر و پاکترن، وەک ئەوەی بەهۆی پروپاگەندەکارانی تەلەفزیۆنەکانەوە گوێ و چاوەکانیان پێ پڕدەکرێت. ئەمە ئەو بنچینەیەیە، کە پڕۆژەی فەندەمەنتالیستانە لەسەر بنچینەی چاوهەڵدێنێ و تەشەنەدەکات، وەک ئەوەی ململانێ خوێناوییەکانی سەرەتای ئیسلام شایەتیی لەسەر دەدەن. بۆ نموونە، شەڕەکانی هەڵگەڕانەوە، یان شەڕی ئەلجەمەل، یاخود رووداوی کەربەلا. ئەمە وێڕای شەڕی صفین، کە وەک ئەوانەی ئەوکاتە تیایدا ژیاون و دووچاری مەترسییەکان و وزە پڕوکێنەکانی بوون دەڵێن «خوڕەی خوێن» دەبیسترا. بۆیە سەیرنییە کەسی جاهلی، لە رووی پیادەکردنی توندوتیژییەوە، لە ئیسلامی بەبەزەییتربێت.

ئەو مەیلە رەگەزپەرستانەیە، کە ئەویتر لە بازنەی دادپەروەری و چاکەکاری و تەنانەت مرۆڤایەتی دەکاتە دەرەوەو وا لە موسڵمان دەکات پێیوابێ پێغەمبەرەکەی، کە وەک ئێمە مرۆڤە، «هۆی بوونی دنیایە»، وەک ئەوەی لافیتەکانی رێکخستنێکی فەندەمەنتالیستانەی سوننی لە بەیروت وساڵیادی لەدایکبوونی پێغەمبەردا (ساڵی ٢٠٠٧) خستیانەڕوو. هەمان ئەم مەیلە وا لە یەکێک دەکات پێیوابێ ئیمامەکەی، کە وەک ئێمە خوڵقاوە، «ئاڵتونی پاڵاوتە بێت و باقی خەڵکەکانی تر خۆڵ بن»، وەک ئەوەی لە ئەفسانەی شیعەدا هاتووە. ئەوەش **دەردی بەخواکردن و تەنهاییە**، کە دەکرێت بە بەری دەستکردی خودادا، بۆ ئەوەی جێگەی بگرێتەوە و لەویش باشتربێت. ئەو شتەی خوا نوێکان دەیکەن، ئەوانەی ناوەکانی خوا و ماناکانیان دەخەنە خزمەتی ئارەزوو و مەبەستەکانی خۆیانەوە.

٣- ڕووی سێیەمی هەڵبژاردەخوازی و دڵنیایی، **فیکری تاکڕەهەندە**، کە دەیسەپێنێ وەک شوناسێکی پایەبەرزی بێگەرد و خاوەن تاقە مانا و واتا یان ڕوو و ڕەهەند مامەڵە لەگەڵ ماهیەتی ئەو حەقیقەتە بکرێت، کە پەیوەندیی بە واقیعەوە- واقیعی شتەکان و ڕووداوەکان یان خودەکان و وشەکان- هەیە. ئەمەش دەبێتە مایەی ڕەتکردنەوەی هەر دەستدانێکی بونخوازانە بۆ فرەلایەنی و فرەڕەنگی، بەهەڵەداچوون و ئیشکالییەت، شڵەژان و لێکدژی، یان بزووتنەوە و نەشونماکردن. واتە ڕەتکردنەوەی هەرشتێک کە ببێتە سەرچاوەی زیندوێتی و هێز و کانگەی دەوڵەمەندی و پێشکەوتن. بەوجۆرە دەقەکان لەلایەن مۆدیلی فەندەمەنتالیستانەوە، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە سروشەوە هەبێت یان بەو گوتارانەی بۆ لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی پێکهاتوون، بەمجۆرە دەخوێنرێنەوە: ماناکە یەکێکە، حەقیقەت ڕەهایە، دڵنیایی یەکلاکەرەوەیە، هەق ڕوونە و هیچ گومانێکی تێدا نییە و هیچ مشتومڕێک هەڵناگرێت. لێرەدا ئێمە لەبەردەم **دیکتاتۆریی حەقیقەت و ئیمپریالیزمی مانادایین.**

٤- ڕووی چوارەمی بانگەوازی هەڵبژاردەخوازی و بڕواخوازی و تاکێتی، پرنسیپی نەبزۆکییە. چونکە ڕەچەڵەک لای ئەوان نەگۆڕە، لەبەرئەوەی خاوەن سەرچاوەیەکی ئاسمانییە کە دەکەوێتە دەرەوەی کات و شوێن، بەئەندازەی ئەوەی لە سەرووی مێژووەوەیە. بۆیە خاوەنەکانی پێیانوایە ئەو ڕەچەڵەکە جێی ئەوەی پێش خۆی دەگرێتەوە و ئەوانیتر ڕەتدەکاتەوە، بەئەندازەی ئەوەی پێیانوایە ئەوەی دوای ئەو دێت، دەبێت تەنیا خستنەڕووی ئەو، یان درێژکراوە، یاخود جێبەجێکردنی ئەو بێت، ئەگینا تەنیا دەبێتە مایەی لادان و گەندەڵی، یاخود درۆودەلەسە و لە ڕێ لادان.

## ئامرازگەلی فیکری:

٥- پرنسیپی نەگۆڕی، **لۆژیکی تەماهیکردنی** لێ دەکەوێتەوە، کە کۆڵەکەی پێنجەمە. چونکە خواستی فەندەمەنتالیست، یەکسانیی تەواوەتییە لەگەڵ خۆا، لە ڕێگەی هاوجووتبوون لەگەڵ پرنسیپ یان ڕەچەڵەکدا، کە پێغەمبەرێک، یان ئیمامێک، یاخود ڕزگارکەرێک بەرجەستەیدەکات، ئەوەی بەلای خەڵکەوە لە خودی خۆیان لەپێشترە. بۆیە فەندەمەنتالیست کاری بیرکردنەوەی زیندوو و خوڵقێنەر پیادەناکات، واتە بیرناکاتەوە و ئەقڵ بەکارناهێنێ، چونکە ماوەیەکی ڕەخنەگرانە ناخاتە نێوان خود و ئەویتر و بەشێوەیەکی داخراو یان یەکلایەنانە بیردەکاتەوە، بەئەندازەی ئەوەی پیرۆزەکان و سەلمێنەکان و پێشوەختەکان کۆنترۆڵی بیرکردنەوەی دەکەن. کەواتە ئەو **خودێکی بیرکەرەوە** نییە، بەڵکو تەنیا **ئامێرێکی ئایدیۆلۆجیانە** یان فیکرییە،

بەئەندازەی ئەوەی پێیوایە یەکێک لە بریی ئەو بیردەکاتەوە و تەنیا پێویستە کوێڕایەڵ و ملکەچ بێت، ئەوەش ئەقڵییەتی حەشامات و ڕەوەیە.

ئەمەش ئەو یەککەوتەییە بنچینەییەیە کە فەندەمەنتالیزم، بە نیشانەکان و ئیفلیجییەکانیەوە، لەسەری بنیاتدەنرێ و بریتین لە: گیرخواردن لەئاستی کاتێک، ڕووداوێک، کەسێک یان دەقێکی دیاریکراودا، بەو پێیەی مەرجەعی ڕەها یان دواپێوانەیە کە پێویستە مرۆڤ لە گشت کۆششەکان و چالاکییەکانی خۆیدا ئاشنابێت پێی یان بیکات. بەم مانایە، فەندەمەنتالیست- لە ڕووی پێناسەوە- **کۆیلەی ناوەکەیەتی**، بەئەندازەی ئەوەی بڕوایەک، چەمکێک، یان **دیمەنێک قفڵ لە ئەقڵی دەدات**. ئەوەش لەسەر دەستی مەرجەعێک، جەمسەرێک، شێخێک، سەرۆکێک، یان سەرکردەیەک... هەتاکو ببێتە ئامرازێکی نادیدە هەرشتێک بکات کە پێیدەوترێ.

بێگومان ئەوە ڕەفتاری گشت فەندەمەنتالیزمەکانە، جا ئایینی بێت، یان ناسیونالیست و ئەوانیتر، جولەکە بێت، یان مەسیحی و ئیسلامی و عەلمانی... چونکە هەموو ئەوانە، لە ڕووی لۆژیک و میکانیزمەکانی کارکردن و کارتێکردنەکانەوە، وەک یەکن. بەوپێیەی سروشتی پیرۆزی، ڕەهایی، هەتاهەتایی و خوایی دەکەن بە بەری ئەو ئەزموون، کار، دەق و جەنگانەی مرۆڤانەن، بەئەندازەی ئەوەی پێغەمبەر، ئیمام، سەرۆک، پاڵەوان و بیریارەکانی خۆیان دەخەنە سەروو لێپێچنەوە و مشتومڕ و نارەزاییەوە. فەندەمەنتالیزمەکان بەوە هیچ ناکەن، جگە لە پەردەپۆشکردنی ئەوەی **شێوازەکانی زەوتکردن و قۆرخکردن**، هەڕەمەکی و ستەمکاری، جڵەوکردن و کۆنترۆڵکردن، یان جیاوازیکردن و دوورخستنەوە لەسەری بنیاتدەنرێ... ئەمجۆرە بەهەڵەدابردن و تۆقاندنە، وا لە هەندێک دەکات چەند خەسڵەتێکی خواوەندانە ببەخشنە خودی خۆیان یان کارەکانیان، لەکاتێکدا شوناسەکەیان بەتاڵ نییە لە ئارەزوو، دەمارگیری، کەموکوڕی، گۆڕان و کۆتاییهاتن.

ئەم بنەڕەتە بووە هۆی **مینڕێژکردنی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان**، چونکە نەگۆڕ، ڕەها، بڵندخوازی، کامڵ و تەنهایی لەسەر ئەرزی واقیع، تەنیا بە دەستدرێژییەکان و ئابڕوچوونەکان، یان تراژیدیا و کارەساتەکان گوزارشتیان لێ دەکرێت، لەبەرئەوەی لەواقیعدا جگە لە ڕێژەیی، فرەیی، کەموکوڕ، گۆڕاو، کاتی، یان لەناوچوو شتێکی تر لەئارادانییە...

٦- کۆڵەکەی شەشەم، **ئەقڵی دژخوازی** دوورخەرەوەخوازە، چونکە بڕوابوون بە پاکیزەیی، ڕەوایەتی، تەنهایی و نەگۆڕیی ڕەچەڵەک و توانای ئاشنابوون پێی و قەتیسکردنی ماناکەی و تەماهیکردن لەگەڵیدا، وا لە خاوەنەکەی دەکات ڕەوایەتی-

ئایینی و ئەخلاقی و نیشتمانی- قۆرخبکات و خۆی بکاتە گەورەی موسڵمانەکان و مەرکەسێک بیروڕای جیاوازی لەگەڵیدا هەبوو لە بازنەی ئیمان و موسڵمانان بیکاتە دەرەوە، ئەوەش بە **تاوانبارکردن و مەحکومکردنی**، یان دوورخستنەوە و ڕەتکردنەوەی. جا ئەگەر لە پێڕەوکارانی مەزهەبە ئیسلامییەکانی تر بێت، ئەوا بە لە ئایین لادەر و ڕێونکەر دادەنرێ، یان بە هەڵگەڕاوە تاوانباردەکرێت، ئەگەر لە پێڕەوکارانی ئایینەکان یان فەلسەفەکانی تریش بێت، ئەوا بە خوانەناس و کافر دادەنرێ و بە کەمکردنەوەی شکۆ و مرۆڤبوونی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

## سەنگەری مەزهەبی:

بەوجۆرە ئێمە لەبەردەمی **ستراتیجێکی ڕەتکردنەوەداین**، کە موسڵمانەکان لەگەڵ ئەوانیتر، بەتایبەتی لەنێوان خۆیاندا، پێڕەویدەکەن و وادەکات دیالۆگی نێوان **سوننە و شیعە** بگاتە بنبەست. ئەمەش ئەوەیە کە بینەران و چاودێران ساڵی ڕابردوو (٢٠٠٧) لە تەلەفزیۆنەکانەوە گوێبیستی بوون، لە ڕێگەی گفتوگۆی نێوان **شێخ قەرەزاوی** لەلایەک و **شێخ تەسخیری** لەلایەکی ترەوە، چونکە بە **گفتوگۆی کەڕەکان** دەچوو. ئەمەش سەیرنییە، لەبەرئەوەی هەریەکەیان لە سەنگەری نەگۆڕەکانی خۆیدا بوو و داخراوبوو بە ڕووی ئەوانیتردلو تەنیا دەنگی خۆی دەبیست، بەئەندازەی ئەوەی شەبەنگ و مۆدیلەکانی زاناکانی پێشوو زاڵبوو بەسەریاندا، ئەوانەی جیابوونەوەخوازییان دامەزراند و ڕێسایان بۆ دوژمنایەتی نێوان موسڵمانەکان دانا، هەتاکو پێڕەوکاران نرخی گرانی بدەن.

بەوجۆرە ململانێی نێوان سوننە و شیعە شایەتی ئەوەیە، ئێمە لەبەردەمی دوو تایەفەداین کە کەلێنی نێوانیان گەورەیە، چونکە هەریەکێکیان بڕوای بە سمبولەکانی خۆی هەیە و سمبولەکانی تر بەدرۆدەخاتەوە، تا ئەو ڕادەیەی ناونیشانەکانی خوا و قورئان و پێغەمبەر بوونەتە پلە دوو و سێ، بەراورد بەو ناو و ناونیشانانەی تایبەتن بە هەر تایەفەیەک.

بەهەرحاڵ، ئەقڵی دژخوازی پشتبەستوو بە **دڵنیایی کوێرانە** و پشتئەستوور بە **نەرجسیەتی گوشندە**، ڕێگەدەدات بەهەر موسڵمانێک گوێبیستی قسەی شێخەکەی خۆی بێت، کە بەباشی تێیناگات و خۆی بکاتە ئەمیر بەسەر موسڵمانەکانەوە و بەناوی ئەوانەوە و بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندیی ئەوان زۆرەملێیانە جەنگێک بەرپابکەن، کە بە ئەنجامی خراپ و دۆڕان بەسەریاندا دەشکێتەوە، وەک کارەساتەکەی جەنگی ڕووباری بارد (ئاپاری ٢٠٠٧).

ئەمە ئەفسانەی دامەزرێنەری هۆشمەندیی موسڵمانە بە هەرشەش بنەرەتەکەیە: بروایەکی هەڵبژاردەخواز، دڵنیاییەکی دۆگماییانە، فیکرێکی تاکرەهەند، پرنسیپێکی نەبزۆک، لۆژیکێکی هاوجووت و ئەقڵێکی دووخەرەوەخواز. هەموو ئەوانەش لەسەر ئاستی نەریتە ئایینیەکان و پەرستنی بنەرەتاکان و ناوەکان پێڕەویدەکرێن، هەتاکو شوناسەکان بگۆڕێن بۆ زیندانە برواخوازییەکان. هەروەها لەسەر ئاستی فیکری دوالیزمێک (دوانەیەک)ی دژخواز پێڕەویدەکرێت، کە بەشێوەیەکی بڕیاردەرانە و هەتاهەتایی ڕاست و چەوت، ئیماندار و کافر، باش و خراپ، یان خێر و شەڕ لێک جیادەکاتەوە... ئەو شتەی لەسەر ئاستی بوونی تیادازیاو و هەستپێکراو، وەک بانگەشە و سەختەکردن و مینرێژکردنی شوناسەکان، بەرجەستەدەکرێت. بەئەندازەی پەردەپۆشکردنی ئەو شڵەژان و ناکۆکی، گومان و ڕاڕایی، یان مەراق و چاوچنۆکیانەی بەهۆیانەوە دەچنرێت یان پێکدێت.

## ڕیشەکێشکردن:

لەکۆتاییدا ئەو بنەرەتانە هاماهەنگی و هاوکاریی یەکتر دەکەن، هەتاکو بە توندوتیژی پێڕەویبکرێن و بگاتە ڕادەی ڕەفتاری تیرۆریستانە کە جیهادکاران بەجۆرێکی تایبەتی قاڵن تیایدا. بەوجۆرە ئەقڵێکی موسڵمانی فەندەمەنتالیستانە دروستدەبێت و کاردەکات، ئەقڵێکی مینرێژکراو بە نییەتە شەڕانگێزەکان، بەئەندازەی ئەوەی ئەقڵێکی چەکدارە بەو دیمەنە ڕۆتینیانەی دوژمنایەتی جیاواز و ئەویتر دەکات، لەبەرئەوەی تۆمەتبار و مەحومکراوە، یان ئەفرۆزکراو و بەشەیتانیکراوە. بۆیە ئەوەی فەندەمەنتالیست دەیڵێ و بانگەشەی بۆ دەکات، وەک دەستدرێژکردنێکی سمبولی بۆ سەر ئەویتر وایە و دەستپێکە بۆ لەناوبردنی جەستەیی، ئەگەر پێویست بوو. وەک ئەوەی لە فەتوایەکدا هاتوە: «ئەگەر کافرێک لەئارادابوو، دەبێت بکوژرێت، تەنانەت ئەگەر ئەوە بووە مایەی کوشتنی هەزار موسڵمان». لێرەوە مەبەستی فەندەمەنتالیست ڕیشەکێشکردنە، بەئەندازەی ئەوەی داخستنی ئەقڵەکانە. ئەمەش ئەوەیە کە جیهادکاری جەزائیری (نەبیل سەحراوی) بە دروشمەکەی: «ئیسلام بەبێ خوێن سەرناکەوێ» گوزارشتی لێ کردوە.

ئێمە لەبەردەم ڕێبازێکی ئایدیۆلۆژیانەی دوژمنکاری داخراوداین، کە لەسەر بنچینەی پەرستنی ڕەچەڵەک و بێ خەوشیی پێشینە و خۆبەدوورگرتن لە هەڵە دامەزراوە، بەوپێیەی ئەوانە بەشەرەفترین بوونەوەر و چاکترین نەتەوە و گرووپی ڕزگارکەرن. ئەمجۆرە نەرجسییەتە، کە لوتبەرزی و خۆبادان و خۆبەزلزانین پێکەوە کۆدەکاتەوە، توندوتیژی دەخاتەوە و فیتنە مەزهەبییەکان و شەڕە ناوخۆییەکان بەرهەمدێنێ. وەک ئەوەی لە پرۆژە ئایدیۆلۆژی و بزووتنەوە سیاسییەکانی ڕێکخراوە ئیسلامییە

کافکەرەکـان و بانگـەوازە جیهادکـارە تیرۆریسـتەکانـدا بەرجەسـتەدەبێـت.

## زامی سمبولی:

بێگومان شوناسی ئیسلامی، بــە پیرۆزییەکان و ئەفسانـەکـان و نەگۆڕەکانیەوە، پێش سەردەمە نوێکان بەو شێوەیە دەرکی پێ نەکراوە و پیادەنەکراوە، چونکە ئەو شـوناسـە بەدرێژایی سەردەمەکانی سڕبوون و تێکشکان شاراوە، نووستوو، خاوخلیچک، یان ناکارا بووە.

بارەکە بەوجۆرە بووە و هەتاکو کاتی سنووربەزاندنی جیهانی ئیسلامی لەلایەن خۆرئاواوە بەردەوامبووە، بۆ ئەوەی بەهۆی بالآدەستیی ژیواری خۆرئاوەوە لە بوارە زانستی، تەکنیکی، شارستانی و سیاسییە جۆریەجۆرەکاندا دانیشتوانی جیهانی ئیسلامی توشی ڕاچڵەکین بکات... ئەم ڕووداوە ئەوەی بۆ موسڵمانەکان ئاشکراکرد، ئەوەی ئـەوان بەویتـری کافـر، بەدڕەوشت، یان دڕندەیان دادەنا، پێشـکەوتن و بالآدەستیی لەو شتانەدا بەدەستهێنابوو کە ئەوان شانازییان پێوە دەکرد، وێڕای ئەوەش هەڵمەتیکردبوە سەریان لە ناوجەرگەی ماڵەکانیاندا.

بەڵام ئەو ڕاچڵەکینەی خۆرئاوا هێنایەئاراوە، کە بزوێنەری ڕابوون و هۆکاری خەبەربوونەوە بوو لە سڕبوون، لەلایەکی دیکەوە جۆرێکی تر زامی سمبولی بەرهەمهێنا، کە تاکو ئێستا سارێژنەبوە و سەرچاوەی ئەو برە ئاڵۆزی و حەساسییەتەی مۆسڵمانەکانە لە مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانی خۆرئاوادا.

بێگومان هەڵوێستەکان وەک یەک نەبوون، چونکە گرووپێک هەبوو ئەقڵی خۆی بەڕووی کولتووری خۆرئاوادا کردەوە و کەوتە ژێر کاریگەرییەوەو فەلسەفە و زانست و بەهاو سیستەمەکانی پیادەکرد... وەک ئەوەی لای بانگەوازخوازانی مۆدێرنیتە، بە گشت ئاقارە لیبرالی و ناسیونالیست و چەپڕەوە جۆریەجۆرەکانیەوە، لە شبلی شەمیل و لوتفی سەید و تەها حسێنەوە بیگرە، هەتاکو هاوچەرخەکان...

هەروەها ئەوانەش هەبوون، کە پێشکەوتنی خۆرئاوا سەرسامیکردبوون، بەڵام دانیان بەوەدا نەدەنا، بەڵکو لوتبەرزی و کەللەڕەقیان بەرامبەری دەنواندو هەوڵیاندەدا حەقیقەت بەلارێدا بەرن، بەوەی بڵێن خۆرئاوا بۆیە پێشکەوتووە، چونکە میتۆدەکانی موسڵمانەکانی پێڕەوی و جێبەجێ کردوە. ئەمە هەڵوێستی شێخ محەمەد عەبدەیە، کە بانگەوازخوازان و ڕێنماییکاران پاش ئەو دووبارەیانکردۆتەوە. ئەگەرچی لەلایەکی ترەوە شـێخ و ئیمـام، وەک هەڵوێسـتی زۆرێـک لـە سەلەفییەکانی بانگەوازخوازی زیاندنەوە و چاکسازی، هەوڵی دا کەلەپور و مۆدێرنیتە ئاوێتەی یەکتر بکات.

**بەموسڵمانکردنی هەمەلایەن:**

بەڵام لەبەرامبەر ئەوانە سەلەفییە توندڕەوەکان داوای گەڕانەوە بۆ ڕەچەڵەکەکان و پێڕەویکردنی دەقەکان و لاساییکردنەوەی پێشینەیان کرد، وەک ئەوەی ڕەشید ڕەزا کردی، کە بە باپیرەی ڕاستەقینەی ئەوە دادەنرێ کە پێیدەوترێ فەندەمەنتالیزمی هاوچەرخ، بە کۆپی و ئاقار و حیزبە جۆربەجۆرەکانیەوە، وەک ئیخوان موسلمین یان کۆمەڵەی ئیسلامی.

بێگومان ململانێ، لەسەر ڕاستبێژی و ڕەوایەتی، لەنێوان موسڵمانەکان و مۆدێرنیستەکاندا هەبوو، کە باڵادەستی تیایدا بۆ دەیان ساڵ بۆ بەرەی مۆدێرنیستەکان بوو، بە ئاقارە جۆربەجۆرەکانیەوە و لەژێر دروشمی ناسیونالیزم، سۆسیالیزم، عەلمانیەت، یان لیبرالیزمدا... بەڵام پاش هەرەسهێنانی پرۆژەی ناسیونالیستانە و شکستخواردنی بەرنامەی سۆسیالیستانە، کە لە بنەڕەتدا بە مردوویی لەدایکبوو، ئیسلامییەکان لەژێر دروشمی «ئیسلام چارەسەر و ئەڵتەرناتیڤە»دا، بەهێزەوە هاتنەوە مەیدان. کاتێک بەرەی کەلەپورخواز هاتە ڕیزی پێشەوە و پێڕەوکارانی گۆڕەپانەکانی فیکر و کارکردنیان لە وڵاتێکی عەرەبی زیاتر ڕامالّی، جا بەدەسەڵاتگرتنەدەست بووبێ، یان بە کۆنترۆڵکردنی شەقام و گرتبوونەوەکان. لەبەرامبەردا بەرەی مۆدێرنیستەکان پاشەکشەیکرد و لە ڕووی کاریگەری و چالاکییەوە کەوتە پەراوێزەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک وەک ئەوەی جارانی لێ نایەتەوە، بۆیە گەڕانەوەی سەلەفییەت بەشێوە فەندەمەنتالیستیەکەی چەندین گۆڕانکاریی گرنگ و مەترسیداری لەگەڵ خۆیدا هێنا، ئەوەش لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم/ بزووتنەوە فەندەمەنتالیستەکان لادانێک بوون لە ئیسلامی تەقلیدی: ئیسلامی دامەزراوە ڕەسمییەکانی وەک ئەزهەر، بەڵکو شۆڕشێک بوون بەسەریدا، ئەوەش لە ڕێگەی تۆمەتبارکردنی پێڕەوکارانی بە خۆبەدەستەوەدان و پێکهاتن.

دووەم/ ئەو بزووتنەوانە ئەوپەڕی دەمارگیری و داخران و توندڕەویان پیادەکرد، بۆیە هەموو ئەو شتانەیان لە کەلەپوور فڕێدا، کە باسی کرانەوە و پێکگەیشتن و ئاشنابوون بە یەک دەکەن و هانی جێبەجێکردنیان دەدەن، هەتاکو تەنیا کار بە لۆژیکی ڕەتکردنەوە و پێکدادان بکرێت.

سێیەم/ ئەو بزووتنەوانە، لە ڕێگەی دامەزراوەی فەتوا و بەرزکردنەوەی شمشێری حەرامکردن و بەکافرکردنەوە، کۆششیانکردوە بۆ کۆنترۆڵکردنی ژیانی تاک لە گشت کایەکان و وردەکارییەکانی پەیوەندییە تایبەتیەکاندا - لە بێشکەوە تاکو کاتی مردن -، وەک سەرەنجامی بەموسڵمانکردنی هەمەلایەنی کەرتەکانی بوون و بزوێنەرەکانی ژیان.

چوارەم/ ئەو بزووتنەوانە، بۆ بەربەرچدانەوە و تۆڵەسەندنەوە و دادگارییکردن، هاتنە مەیدانەوە. بۆیە بەشێوە تیرۆریستییە کارەساتهێنەرەکە گەڕانەوە. بەرچاوترین شایەتیش بۆ ئەوە ئەوەیە کە موسڵمانەکان لە سۆماڵ دەوڵەتەکەی خۆیان بە ناوی دادگاوە ناونا. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە، ئامانجی بنەڕەتیان تیرۆرکردن و تۆڵەسەندنەوە و سزادانە.

## بەخواکردن و دڕندایەتی:

بەو جۆرە ئەوەی نادیار، سڕکراو، یان پەکخراو بوو، بەشێوەیەکی ترسناکتر و لە ناخی هۆشمەندیی قەیراناوی و تاریکییەکانی یادەوەریی بریندار و گرژەوە سەریدەرهێنا و پاش ئەوەی بانگەشەکارانی نوێ گۆڕەپان و تەلەفزیۆن زانکۆکانیان داگیرکرد، ئەوەی لە قوڵایی کتێبەکاندا بوو، یان لە مزگەوت و کۆبوونەوە تایبەتیەکاندا باسدەکرا، بووە بابەتی بڵاوکردنەوە و بەگشتیکردن. بەوەش ئەفسانەی دامەزراوەیی گۆڕا بۆ ئامێرێکی ئایدیۆلۆژیانە، کە ئەقڵ لە قاڵبدەدات و بەسەر جەستەکاندا زاڵدەبێت و شێوازی فیقهی و خوێندنی ئاینی گۆڕان بۆ سیستەمێکی تۆتالیتاری، یان چالاکییەکی تیرۆریستانە، بەئەندازەی کارپێکردنی شوناس وەک دەمارگیرییەکی دەروونی، یان مەیلێکی فاشیانە، بۆ ئەوەی شوناس بگۆڕێت بۆ مینێکی کۆمەڵگەیی، یان زیندانێکی بڕواخوازی، یاخود تەنگەژەیەکی ژیواری.

ئەمەش ئەوەیە، کە حیزب و ڕێکخراوە جیهادکارەکان و سمبول، ئەمیر، بانگەواز و بەرنامەکانیان بەرجەستەیانکرد: ئەوان کاریان بۆ گێڕانەوەی شێوەیەکی ئیسلام کرد، بە سەرلەنوێ دروستکردن و ساخکردنەوەی مۆدێلە بەسەرچووەکان، بانگەوازە مەحاڵەکان، سیاسەتە مینرێژکراوەکان و فەتوا بێهودەکانی. ئەوەش گەڕانەوەیە بۆ دواوە، بەشێوە هەرە خراپ و مەترسیدارەکەی، بەئەندازەی ئەوەی ئەرجسییەت لە دەربڕینی شوناسدا گەیشتە چڵەپۆپەی بەهەڵەدابردن و بەتارماییکردن و جادووگەری، نموونەکانیش لە ڕوو و کایە جۆربەجۆرەکانەوە ئاشکرا و حاشاهەڵنەگرن:

دزینی تیۆرە زانستییە نوێکان و گێڕانەوەی ڕەچەڵەکیان بۆ قورئان، بەوپێیەی زانینی دەربارەی هەمووشتێک تێدایە. دەرکردنی ئەو فەتوایانەی جێی پێکەنینن و دەبنە هۆی شێواندنی ناوبانگی موسڵمانەکان لە جیهاندا، وەک فتواکانی بارۆکە، شیانی خواردنەوەی میزی پێغەمبەر، شیردان بە گەورە و ڕەفاندنی بێتاوانەکان و سەربڕینیان لەبەردەمی خەڵکدا بەناوی خوا و ئیسلامەوە. زەوتکردنی ڕەوایەتی لەلایەن ئەمیرەکانی جیهادەوە، بەمەبەستی بەرپاکردنی جەنگەکان بەناوی ئەو موسڵمانانەی ئەوان

بەرەو لەناوچوونیان دەبەن. ئەو بانگەشەکار و سەرکردانەی گەمە بەچارەنووسەکان دەکەن، بە ئەندازەی ئەوەی سروشتی پیرۆزی دەبەخشنە کارەکان و سیاسەتە دنیاییەکان و جەنگەکانی خۆیان. ئەو بانگەواز و پرۆژە ئایینیانەی دەگۆڕێن بۆ فیتنە مەزهەبیەکان لە زیاتر لە گۆرەپانێکی عەرەبیدا. بەهاکانی یەکترناسین، کە دەبنە کارگەکانی بەرهەمهێنانی **لێکترازان و دوژمنایەتی و یەکترکوشتن**. شەریعەتێکی لێبوردە کە دەگۆڕێ بۆ **سیستەمێکی خنکێنەری** وەها کە خەڵک هەناسەسواردەکات. بەڵێنی ڕزگارکردنی موسڵمانەکان دەگۆڕێت بۆ چەند ستراتیجێکی هەژمونخواز و خۆ بەگەورەزانین... بەکورتی **باشترین نەتەوە** کە بۆ خەڵک خراوەتەڕوو، خەریکە دەگۆڕێت بۆ **پیاوە نەخۆشەکەی** ئەم جیهانە، هەتاکو نەخۆشییە کولتورییەکانی بەشێوەیەکی تایبەتی خراپترین. ئەمەش ئابڕووچوون و کارەساتەکەیە.

بەوجۆرە لەواقیعدا دروشمە ئایینیەکان کاریانپێدەکرێت، واتە دەبنە هۆی خستنەوەی دژەکانیان و پێکهاتنی بانگەوازخوازان لەگەڵ ئەوانەی بانگەشە بۆ بەگژاچوونەوەیان دەکەن. ئەوەش پێکهاتنی دژەکانە لەپێناو دروستکردنی ماڵوێرانیداو بەرهەمی **میکرۆبی هەڵبژاردەخوازییە**، کە ئەقڵ و ئازادیی بیرکردنەوە ڕەتدەکاتەوە و مرۆڤەکان دەگۆڕێت بۆ ئەو ژمارە و کەرەستانەی ئارەزووە نابیناکان بەڕێوەیاندەبەن، بۆ بەرهەمهێنانی ئەو هەموو لەناوبردن و وێرانکارییە لە ژێر چەند دروشمێکی لاهوتیی ئایینیدا. ئەمەش سەیرنییە، چونکە بەخواکردن و یەکتایی دەبێتە مایەی دەمارگیری و درندایەتیی زیاتر، کتومت وەک چۆن بەدەستهێنان و خاوەندارێتی زیاتر دەبێتە مایەی بەفیرۆدان و پیسبوونی زیاتر.

لێرەوە فەندەمەنتالیزمی ئیسلامی تەنیا بەجۆرێک کاریکردوە پێچەوانەی ئەوە بووە کە لەپێناویدا هاتوە، یان دژی ئەوە بووە کە ڕایگەیاندوە بەرگریی لێ دەکات یان بانگەشەی بۆ بەرگیرلێکردنی کردوە. چونکە ئەو نەیتوانیوە بەرژەوەندییەکان دەستەبەربکات و گەندەڵی و خراپەکارییەکان بەدووربگرێت، بەڵکو خەریکە هەموو ئەو دەستکەوت و بەرهەمانە لەناودەبات کە کۆمەڵگە عەرەبیەکان، لە کۆشیاندا بۆ پێشکەوتن و نوێکردنەوە و هاوچەرخبوون، هێناویانەتەدی. لەوەشدا سەلەفییەکان و فەندەمەنتالیزمە هاوچەرخەکان وەک یەک بوون، ئەگەرنا ئەو هەموو نابینایی و تیرۆرە چۆن لێکدەدەینەوە.

### گەڕانەوەی تۆقێنەر:

ئەو پوختەیە چییە کە دەکرێت لەو شیکردنەوەیەی دیاردەی فەندەمەنتالیزمەوە هەڵیهێنجین؟
دەتوانین سەرنج بۆ چەند هێما و مانایەک ڕابکێشین:

١- یەکەم هیچ شتێکی کۆتایی دەربارەی دابڕان لەگەڵ مەیلی فەندەمەنتالیستانەدا نییە، بەجیاوازیی بیروبۆچوون و دروشمەکانیەوە. ئەزموونی ئەورووپیش باشترین نموونەیە، چونکە پاش دوو سەدە لە ڕۆشنگەریی، ئەقڵی فەندەمەنتالیزمی خاوەن سروشتی ناسیونالیستانە، یان ئایینی، یاخود چینایەتی سەریهەڵدا، وەک ئەوەی لە **ڕژێم و بڕواو پڕۆژە نازی، فاشی، ستالینی، ماوی و زانیۆنییەکاندا** بەرجەستەبوو... ئێستاش فەندەمەنتالیزمی ئینجیلی دیارترین یاریکەرە لە گۆڕەپانی ئەمریکیدا. کێ بڕوای بەوە دەکرد لە خودی ئەمریکا و هەندێک ویلایەتدا داوای ڕەتکردنەوەی خوێندنی تیۆری گەشەکردنی زانستی بکرێت، هەتاکو بڕوای خوڵقاندنی تەوراتی جێگەی بگرێتەوە؟ ئەمەش مانای ئەوەیە، **مەیلی فەندەمەنتالیستانە دەستدانێکی هەمیشەیە** لە هەر کۆمەڵگەیەکدا و چارەنووسی هەریەکێکە بە دەستەواژەکانی خواوەندی و پیرۆزی و تاکێتی مامەڵە لەگەڵ خودی خۆیدا بکات. بەئەندازەی دەمارگیربوون و داخران و توندڕەوبوونیش بگۆڕێت بۆ فاشی، یان ڕەگەزپەرست، یان وەک نیرۆن، حەجاج و هۆلاکۆ هەڵسوکەوتبکات. بەم واتایە، هیچ کەسێک لە مەیلی فەندەمەنتالیست یان فاشیانە بەدەرنابێت. جارێکی تر ئەمە باری هەریەکێکە خۆی بەخوا بکات، جا تاقە سەرۆک بێت، یان قارەمانێکی ڕزگارکەر، شاعیرێک کە ڕقی لە زیندەوەر دەبێتەوە، فەیلەسوفێک کە کلیلەکانی حەقیقەت قۆرخدەکات.

٢- دووەم دەرکەوتنی فەندەمەنتالیزم بووە **هۆی گۆڕانی نەخشەی ململانێ** و تەرازووی هێز لەسەر ئاستی جیهان، چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی فەندەمەنتالیزمەکان، لە جەنگی تیۆرەکان و قوتابخانە ئایدیۆلۆژییەکان و ڕێبازە سیاسییەکانەوە هەنگاودەنرێت بەرەو **جەنگی خواکان و دەقە پیرۆزەکان** و لەگەڵیدا لە دوانەی کۆنەپەرست/ پێشکەوتنخواز، سەرمایەدار/ سۆسیالیست، یان ناسیونالیزم/ چەپڕەوەوە هەنگاودەنرێت بەرەو دوانەکانی فەندەمەنتالیست/ عەلمانی یان موحافەزەکار/ چاکسازیخواز... لێرەوە چەند دەستەواژەیەکی نوێ، وەک جیهادکار، ئینجیلخواز، تەوەرەی خراپەکاریی، شەیتانی هەرە گەورە، چەنەبازی ئیسلامی و خاچپەرست... سەریانهەڵدا. ئەمەش سەیرنییە، چونکە هەر جەنگە و دەستەواژە، کەرەستە، بانگەشەکار، پاڵەوان، خوا و قەسابەکانی خۆی هەیە. بەوجۆرە ئیمڕۆ ئێمە لەبەردەمی چەندین پڕۆژەی ئایینیداین، ئەو فەندەمەنتالیستە ناکۆکانە بەرجەستەیدەکەن کە پایەداری دابەشدەکەن و لەسەر ڕەوەی مرۆڤانە ململانێدەکەن، بەو ئەندازەیەی بانگەشە بۆ قۆرخکردنی حەقیقەت و ڕەوایەتی دەکەن. ئەمەش چارەنووسی هەر پڕۆژەیەکی تاکلایەنانەی هەڵبژاردەخوازی فەندەمەنتالیستانەیە.

ڕاستە فەندەمەنتالیزمەکان دژی یەکتری دەجەنگن، وەک هەریەکێک کە بە لۆژیکی دژایەتی و ئەقڵی هەڵبژاردەخوازی و قۆرخکردن کاردەکات: خولقاندنی دوژمنەکان لە ناوخۆ و دەرەوە، بۆ هەڵهاتن لەو هەقدارییانەی پەیوەندییان بە ئازادییە گشتییەکان و چاککردنی هەلومەرجی بژێوییەوە هەیە، وەک ئەوەی ڕژێمە تۆتالیتارەکان و حکومەتە جیهادکارەکان دەیکەن، بەڵام فەندەمەنتالیستەکان سازاون، چونکە یەکێکیان پێویستی بەویترە و پەنای بۆ دەبات و لەسەری دەژی، بەئەندازەی ئەوەی بانگەشە بۆ بەگژاچوونەوەی دەکات. سەرەنجام ئەو فەندەمەنتالیزمانە خراپییەکانی یەکتری کۆدەکەنەوە.

## گرەوی دۆڕاو:

سێیەم بێکەڵکیی پرۆژەی فەندەمەنتالیستانەیە. ڕاستە فەندەمەنتالیزمی ئایینی هێشتا زۆر کارامەیە، بەڵام ڕاستبێژی و ڕەوایەتیی لەدەستداوە، چونکە بیانوی بانگەوازەکەی، بەگژاچوونەوەی نەیارەکانیەتی لە بەرەکانی مۆدێرنیتە، عەلمانیەت، ئەقڵانیەت و دیموکراسیدا، بۆ پاراستنی کەلەپووری ئایینی بە سروشتە ئایدیالیست و غەیبیەکەی، یان ئەفسانەیی و تەوباوییەکەی، بەڵام سەرەنجام هەڵگەڕانەوەی فەندەمەنتالیزمە مەزهەبی و تایەفەگەرییەکانە دژی یەکتری. ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەو دراوە بڕواخوازییەی ڕێبەر و بانگەوازخوازانی کۆن و نوێ و خاوەن پرۆژە و بەرنامە ئایینیەکان بەکاریانهێناوە، بنەڕەتی قەیرانەکە و ڕیشەی کێشەکەیە.

بێگومان ئەوانە قەیرانەکە بەپێچەوانەی ئەوەوە لێکدەدەنەوە، واتە بەوەی خەڵک پێڕەوی ئەو بڕوا و شەریعەت، یان بڕیار و فەریزەتانە ناکەن کە ئەمان دەیانخەنەڕوو یان داوایان دەکەن، بەڵام ئەوەی ئەوان داوایدەکەن، واتە گەڕانەوە بۆ پێشینەی پیاوچاک و بەو جۆرەی تێیدەگەن و لێکیدەدەنەوە، بنەڕەتی دەردەکەیە. ئەگەرنا، چۆن لەوە بگەین، پاش چەندین سەدەی داگیرکردنی شوێنەکانی فەزای گشتی و هەڵکشان و بڵاوبوونەوەی هەرووژمهێنی ئاقاری ئایینی، بە ئیماندار و جیهادکارەکانیەوە، ئەو هەموو پشێوی، نائارامی، تیرۆر و شەڕانەی ناوخۆ دەدوورینەوە؟! بۆ ئەوەی چارەسەر و ڕێگەچارەیەک بدۆزینەوە، با دان بەوەدا بنێین کە: ئەوە بەری خراپ و وێرانکەر و کوشندەی ئەقڵییەت، دروشم، فێرکردن، ئاخاوتن، ناوبانگ، سمبول و نەریتە ئایینیەکانی ئەوانە... ئەوەش گرەوی دۆڕاو و ستراتیژی کوشندەمانە لەسەر شانۆی جیهان.

**کۆکردنەوەی خراپەکان:**

چوارەم ئەوەیە، دەشێت فەندەمەنتالیزم -وەک هەندێک هاتنە سەر شانۆی لێکدەدەنەوە- بەرهەمی قەیران و شکستخواردنەکانی گشت بانگەواز و پرۆژەکانی پێش خۆی بێت، یان بەرهەمی هەموو ئەو شکستخواردن و هەرەسهێنان و کارەساتانە بێت کە جیهانی عەرەب بەخۆوەی دیون، بەڵام بەرێکی خراپە. چونکە، وەک خۆی بانگەشەی بۆ دەکات، نە چارەسەری پێکهێنا و نە وەڵامدەرەوەیەکی باش بوو. بەپێچەوانەوە، وەک چارەنووس و سەرەنجامەکان دەریدەخەن، لەگەڵیدا قەیرانەکان قوڵتریوونەوە، لەبەرئەوەی پرۆژەی ئایینی فەندەمەنتالیستانە و جیهادکارانــە، بە کۆپییە جیاواز و رێکخستنە جەنگاوەرەکانییەوە، خراپییەکانی پرۆژەکانی پێشوو کۆدەکاتەوە، نەک تەنیا لەبەرئەوەی هەڵەکانیان دووبارەدەکاتەوە و دەکەوێتە ناو هەمان قۆرتەکانیانــەوە و پەککەوتەییەکانیـان دووبارەدەکاتەوە، ئەوەش بەهۆی **بەتارمایکردنی خەباتکارانە و بەهەڵەدابردنی ئایدیۆلۆژیانە** و وشـکهەڵاتنی فیکرییەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی دەیەوێ خەڵک بگەڕێنێتەوە بۆ رابردوو. ئەو گەڕانەوەیەی، بە مۆدێل و بەها و بڕیار و رێساکانییەوە، تەنیا ترسناک و وێرانکارانە دەبێت، بەشێوەیەک کە چاوەڕوانی ناکەین و توشی راچڵەکینمان دەکات. ئەمەش لە وڵاتێکی عەرەبی زیاتردا ژیان دەگۆڕێت بۆ **تەڵە و قەیرانەکان**، بەئەندازەی ئەوەی شوناسێکی ئیسلامیی هاوچەرخ دروستدەکات، کە خراپترین شتەکانی رابردوو کۆدەکاتەوە. وەک ئەوەی لە **دەستەگەریی هۆزگەرانە و دەمارگیریی تایەفەگەرانە** و خراپترین شتەکانی ناو مۆدێرنیتەدا بەرجەستەدەبێت. هەروەها لە **ئەقڵی تۆتالیتارانە و سیستەمی سەرتاپاگیرانەدا** بەرجەستەدەبێت، کە حەشـاماتە ڕیزبەستوەکان خەریکی پەرستنی سـەرۆک و خواکانیانن. ئەو سەرۆک و خوایانەی دەبنە کۆیلەی ئارەزوو، ئەفسانە، دەسەڵات، پۆست و ناوبانگەکانی خۆیان.

لێرەوە، بەوپێیەی واقیع دەخوێنمەوە، پرۆژەی فەندەمەنتالیستانە سەرناکەوێ و بەردەوام نابێت، چونکە وەک گرووپ و نەتەوەکانی تر شیاونییە بۆ نیشتەجێبوونی راست لـەم جیهانەدا، بەمەبەستی بەشداریکردن لە دروستکردنی ژیواردا، بەشێوەیەکی بەرهەمدار و کارامە. ئەو پرۆژەیە **ڕیزبەڕ و کاردانەوەیە**، بەئەندازەی ئەوەی ڕواڵەتکار و دەردە. بۆیە چارەنووسی شەپۆلی فەندەمەنتالیستانە، بە دروشم و کۆپییە جۆربەجۆرەکانیەوە، قەتیسبوون و پاشەکشەکردنە لەبەردەم پرۆژەکانی تردا، بە ناونیشان و ڕەهەندە جۆربەجۆرە خاوەن سروشتە ئاشتیخواز، شارستانی، مۆدێرنیست، ئەقڵانی، لیبرالی، یان دیموکراتیەکانیەوە... لێرەدا **ڕەهەندی زەمینی یان هەسارەییش** دەخەمە سەریان،

بەتایبەتی کاتێک مرۆڤ - بەنموونە جۆربەجۆرە ئایینخواز و عەلمانیەکانیەوە - بە بەخواکردن، ناوەندێتی، لوتبەرزی و چاوچنۆکیی خۆیەوە، خەریک بوو سروشت وێرانبکات و زەوی پیس بکات.

## هاتنەدەرەوە لە تونێلەکە چۆن دەبێت؟

ئێستا، کە شەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسێت و زیاتر لە وڵاتێکی عەرەب پارچەپارچەدەکات، بەس نییە بڵێین خوا سەربەخۆکان و بێئیمانەکان لە خراپەکاریی ئەو ئیماندارە ئایینیانە دەپارێزێ، کە شەڕ لەگەڵ یەکتر دەکەن. چونکە وێرانەی کوێرانە، کە خوا نوێکان و شمشێربەدەستانی حەرامکردن و بەکافرکردن دەیخەنەوە، سنووری دوانەی عەلمانییەت/ لاهوتییەت تێدەپەڕێنێ، پاش شکستخواردنی پرۆژە ناسیونالیستی و سۆسیالیستی و ئیسلامییەکان و ئەو ترازیدیا و کارەساتانەی بەسەر وڵات و بەندەکانیاندا هێنا. ئەمەش دەبێتە هۆی خستنەڕووی پرسیاری **حەقیقەتی تاڵ و** واقیعی بێدەرەتان: هاتنەدەرەوە لەو تونێلە چۆن دەبێت؟

بۆ توخنکەوتن، پێموایە سەبارەت بە بانگەوازخوازانی بەرەی ئایین، پێویستە زاتی ئەوە بکەین **نەرجسیەتی ئایینی خۆمان وردوخاشبکەین و دەستبەرداری ناوەندیخوازیی مەزهەبی خۆمان** بین، هەتاکو بتوانین لە گۆشەگیریی فەندەمەنتالیزمانەی خۆمان بێینە دەرەوە و لە وەهمەکانی هەڵبژاردەخوازیی خۆمان ڕزگاربین. ئەمەش پێویستی بە کشانەوە لە بیروڕاکانمان و قاڵبوونمان لە ڕەخنەلەخۆگرتن هەیە، بۆ پێداچوونەوەی ئەقڵانی و بنیاتنەرانە، بەمەبەستی نوێکردنەوەی تێڕوانین و وێناکردنەکان و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی بڕواکان، بە بەکارهێنانی زمانێکی نوێی مامەڵەکردن لەگەڵ خود و ئەویتر و دنیا. بۆ ئەوەش، یەکەم پێویستە هەرکەسێک دەستبەرداری بانگەشەکردن بێت بۆ ئەوەی خۆی بەتەنیا کلیلەکانی حەقیقەت و ڕێنیشاندانی بەدەستەوەیە، یان خۆی بەتەنیا نوێنەری ئیسلامی فەندەمەنتالیستانەی ڕاستە. دوەم دەبێت هەمووومان واز لەو بانگەشەیە بهێنین کە دەڵێت: ئێمە باشترین نەتەوەین و پێغەمبەر و ئیمامەکانمان سەردارەکانی خوڵقاندنن.

## دانپیانان و پۆزشهێنانەوە:

پوختەی قسەکە ئەمەیە: ئەوەی پێویستمان پێیەتی، **قاڵبوونە لە لەخۆپرسینەوەدا،** بەمەبەستی پیادەکردنی خۆپارێزیی فیکری و بێفیزیی بوونخوازانە.

سەرەتای ئەوە دانپیانان و پۆزشهێنانەوەیە، بەجۆرێک ئەو بانگەوازخواز و

وەعزدادەرە و ڕێنیشاندەرانەی بە دیمەن و ئاخاوتن و نازناوەکانیان ئاسمانیان داگیرکردوە، داوای لێبوردن لە خەڵک بکەن و ڕەخنەگرانە چاو بە بیروڕاکانی خۆیاندا بخشێننەوە، لەپێناو خۆپاککردنەوە لەو خراپەکاریانەی بڕواکانیان کە بۆتە مایەی ئەو توندوتیژی و تیرۆرە. ڕووەکەی تر، دانپیانانی دوولایەنەیە، ئەویش مانای ئەوەیە جیاواز دژ و دوژمنمان نییە، بەڵکو بەشەکەی تری بوونمانە کە پێویستە باش مامەڵەی لەگەڵ بکەین، بەمەبەستی خوڵقاندنی چەند چوارچێوەیەکی کۆکەرەوە و جیهانێکی هاوبەش. بەبێ ئەوە، ڕاستبێژی ئەو بانگەواز و تێز و دیالۆگانە لەئارادانابێت کە بەرهەمەکەی- وەک ئەوەی ڕووی داوە- پێکهاتنی دژەکانی ناوەوەیە لەگەڵ دەرەوە، لەسەر وێرانکردنی جیهانی عەرەب.

## خۆپارێزی و بێفیزی:

با لە سڕبوونی لاهوتی خەبەرمانبێتەوە، هەتاکو بایەخ بە چاودێریکردنی زەوی بدەین، لەبری ئەوەی ڕوو لە ئاسمان بکەین، چونکە هەڵبژاردەخوازی پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکان ژەهراویدەکات و پیرۆزی وەردەگێڕدرێت بۆ دەستدرێژیکردن و ئابڕووچوون، بەکلایەنی خراپترین شێوازەکانی ستەمکاری دروستدەکات، نەگۆڕی شوناسێکی هەزار و بەتاڵ بەرهەمدێنێ، ڕەسەنایەتی دەگۆڕێت بۆ ڕواڵەت یان نەخۆشییەک، کەلەپوور دەبێتە بارگرانی و ئاستەنگێک، فەتوا ئەو خۆپارێزییە وێراندەکات کە لوتکەی چاکەکارییەکانە، حیجاب پارێزەرنابێت، بەڵکو مەراق و دوودڵیی زیاتر دروستدەکات و دەشێت داوێنپیسی یان تەقینەوە بەرهەمبهێنێ، دروشمی قوربانیدانیش، لە ژێر ناونیشانی شەهیدبووندا- کە بۆ خۆی خۆکوشتنە- خەڵک دەگۆڕێت بۆ قوربانی.

بۆ دەربازبوون لەو تونێلەی فەندەمەنتالیستەکان دەکەونە ناوی، جا دروشمەکان هەرچییەک بن، شارەزابوون لە زمانی خوڵقاندن و تاوتوێکردن و گۆڕاندا پێویستە. ئەوەش بە داهێنانی چەندین هێما، سمبول، چەمک، بەها و ڕێسای نوێ و زیندوو و کاریگەر، سەبارەت بە خوێندنەوەی واقیع و دروستکردنی ژیان، یان پیادەکردنی شوناس و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەویتر. چونکە شوناسی زیندوو و داهێنەر و بنیاتنەر، بەتایبەتی ئیمڕۆ لە سەردەمی کۆچکردنەکان و ئاڵوگۆڕ و تێکچڕژانی بەرژەوەندی و چارەنووسەکاندا، ئەوە نییە کە بەشێوەیەکی داخراو، ڕەقهەڵاتوو، تاکلایەن، یان دوژمنکارانە پیادەدەکرێت، بەڵکو ئەوەیە کە وەک شوناسێکی نادیار، شڵەژاو، دووڕەگ و ئاوێتە دروست و پیادە دەکرێت، بەئەندازەی ئەوەی شوناسێکی گەشتکەر و سنووربڕە، بەتەواوی مانای سمبولی و مادی، یان کاتدار و شوێنخوازی وشەکە.

ئەوە مەسەلەکەیە: دەستبەردارنەبوونی هیچ کەسێک لە کەلەپوورەکەی یان دانەماڵینی لە شوناسەکەی، بەڵکو کارکردن لەسەر رووداوەکانی ژیان و دەرهاویشتەکانی بوونی خۆی، هەتاکو بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ، بنیاتنەر، جیهانی و هەنوکەییانە تایبەتمەندیی خۆی پیادەبکات. ئەوەش پێویستی بە خەملاندنی **کەرەستەیەکی فیکریی نوێی خاوەن دەستەواژەگەلی جیاواز** هەیە: میتۆدی میانکارانە، رەهەندی هەمەلایەنانە، فیکری ئاوێتە، شوناسی فرەرەگ، دانابەیەکدانان، بەرپرسیارێتیی هاوبەش. پێش ئەوەش پیادەکردنی خۆپارێزی و بێفیزی، لە رێگەی رەخنە لەخۆگرتنەوە، کە وا لە کەسێک دەکات دان بە سنوورداری و رێژەییبوونی کارەکانی خۆیدا بنێ و خۆی لە هەڵەکردن بەدوورنەگرێ و نەبێتە ئامرازی دەستی کەسی تر، بەڵکو کاربکات بۆ خوڵقاندنی ئەوەی دەرفەت بڕەخسێت بۆ پێکگەیشتن و ئاڵوگۆڕ، یان کارلێککردن لە شوێن، رووبەر، زمان و نێوانکارییەکاندا...

(*) ئەم وتارە لە گۆڤاری «المسبار»، ئەبوزەبی، کتێبی ٢٨، ژمارەی تشرینی دووەمی ٢٠٠٨دا بڵاوبۆتەوە.

# گەڕانەوە ترسناکەکان و کۆتاییە کارەساتاوییەکان
## بیریارەکان: سڕبوون و دەردەکانیان

### ڕۆڵی بیریاران:

پرسیارێکی ناوەندی و زۆر پێویست هەیە، هەر کارکەرێکی لقەکانی مەعریفە و کایەکانی فیکر، وەک فەلسەفە، زانستە مرۆڤایەتیەکان، کۆمەڵناسی، ئابووری، یان ئەوانەی سەرقاڵی بەرهەمهێنانی ئەو بیرۆکە و تیۆرانەن، کە بەشداریدەکەن لە دروستکردنی ڕای گشتیدا و لە بنەڕەتدا زمانەکانی خوێندنەوە و لێکدانەوە، یان کەرەستەکانی تێگەیشتن و دەستنیشانکردن، یاخود مۆدێلەکانی کارکردن و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنن، سەبارەت بە توخنکەوتنی واقیع و پێشهاتەکان، یان چارەسەری مەسەلە و کێشەکان، لەخۆی دەکات...

ئێمە لە کوێی ڕووداوەکانی جیهانداین، بە تەقینەوە و گەشەکردنەکانیەوە؟ چۆن بەشداریدەکەین لە چارەسەرکردنی قەیران و تەنگەژەکانیدا؟

خاڵی هەنگاوهەڵهێنانم بۆ ئەوە، واقیعە بە کێشە و تەحەددا لەڕادەبەدەرەکانیەوە، وەک ئەوەی لە قەیرانی جیهانیدا بەرجەستەدەبێت، بەنموونە دارایی و بانکییەکانی ئەم دواییانەیەوە. ئەم قەیرانەش نوێ نییە، بەڵکو ماوەیەکە قوڵپدەدات بۆ ئەوەی بتەقێتەوە، وەک ئەوەی لەم دواییانەدا ڕوویدا، بۆ ئەوەی پریشکەکانی بەر سەرتاپای جیهان بکەوێت. بەئەندازەی ئەوەی شێوازی بەڕێوەبردنی مەسەلەکانی پەرەپێدانی مرۆڤایەتیش لەسەر ئاستێک زیاتر و لە کایەیەک زیاتردا دەخاتە سەر مێزی لێپێچینەوە و گفتوگۆکردن.

ئەگەر بمەوێت لە ڕوانگەیەکی پسپۆڕییەوە بچمە ناو مەسەلەکەوە، ئەوا هێمادەکەم بۆ پارادۆکس یان کەلێنێک لەنێوان بیرۆکەکان و واقیع، تیۆرەکان و پێشهاتەکان، پرۆژەکان و ئەنجامەکاندا... بەکورتی لەنێوان ڕووناکبیری و ژیاندا.

چونکە جیهان بە بزوێنەرەکان، تریەکان، کەرەستەکان، هێزەکان، نەخشەکان و

بکەرەکانی سەر شانۆکەیەوە لەگۆڕاندایە، کەچی دەبینین بیرۆکەکان هێشتا نەگۆڕ، یان چەقبەستو، یان ڕەقهەڵاتوون، بەڵکو وێرانکەر یان ترسناکن. بەوجۆرە ئێمە دەچینە ناو واقیعێکەوە کە لەوپەڕی بزاوتی بێشومار، ئاڵۆزیی لەڕادەبەدەر و خێرایی بێوێنەدایە. لەبەرامبەردا دەبینین بیریارەکان لە چەندین ڕووەوە نقومی سڕبوونی ئەقڵی بوون:

## ١ – سڕبوونی دەستەبژێرانە:

لای ئێمە ئەمە قسەکردنە دەربارەی پرۆژەیەکی عەرەبی، ڕێنسانسخواز یان پەرەپێدانخواز، کە تەنیا کاری دەستەبژێرە ڕووناکبیری یان فیکرییەکانە. بەمجۆرە زۆربەی بیریارانی عەرەب مامەڵە لەگەڵ پرۆژەکانیان دەکەن: هەتاکو ئێستا بە ئەقڵییەتی سەردەمی ڕێنسانس بیردەکەنەوە، وەک ئەوەی هێشتا لە ڕۆژگاری محەمەد عەبدە، ئەفغانی، کەواکبی و شبلی شەمیلدا بین. ئەمە ئەوەیە زۆرێک لەو ڕووناکبیرانە دەیکەن، کە خەو بە گۆڕین لەسەر شانۆی جیهانەوە دەبینن. ئەوانە بە ئەقڵییەتی مارکس و ئەوانە بیردەکەنەوە کە تیۆرەکەیان پیادەکرد و ڕێبازی ئەو و پێغەمبەرەکانی مۆدێرنیتەیان گرتەبەر. لەکاتێکدا گۆڕانەکانی ئێستا و هەرەسهێنانە یەک لەدوای یەکەکان گۆڕانکاری دەخوازن، نەک تەنیا لە ناونیشان و ناوەڕۆکی وێناکاری و مەعریفیی پرۆژەکاندا، بەڵکو لە شێوازی بیرکردنەوە و ڕۆڵی بیریارەکانیشدا، هەروەها لە ئامرازەکانی تاوتوێکردنی بیرۆکەکان و میکانیزمەکانی کاریگەریشیاندا. جا ئەگەر جیهان بەشێوەیەکی ڕیشەیی یان بونیادی لەگۆڕاندابێت، ئەوە بێگومان بیرۆکەکانیش دەگۆڕێن، سیاسەتی فیکر و ستراتیژی دەستوەردان و ناوبژیکردن بەجۆرێکی تایبەتی گۆڕانیان بەسەردا دێت.

بەو جۆرە چیتر سوودبەخش نییە بڵێین بیروڕای بیریارەکان ناگاتە جەماوەری فراوان، ئەوەی هەندێک عەرەب دەیڵێن. هەروەها بێسوودە بۆ ڕۆژگاری بەسەرچوو بگرین، مەبەست ڕۆژگاری (سارتەر) و (ڕاسل) یان (فۆکۆ) و (دۆلۆز)ە، ئەوەی هەندێک فەرەنسی دەیکەن. بابڵێین تەلەفزیۆنەکان فەلسەفە و بیرۆکە مەزنەکان دەشێوێنن، یان بیریارەکان لەسەر شانۆ دووردەخەنەوە...

بێگومان مایەی وڕێنەکردن و بەتارماییکردنە، هەندێک ڕۆشنگەری عەرەب بەئەقڵییەتی مەهدیی مونتەزەر بیربکەنەوە و تیۆریزەبکەن، ئەوانەی چاوەڕوانی سەرهەڵدانی فەیلەسووفێکن بێت و نەخۆشییەکان بۆ نەتەوە دەستنیشان بکات و چەند چارەسەرێکی سوودبەخش و شفابەخشیان بۆ بدۆزێتەوە. کەچی ئەنجامەکە دەستەوسان و بێتوانایی زیاتر بوو...

واچاکترە، ئەوەی لە کایەی فیکردا کاردەکات، لە سڕبوونی دەستەبژێرانە بێداربێتەوە، ئەو سڕبوونەی لەسەر بنچینەی بەچاوی سووک تەماشاکردنی جەماوەر، یان قۆرخکردنی کلیلەکانی چارەسەرکردن بنیاتنراوە. ئەو پێیوابووە پێشڕەوە و سەرکردایەتیدەکات، یان کاردەکات و کاریگەریی دەخاتەوە، بەئەندازەی ئەوەی وەک کەسێک ڕەفتاریکردوە کە لە بریی خەڵک بیردەکاتەوە، یان لە جیاتی ئەوان خەون دەبینێت، کەچی جیهان جیاواز یان بەپێچەوانەی ویستی ئەو دەگۆڕێت. ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەو سەرکردە یان دروستکەری ڕای گشتی نەبووە، هەروەها کاریگەرنەبووە، بەئەندازەی ئەوەی بابەتێک بووە بۆ کارکردن، یان لە شوێنێکەوە کاریتێکراوە کە حسابی بۆ نەکردوە، یاخود هەموان لەناکاودا ڕووبەڕووی ئەو ڕووداوانە دەبنەوە، کە دژی تیۆر و هەڵوێستەکانی ئەون.

ئەمەش سەیرنییە: ئەو ڕۆژگارە بەسەرچووە کە تیایدا فەیلەسووف، یان بانگەشەکار، یاخود پێغەمبەرێک تیۆریزە بۆ پرۆژەیەک بکات، تایبەت بێت بە کۆمەڵگەیەک یان جیهانێک بەگشتی، جا ئەوە سەبارەت بە جیهانی عەرەب بێت یان ئەوانیتر. بۆیە پاش شکستخواردنی پرۆژە ناسیونالیست و چەپڕەو و ئیسلامییەکان، ئەوانەی خاوەنەکانیان ڕووبەڕووی ئەرکەکانی ڕیفۆرم و نوێکردنەوە یان پەرەپێدان بوونەوە و ئاکامەکەی ئاڵۆزبوونی زیاتری کێشەکان بوو، بێسوودە بە هەمان ئەقڵییەت و شێواز، یان ئاڕاستە بیریکەینەوە. هەروەها لیبرالیزمیش بە وێنە نوێکانی، بەهۆی قەیرانەکانییەوە، درزی تێکەوتوە، بۆ ئەوەی دەریبخات جگە لە پێشێلکردنی پرنسیپ و بەڵێنەکانی خۆی کارێکی باشی لەدەست نایەت.

باشترە چاو بەوانەدا بخشێنینەوە کە بیرمان لێ دەکردنەوە و بیرمان بۆ دەکردنەوەو لەپێناویاندا بیرمان دەکردەوە، بەجۆرێک گوێ لەوانە بگرین کە بانگەشەی سەرکردایەتیکردن و گۆڕانیان دەکەین، لەکاتێکدا لە کایەی بیرکردنەوە و بایەخپێدان دووریاندەخەینەوە. هەروەها دان بەوەدا بنێین ئەوانە خاوەن چەندین بیر و بیروڕا و پێشنیاری تایبەت بەخۆیان و بەرژەوەندییەکانیانن، چونکە خەڵک بەگشتی بە چاک یان خراپ بیردەکەنەوە. بەم مانایە، پەراوێزخراوەکان و بێکارەکان و هەموو ئەوانەی لە تیۆر و بەرنامە و سیاسەتەکانی خۆمانیان دووردەخەینەوە، زیاتر لەوەی حسابی بۆ دەکەین بکەرن، بەڵام بەشێوەیەکی خراپ، یان نەزۆک، یاخود وێرانکەر... ئەگەر دەستدانێک بۆ گۆڕانکاری لەئارادابێت، ئەوە پێویستی بەوەیە هەر بکەرێک لە بواری کارەکەیدا زیندوێتیی فیکری پیادەبکات، جا ئەوە بەشێوەی خوڵقاندن و بەرهەمهێنان بێت، یان لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە بێت لە گفتوگۆ و تاوتوێکردنەکاندا، بەجۆرێک

کە وەک بەرهەمهێن یان بکەرێک بەشدارییکات لە دەستنیشانکردنی کێشەکەی و چاککردنی هەلومەرجەکەیدا، هەروەها بەشدارییکات لە بنیاتنانی کۆمەڵگەکەی و دروستکردنی چارەنووسەکەیدا.

## ٢ - سڕبوونی ناسیونالیستانە:

ئەمەش بڕوابوونە بەوەی پرۆژەی عەرەبی مەسەلەیەکە تەنیا پەیوەندیی بە عەرەب خۆیانەوە هەیە. لەکاتێکدا چیتر مەسەلەکە بەو جۆرە نەماوەتەوە، بەتایبەتی لەمڕودا کە بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان لەسەر گۆڕەپانی گەردوونی بەیەکداچوون. وەک ئەوەی گرفتەکانی پیسبوونی ژینگە و هەرەسهێنانی بۆرسە، هەتاکو دەگاتە تێکچوونی ئاسایش و بڵاوبوونەوەی توندوتیژی، دەیخەنەڕوو.

ئیمڕۆ هەر بیرۆکەیەکی داهێنەرانە و بەپیت کە لەم یان ئەو وڵات، لەملا یان ئەولای جیهان بەرهەمبهێنرێت، لە گۆڕەپانی فیکردا تاوتوێدەکرێت، هەتاکو بشێت بۆ وەبەرهێنـان و وەگەڕخسـتن، ئەمـەش بەمەبەستی گۆڕینێک کە دەوڵەمەند و بەرهەمداریدەکات، بەئەندازەی ئەوەی شت دەخاتە سەری و نوێیدەکاتـەوە. بۆیـە ئەگەرچی کارەکە خاوەن سروشتێکی ناوچەیی یان پێشینەیەکی نیشتمانییە، بەڵام ئێمە لەسەر ئاستی گەردوونی بیردەکەینەوە. لێرەوە پرۆژەی عەرەبی، جا ئەوە پەیوەندیی بە پەرەپێدانەوە هەبێت یان سیاسەت و ئایین، چیتر مەسەلەیەکی عەرەبیانەی ڕووت نییە، بەڵکو بۆتە پرۆژەیەکی خاوەن ڕەهەندی جیهانی، کە چەندین دەوڵەت و دامودەزگای هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی بەشداری لە داڕاشتن و جێبەجێکردنیدا دەکەن. ئەمە ئەوەیە ئێستا لە فەڕەنسا ڕوودەدات، کە پێشتر بەدڵنیاییەوە و لەماوەی سێ دەیەیەکی شکۆداردا (١٩٤٥-١٩٧٥) بەسەر سەروەرییەکانیدا خەوی لێ کەوت، بەوپێیەی مۆدێلەکەی سەرکەوتووترین و چاکترینـە. سەرەنجامیش پاشکەوتنی بوو لەچاو ئەوانەی لە دواوەی بوون و پێشیکەوتن. بۆیە پاش هاتنی سەرۆک (نیکۆلای سارکۆزی) لیژنەیەک لە پسپۆڕ و شارەزایان، لە گشت کایەکان و وڵاتە جۆربەجۆرە ئەورووپایی و نائەورووپاییەکاندا، ڕاسپێردرا بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتێک سەبارەت بە چۆنیەتی ڕزگارکردن و وەگەڕخستنی کارەکانی پەرەپێدان لە فەڕەنسا.

باشترە بیریاری عەرەب لە سڕبوونی ناسیۆنالیسـتانە و قەڵا ئایینیـەکان بێتە دەرەوە. شۆڕش و وەرچەرخان و گۆڕانکارییە تەکنۆلۆژی و ژیواری، یان کۆمەڵگەیی و سیاسی، یاخود فیکری و ڕووناکبیرییەکان هەڵمەتی داگیرکاری یان وێرانکردنی ژیواری نین، بەڵام بەهەشتێکی بەسۆزیش نین، بەڵکو چەند دەستدانێکی کراوە و دەرفەتێکی

رەخساون بۆ ئەوەی بەچاکی گۆڕانکاری بکەین، بەمەرجێک بە زمانی دەستدان و داهێنان مامەڵەیان لەگەڵ بکەین. ئەوەی لە مۆدێرنیتە و جیهانگیری یان ڕابردووی کەلەپووری بەدەستیدێنین، کاری لەسەر دەکەین بە مەبەستی گۆڕین و وەبەرهێنانی. ئەوەش لە پرۆسەیەکی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەدا کە تیایدا بەشێوەیەکی بەرهەمێن و بنیاتنەرانە بگۆڕێین و بەشداربین لە گۆڕینی ئەویتر و واقیعدا. ئەمە ئەو شتەیە کە خاوەن شوناسە دەوڵەمەند و بەهێزەکان دەیکەن، ئەوانە دەتوانن لەبەر ڕۆشنایی راستی و گۆڕانکارییەکاندا بەباشی بگۆڕێن، هەتاکو بەشداربیکەن لە ۆرکشۆپی ژیواری و دەوڵەمەندکردنی سەرمایەی مەعریفی و تەکنۆلۆژی، یان بەهاخواز و جوانناسیی مرۆڤایەتیدا. باشترین داکۆکیکردن لە شوناس، پیادەکردنی داهێنەرانە و بێوێنەی تایبەتمەندیی کۆمەڵگەیی و رووناکبیرییە، بەشێوەیەک کە دەرفەتی بەشداریکردنی لە دروستکردنی ژیوار و سەرکردایەتیکردنی چارەنووسەکاندا هەبێت. لێرەوە ئەو لەپشت شوناسی خۆیەوە سەنگەر لێ نادات، بەڵکو پەیوەندییەکی زیندوو، بزۆک، پەرەسەندوو لەگەڵ پرنسیپەکانی خۆیدا دەبەستێت. پەیوەندییەکی ئاوێتە بە کۆڵەکە ناوچەیی و نیشتمانییەکانی، هەروەها بە ڕەهەندە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیەکانی...

### ٣ - سڕبوونی ئایدیۆلۆجیانە:

ئەمەش وا لە بیریار دەکات لەپشت دروشمەکانەوە سەنگەر لێ بدات و وەک تاقەمۆدێلێک یان دوامۆدێلی ڕابوون و ڕیفۆرم، یان ڕزگاری و پێشکەوتن، یاخود نوێکردنەوە و پەرەپێدان مامەڵە لەگەڵ چەمکەکەی یان قوتابخانەکەی بکرێت. مامەڵەکردنی ناسیونالیست لەگەڵ یەکگرتن، چەپڕەو لەگەڵ سۆشیالیزم، شۆڕشگێڕ لەگەڵ ئازادی، سەرمایەدار لەگەڵ بازاڕ و لیبرالیزم بەوجۆرە بوو. هەروەها ئیسلامیش بەهەمان جۆر مامەڵەی لەگەڵ دروشم و زاتەکانی خۆی کردوە. هەر کۆمەڵەیەک وەک فریادڕەس و دڵسۆزێک خۆی خستۆتەڕوو، کە بەتەنیا کلیلە تەلیسماوییەکانی چارەسەرەکانی پێیە. هەموان وەک زاتە پیرۆز یان بتە تیۆرییەکان مامەڵەیان لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆیان کردوە. بەکورتی، **هەموان چەمکەکانیان بەخواکرد و گۆڕیانن بۆ سەربازگەکان، جا ئەوە پەیوەندیی بە دەقەوە بووبێت یان بازاڕ، بە ئازادیەوە بووبێت یان ڕۆشنگەری.**

ئەنجامەکەش هەژاری و پاشکەوتن، یان گەندەڵی و ستەمکاریی زیاتربوو، ئەمە وێڕای تاریکی و نادیدەیی و تیرۆر. سەیریش نییە ئەنجامەکە بەوشێوەیەیە، چونکە ئەوە بەرەنجامی مامەڵەکردنە بە ئەقڵییەتی پەردەپۆشکردن و کورتکردنەوە و ساکارکردن لەگەڵ واقعی ئاوێتە و ئاڵۆزدا، ئەوە بەرهەمی مامەڵەکردنە لەگەڵ

ئەویتری شەریک بە لۆژیکی دوورخستنەوە یان ڕیشەکێشکردن. بەکورتی ئەمە سەرەنجامی مامەڵەکردنە لەگەڵ بیرۆکە و شوناسەکان، بە وشەکانی ڕەها، پیرۆز، کۆتایی، حەتمی و بەهەشتی: وەرگێڕانی دروشمەکان بۆ دژەکانیان و پێکهاتنی دژەکان لەسەر دروستکردنی وێرانکاری. فەندەمەنتالیستەکانی ناسیونالیزم و چەپ و ئیسلام بەمجۆرە مامەڵەیان لەگەڵ شوناس و بیرۆکەکانی خۆیان کرد، بۆ ئەوەی ئەم هەموو کارەساتە بچنینەوە. هەروەها فەندەمەنتالیستەکانی لیبرالیزم و تاڵەبانییەکانی سەرمایەداری بەهەمان جۆر مامەڵەیان لەگەڵ بازاڕ و سامانەکانیاندا کرد، هەتاکو مایەپووچی و هەرەسهێنان بدورینەوە...

باشترە بیریاری عەرەب لە قۆزاخە ئایدیۆلۆژی و سڕبوونە تەویاوییەکەی خۆی بێتە دەرەوە، چونکە کارەکانی ڕابوون و پەرەسەندن بە **ئەقڵێکی ئاوێتەی** بنیاتنەری تەلاسازیانە ئەنجامدەدرێت، کە خاوەنەکەی واقیع بە گشت ئاڵۆزی و تێکهەڵکێشییەکان، یان لایەن و چینەکان، یاخود ئاڵۆزی و پارادۆکسەکانییەوە ڕەچاودەکات...

## ٤ – سڕبوونی مرۆڤزانانە:

ئەمەش وا لە بیریار دەکات فرمێسکی درۆزنانە بۆ مرۆڤبوونی مرۆڤ بڕێژێت و ئاڵای بەرگریکردن لە مافەکانی بەرزیکاتەوەو ئەوە فەرامۆشبکات مرۆڤبوونمان سەرچاوەی ئەو بەربەرییەتەمانە کە تەنیا لە دژی یەکتر پیادەیناکەین، بەڵکو دژی بوونەوەرەکانی تریش ئەنجامیدەدەین. بۆیە ئێمە ئاژەڵان بە دڕەندەبوون تاوانباردەکەین، هەتاکو دڕندەیی لەڕادەبەدەری خۆمان بشارینەوە و شانازی بەوەوە بکەین کە بوونەوەرانێکی عاقڵین، لەکاتێکدا خەریکە بە گەمژەیی و هەوەسە شێتانەکانی خۆمان ژیان وێرانبکەین. بەم واتایە، نارەوایە هەندێک خەڵک بە ئاژەڵ بەراوردبکەین، چونکە ئاژەڵ وەک مرۆڤ زیان بە ڕەگەزەکەی خۆی ناگەیەنێت، هەندێک ئاژەڵیش لەو خەڵکە بۆ مرۆڤ باشترن کە تەنیا زیانگەیاندن و چاندنی گەندەڵی یان وێرانکارییان لێ دەوەشێتەوە. ئەمەش وا لە هەندێک خۆپارێز و بێفیز دەکات چاو بەو پۆلێنکردنەدا بخشێننەوە کە مرۆڤ و ئامۆزا ئاژەڵەکانی، بەپێی دوانەی مرۆڤ و دڕندە، یان عاقڵ و ناعاقڵ لێک جیادەکاتەوە. ئەگەر بیریاری عەرەب بیەوێت کەمتر دڕندە بێت، با لە سڕبوونی مرۆڤچێتیی خۆی بێداربێتەوەو دان بە مافەکانی ئاژەڵان و سروشتدا بنێت.

ئەم سڕبوونە ئاوێتەیە، کـە لـە یوتۆپیابوونی پڕۆژەکان و سەنگەرلێدان لە پشت بیرۆکەکان، یان جێگیربوون لە قۆزاخەی مەزهەبەکاندا دەردەکەوێت، دەبێتە مایەی دروستکردنی ئەو دەردانەی وزەی زیندووی بیرکردنەوە و توانای تێگەیشتن و

دەستنیشانکردن، یان خەملاندن و تەگبیرکردن، یاخود هەڵهێنجانی چارەسەرە بەسوود و کاریگەرەکان ئیفلیجدەکەن.

## دەردی سادەکردنەوە:

بیریاری ئایدیۆلۆژیست و لەقاڵبدراو و شێوەگرتوو، بەتایبەتی بەجۆرە عەرەبییەکەی، هەمیشە بەشێوەیەکی تاکڕەهەندی (مانەوی)یانە بیردەکاتەوە، هەتاکو بکەوێتە نێوان هەردوو دەمی مقاشەوە و دنیا بە چاک یان خراپ، بەهەشت یان دۆزەخ ببینێت.. بەمجۆرە مامەڵەیان لەگەڵ سوشیالیزم یان لیبرالیزم کرد. هەروەها وەک خراپەکارییەکی ڕووت، یان بەهەشتێکی بەڵێنپێدراو مامەڵەیان لەگەڵ جیهانگیری کرد، لەکاتێکدا ئەوە شۆڕشێکی نەرمەهێزی دووجەمسەریی زانستی و تەکنۆلۆژیانەیە. وەک هەر شۆڕشێک، دیاردەیەک، گۆڕانێک، یان وەرچەرخانێکیش، گرنگی یان مەترسیی لە شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵیدا، وەک ڕووداوێکی کراوە بەڕووی گشت ئەگەرەکانیدا، کە فرەجۆرە بە واتاکانیەوە، دەوڵەمەندە بە دەستدانەکانییەوە.

بەهەمان جۆر هەنوکە ئەوانە مامەڵە لەگەڵ قەیرانی دارایی ئێستا دەکەن، بە ئەقڵییەتی کورتکردنەوە و سادەکردنەوە، لە ڕێگەی وشەکانی شەبەنگەکان، گەڕانەوە، کۆتایی، هەرەسهێنان و تۆڵەسەندنەوەوە.. هیچ شتێک لەوەی ڕوودەدات وەک خۆی لێ نایەتەوە، بەڵام دەکرێت کاری لەسەر بکرێت و بگۆڕێت، هەتاکو بخرێتە ناو سیستەمێکی نوێوە، یان لەگەڵیدا تێکەڵبکرێت، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ئیشی پێ بکرێت و بخرێتەگەڕ یان وەبەربهێنرێت. هەروەها هیچ شتێک لەناوناچێت یان ناپوکێتەوە، چونکە لای ئەوەی شارەزای خوێندنەوە و دەستنیشانکردنە، هەر کۆتاییەک بانگەوازە بۆ سەرەتایەکی نوێ. هەر کۆتاییەک پشتبەستوویێت بە ڕەتکردنەوە و ڕیشەکێشکردن، ئاستەنگەکان بەرهەمدێنێ، یان کارەسات دەخاتەوە. هەر سەرەتایەکیش لای ئەوەی چاودێریی گۆڕانکارییەکان دەکات و لە هەرەسهێنانەکان ڕادەمێنێ، کۆتاییەکەی تەواوبوون یان بێکەڵک بوونە.

بەم مانایە، هەر کۆتاییەک مۆڵەت و پاسپۆرتی پەڕینەوەیە بۆ جیهانێکی تر، ئەگەرنا ئەوە کارەساتە. هەروەها هەر گەڕانەوەیەک بۆ دواوە کاریکاتۆریانە یان ترسناکە، وەک ئاکامی فەتوا ئایینیەکان. بۆیە سۆشیالیزم بەشێوە بەهەشتئاساکەی، کە گۆڕا بۆ هەژاری و بێدەرەتانی و ستەمکاری، ناگەڕێتەوە. هەروەها سەرمایەداریش لەناوناچێت، بەڵام بەشێوە دەرپەڕیو و دڕندەکەی دەگەڕێتەوە، کە ئەو هەموو هەرەسهێنانەی بەرهەمهێناوە، لەگەڵ بوونی جیاوازییەکدا، ئەویش ئەوەیە کە

سەرمایەداری، بەوپێیەی کرانەوەی ئاسۆ و سنوور و بازاڕەکانە بەڕووی ئازادیی دەسپێشکەری و هەڵبژاردن و کار و داهێناندا، لە سۆشیالیزم باشترە بۆ پەرەپێدان، کە بریتییە لە هاوتایی، یەکسانی، دادپەروەری و هاوکاری.. چونکە بزوێنەری دینامیکییەتی تاکەکەسی یان بەکۆمەڵی بوون، جیاوازی و جیاکارییە و ڕواڵەتەکەشی هەمەڕەنگی و جیایی و هونەرسازییە.

هەروەها گەڕانەوەی دەوڵەت تەنیا بەشێوە تۆتالیتارییەکەیەتی، کە بۆتە هۆی دروستکردنی ئەو ڕەوە مرۆیی و حەشاماتە کوێرانەی سەرۆکەکان بەخوادەکەن، هەتاکو بیانگۆڕێت بۆ کۆیلەی ناو، دەسەڵات، ئەفسانە و هەوەسەکانی خۆیان. هەروەها دەوڵەتی نەتەوەییش، کە جەنگە جیهانییەماڵوێرانکەرەکانیان دروستکردوە، ناگەڕێتەوە. بێگومان ئایینیش تەنیا بەشێوە ترسناک و تیرۆریستییەکەی دەگەڕێتەوە، وەک ئەوەی بانگەشەکارانی بڵاوکەرەوەی تیرۆر لەسەر گۆڕەپانی گەردوونی پیادەیدەکەن و فیتنەکان دروستدەکەن و دەیان نێرن بۆ وڵاتە عەرەبییەکان.

باشترە هەرکەسێک هۆشی بەبەردا بێتەوە، ئەمە ئەوەیە کە ئەورووپا پاش جەنگە خۆییە وێرانکارەکان کردی، جا ئەنجامی دەرککردنی بووبێ بە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی میللەتەکانی، یان لە ترسی هێزە نوێیە مەزنە هەڵکشاوەکان بووبێ: ئەورووپا هۆشی بەبەردا هاتەوە، بۆیە کاری لەسەر خۆی کرد، هەتاکو وردە وردە بگۆڕێت بۆ فەزایەکی تاوتوێکردن، ئەوەش بەئەندازی سەرکەوتنی لە شکاندنی لۆژیکی تاکڕەهەندانەدا، یان ڕزگاربوون لە سیستەمی تۆتالیتاری، یان ملنەدانی بۆ بانگەوازە ئایینیە فەندەمەنتالیستەکان. بۆیە ئەورووپا ئیمڕۆ کەمتر توندوتیژی لە جیهاندا پیادەدەکات و داواکاریی لەسەر مانا و کاڵا ئایینیەکان لای میللەتەکانی خاوبۆتەوە.

## دەردی گشتاندن:

ڕووی دوەمی دەردی سادەکردنەوە، دەردی گشتاندنە کە پێدەچێت یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بیریارەکانی عەرەب، چونکە هەریەکێک لە ئێمە، کاتێک باسی ڕووناکبیریی عەرەب دەکات، وەک یەکەیەکی هاوشێوە، یان سیستەمێکی داخراو مامەڵەی لەگەڵ دەکات. بەهەمان شێوە دەربارەی ئەقڵی عەرەبی یان فیکری عەرەبی. بەوجۆرە ئێمە فەرمانی ڕەها دەردەکەین یان هەڵسەنگاندنی هەمەلایەن دەگشتێنین، وەک ئەوەی بڵێین ڕووناکبیرییەکەمان ناڕوانێتە داهاتوو، یان باسی غافڵکوژی و وشکبوونەوەی ئەقڵ بکەین، یان جەغت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە فیکری عەرەبی توشی تێکشکان بووە... ئەمە سەرەڕای ئەوانەی باسی گیانەڵای کولتووری عەرەب دەکەن.

ئەم گشتاندنەی زۆرجار پیادەیدەکەم، جۆرێک لە سادەکردنەوە و پەردەپۆشکردن لەخۆدەگرێت، بەئەندازەی ئەوەی یەکێکە لە هۆکارەکانی شکسخواردن و نائومێدی. ئەوەش مانای ئەوەیە، تاقە کولتوورێک و تاقە فیکر و ئەقڵێک لە جیهانی عەرەب و هیچ کۆمەڵگەیەکی تردا بوونی نییە، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە شوناسەکان بەجیهانیدەبن و رووناکبیری و مۆدێرنیتەکان فرەرەگدەبن، ئەو مەسەلەیەی چوارچێوە نیشتمانییەکان تێکدەشکێنێ و لە کایەی بیرۆکە و زانینەکاندا دابەشکردنە جوگرافییەکان تێدەپەڕێنێ، بۆ بەرژەوەندیی ئاقار و قوتابخانە یان میتۆدەکان، بە سروشتە جیهانی و کۆسمۆپۆلیتییەکەی.

بیریارانی عەرەبی هاوچەرخی وەها هەن، کە نزیکترن لەو ئاقارە فیکری یان هێڵە بروامەندی بیریارە خۆرئاواییە چەپڕەوەکان - ئەوانەی ئۆپۆزسیۆنن یان جیابوونەوەخواز - دەکەونە ناوی، وەک (بۆردیۆ) یان (بادیۆ)... ئەمانەش زۆر لەو بیریارانەی تری عەرەب دوورترن، کە دەکەونە ناو ئەو هێڵەی بیریارانی وەها لەخۆدەگرێت کە مامەڵەیەکی رەخنەگرانەیان لەگەڵ پرۆژە ئایدیۆلۆژییەکان و تەنانەت پرۆژەی مۆدێرنیتە و رۆشنگەری کردوە. ئەمەش ئەو شەپۆلە فیکرییەیە، کە ناوی پۆست مۆدێرنیتەی لێ نراوە و لەدوائەنجامدا شەپۆلێکی مۆدێرنیتەی نوێیە، پێڕەوکارانی کاریانکردوە بۆ نوێکردنەوەی فۆڕمی ئەقڵانیبوون، یان فراوانکردنی ئاسۆکانی رۆشنگەری نەک پێچەوانەکەی، وەک ئەوەی ساواکانی مۆدێرنیتە و قەشەکانی رۆشنکردنەوە بەهەڵەداچوون.

باشتر و دەوڵەمەندترە پێداچوونەوە بەو پۆلێنکردنانەدا بکرێت کە لەئارادان، بەمەبەستی پێکهێنانی پۆلێنکردنی نوێ، جا ئەوە بەپێی ئاقار و قوتابخانەکان بێت، یان کایە و بواری شارەزاییەکان، بەجۆرێک کە باسی فیکری خۆرئاوایی یان عەرەبی نەکەین، بەڵکو باسی فەلسەفە و کۆمەڵناسی بکەین، یان باسی مۆدێرن یان تەقلیدی، ئەقڵانی یان نائەقڵانی بکەین... لەبەر رۆشنایی ئەوەدا، روویەک هەیە کە لەیادیدەکەین، ئەویش بەرهەمهێنان و داهێنانە. مەبەست ئەوەیە، جیاوازیی بنچینەیی لەنێوان بیریارێک و بیریارێکی تردا، توانای داهێنان و نوێکردنەوەیەتی لە کایەکان و میتۆدەکاندا، یان لە کەرەستەکان و چەمکەکاندا. ئەمە پێوانەی بنەڕەتییە، نەک رووناکبیربوونی ئۆرگانیکی و نائۆرگانیکی. هەندێک عەرەب هەن، ئەگەرچی زۆر کەمن، کە لە کایە مەعریفییەکانی خۆیاندا داهێنانی زیاتریان لە هەندێک خۆرئاوایی کردوە. ئەوانەی نوێ و داهێنەریش نابینن، پاشکەوتووەکان و دیلەکانی رابردوون، ئەوانەن کە بەشداریدەکەن لەو هەرەسهێنان یان وێرانکارییەی دروستیاندەکەین.

## دەردی لەدەستچوون:

یەکێک لە دەردەکانی تر، بەتایبەتی لای بیریارانی عەرەب، ئەوەیە پاش کات لەدەستچوون دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی پێش دە یـان بیست سـاڵ بەشێوەیەکی دوژمنکارانە ڕەتیانکردۆتەوە.

بەمجۆرە مامەڵەیان لەگەڵ ناونیشانەکانی دیموکراسی یان کۆمەڵگەی مەدەنی و تەنانەت ئەقڵانیەتی ڕەخنەگرانەی (کانت) دا کـرد. ئەوان ڕەتیانکـردەوە، چونکە پێیانوابوو گوزارشت لە ئایدیۆلۆژیای جیهانی سەرمایەداری دەکات. بەهەمان جۆر مامەڵەیان لەگەڵ دەوڵەتدا کرد و بە ئامرازێکی خزمەتکەری چینی بۆرژوایان دانا، کەچی ئیمڕۆ توند دەستی پێوە دەگرن و باسی غافڵکوژیی دەکەن، ئەمەش پاش ئەوەی کەوتونەتە بەر ڕەخنە و پێداچوونەوە، لەپێناو سەرلەنوێ پێکهێنان و بنیاتنانەوە، لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانکاری و هەرەسهێنان و تێکشکانەکاندا. نەک هەر ئەمە، بەڵکو ئەوانەی ئاڵای مۆدێرنیتەی فیکرییان بەرزدەکردەوە و شانازییان بە پیادەکردنی کولتووری ڕەخنەگرتنەوە دەکرد، لە ڕەخنە دەترسان کە یەکێکە لە بنچینەکانی مۆدێرنیتە.

بەو جۆرە زۆربەی بیریار و ڕەخنەگرانی ئەدەب، وەک یاسازانی کەللەڕەق ڕەفتاریان لەگەڵ ناونیشانەکانی عەرەبایەتی و مۆدێرنیتە دەکرد، وەک ئەو زاتانە سەیریاندەکردن کە شایانی مشتومڕ و پێداچوونەوەی ڕەخنەگرانە نین، ئەوەی فەندەمەنتالیستەکانی چەپ و تاڵەبانییەکانی ناسیونالیزم و بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان کردیان... ئەمەش ئەو کاتە پاڵی بە هەندێکەوە نـا، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو کـارە ڕەخنەگریانەی ئامانجیان دەرچوون بـوو لە پەراوێزبوون و ڕابوون بـوو لە دۆخی دەستەوسان و سڕبوون، داوای ڕێگرتن لەو ئیجتیهادانە بکەن کە زیان بە نەتەوە دەگەیەنن.

کەچی ئێستا، پاش زیاتر لە دە ساڵ، دەگەڕێنەوە بۆ پیادەکردنی ڕەخنە و دان بەوەدا دەنێن، ئەو دەوڵەتە ڕزگاریخوازەی دەیانپەرست، ئازادییەکانی بیکردنەوەی سەرکوتکرد، ئەو ئایدیۆلۆژیا ناسیونالیست و چەپڕەوەی ئەوان دەستگیرۆی بوون، بەشداریکرد لـە وێرانکردنی پڕۆژەی ڕێنسانسخوازی عەرەبـدا. لەوەوبەر لەگەڵ ڕەخنەگرتن بوون لەویتر، کـە ئیمپریالیزم و جیهانگیری و بەئەمریکاییکردن بوو، کەچی ئێستا لەگەڵ ڕەخنە لەخۆ گرتن و گۆڕینی ناو و ناونیشانەکاندان.

ئەم گۆڕانە بەرهەمی ئەو ڕەخنەیەوەیە کە ڕەتیاندەکردەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی پێی بزانن تیخیکردن، بۆ ئەوەی لە سڕبوونی ئایدیۆلۆژیانە ڕزگاریان بکات و چەندین ئاسۆی بەپیت بۆ بیرکردنەوە لەبەردەمیاندا بکاتەوە. کەچی ئەوان دان بەوەدا نانێن، لەو

کاتەدا نەبێت کە مەسەلەکە پەیوەندیی بە سەرچاوەکانیانەوە دەبێت لای (مارکس) و (لێنین) و ئەوانیتر، یان لای نەیارەکانیان لە گۆڕەپانی خۆرئاوادا.

ئەمەش باری زۆرێکە. واتە پیادەکردنی ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی چەمکەکانی دەستەبژێر، پێشکەوتن، مۆدێرنیتە و پیرۆزی دەکرا. ئەمە وێڕای ئەوانەی کتێبەکانی خەڵکی تر دەخەنە بەردەمی خۆیان و گەلێک جار کتومت دەستەواژە و دارشتنە فیکرییەکانیان دەربارەی ژیوار، کولتووری گۆڕاو، بنچینەی کولتووریی تێکشکانی ژیواری، خەوشیی خۆیی ئەقڵی عەرەبی و چارەنووسە بێدەرەتانەکانی پرۆژە ڕێنسانسخوازەکان دەخوازن، هەتاکو بیانکەنە هی خۆیان و ئەوانیتر. هەروەها ئەو ڕووناکبیرە ئۆرگانیکانەی پێیانوابوو یەکەمین ئەرکی بیریار ئەوەیە خاوەن پرۆژەیەک بێت بۆ گۆڕانکاری، بۆیە ڕەخنەیان لەوە دەگرت کە دەبوت یەکەمین ئەرکی سەرشانی ئەوەیە لە کایەی کاری خۆیدا بەرهەمهێن و داهێنەر بێت، لەپێناو نوێکردنەوەی بنەچەکانی ماناکان و ژیانی بیرۆکەکان، یان تۆڕی چەمکەکان و سیستەمەکانی بەهادا. کەچی ئیمڕۆ ئەوانە پیادەی هەمان شت دەکەن و بە نوێی خۆیانی دادەنێن، یان دەیگێڕنەوە بۆ فەیلەسووفەکانی خۆرئاوا، هەتاکو دان بەو دەستکەوتەدا نەنرێت کە لەسەر دەستی عەرەبەکانی تر هاتۆتەدی.

## دەردی نەزانی:

دەردەی نەزانی، لە ڕووی ئاکام و سەرەنجامە نێگەتیڤەکانیەوە، خراپترین دەردە. چونکە زۆرجار مرۆڤ بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئاشنایە بەواقیع، لەکاتێکدا نەزانە بەرامبەری. ئەمەش ئەوەیە کە ئێستا قەیرانی دارایی دەریدەخات: دەستەوسان لەئاست چاوەڕوانکردنی قەیرانەکاندا، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە هەرەسهێنانە داراییەکان یان کارەساتە ژینگەییەکانەوە هەبێت، لەکاتێکدا عەمبارەیێکی تیـۆر و پرۆگـرام و کۆمپیوتەرەکان لەبەردەستدایە و ژمارەیەکی زۆر زانا و پسپۆڕ لەئارادان.

سەرچاوەی دەستەوسانەکەش، ئەو بزاوتە گەورە و خێرایەیە کە جیهان بەهۆیەوە دەگۆڕێت و سروشتی شاراوەیی و سەختیی لە بەری کێشە و قەیرانەکان دادەماڵێت. لەوانەیە دەستەوسانەکە بگەڕێتەوە بۆ پشتبەستنی تەواوەتی بە زانیارییەکان و سیستەمە بێهاوتاکانیان، کە ڕەچاوی باروودۆخی بکەری مرۆیی ناکات، ئەو بکەرەی بونەوەرێکە هەڵوێست و هەستوسۆزەکان، یان هەوەسەکان، یاخود ئارەزووەکانی خۆی هەیە. بەوجۆرە، وەک (ڕۆجیە پۆل دروا) دەیبینێ، پێدەچێت ئەقڵانییەت لەوە سەختتربێت کە تێیبگەین. ئەمەش سەیرنییە، چونکە ئاکامی مامەڵەکردنە

لەگەڵ مرۆڤ وەک کەرەستە و کۆمپیتەرەکان: دەستەوسان لەئاست خەملاندن یان تێگەیشتن و تەگبیرکردندا.

خراپترینی دەردەکان، نەزانییە بەرامبەر بە دەروونی مرڤانەی هەڵقوڵاو لە ناوەندێتیی مرۆڤەوە، کە وای لە مرۆڤ گەیاندوە سەرگەورەی سروشت و خاوەنی ئەو موڵکەیە چۆن بیەوێت و بەبێ لێپرسینەوە دەتوانێ ڕەفتاری لەگەڵ بکات. سەرەنجامیش ئەو هەموو بەبیابانبوون و بەفیرۆدان و ژینگەپیسیەیە کە هاتۆتەئاراوە.

بەو جۆرە هێشتا بە مرۆڤی باڵاڕەو نەگەیشتوین، ئەوەی بانگەشەی بەدەستهێنانی خەسڵەتەکەی دەکەین. چونکە مرۆڤ لەکۆتاییدا تەنیا یەکێکە لە بوونەوەرەکانی ئەو سروشتە، کە ئەنجامی دەستکردن بە کار و دروستکردن و هەنگاونان لە ڕیشەکێشکردنێکی ژینگەییەوە بۆ یەکێکی تر دەستیکردوە بە وێرانکردنی، وەک ئەوەی بەهۆی ژێریی وێرانکەرانەیەوە ڕیزپەڕێکی ناو سروشت بێت، وەک ژیانزانان ڕەچاویانکردوە.

لێرەوە پێویستە مەیلەکانی بەخوابوون خاوبکەینـەوە و نەرجسیبوونی من تێکبشکێنین، لەپێناو بنیاتنانی جیهانێکی نوێدا کە تیایدا سروشت ئازاددەکرێت و ئاژەڵەکان ڕزگاردەکرێن.

### دەردی کەمتەرخەمی:

ڕووەکە تری دەردی لەدەستچوون، دەردی کەمتەرخەمییە، کە وادەکات یەکێک لە ڕووبەڕووبوونەوەی خۆی، بەهۆی لێپرسینەوەی ئەقڵی و پێداچوونەوەی ڕەخنەگرانەوە، هەڵبێت و بەرپرسیارێتی بخاتە ئەستۆی ئەوانیتر.

ئەمە ئەوەیە کە هەرسێ جۆری ڕووناکبیران (ئیسلامی و ناسیونالیست و چەپڕەو) بەجۆرێکی تایبەتی دەیکەن. ئەوانە کارەساتەکانی کۆمەڵگە عەرەبییەکان دەگێڕنەوە بۆ هەڵمەتی داگیرکاریی کولتووریی خۆرئاوا، یان بۆ ئیمپریالیزم و جیهانگیری و بەئەمریکاییکردن، وەک ئەوەی لە هەڵوێستەکانی دوێنێ و ئیمڕۆیاندا بەرامبەر بە ڕووداو و پێشهاتەکان دەردەکەوێت. ئەم خۆدزینەوەیە لە گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی چەند ڕەگێکی خورافەکاریانەی هەیە، کە وا لـە یەکێک دەکـەن هەڵەکانی خۆی بەگشتی فرێداتە سەر شانی شەیتان، وەک چۆن ئێستا بەجۆرێکی تایبەتی هەڵەکانی دەخاتە ئەستۆی ئەمریکییەکان. بۆیە سەیرنییە دوژمنەکانی ئەمریکا شەیتان و ئەمریکا پێکەوە کۆبکەنەوە.

بۆیە ئیمڕۆ دەیانبینی دڵخۆشن یان شادمانن بەو قەیرانەی پەی بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و جیهـان بـردوە، هەمان ئەو شـتەی کاتی ڕووداوەکانی

سێپتەمبەری ٢٠٠١ کردیان. هەروەها ئاسوودەن بەو هەرەسهێنانەی لە سیستەمی دارایی و جیهانی سەرمایەداری و سەرجەم سیستەمی جیهانیدا ڕوویداوە، چونکە ئەوە بەرپرسیارێتی و ڕەخنە و لێپرسینەوەیان لەکۆڵدەکاتەوە، بەئەندازەی ئەوەی پاساوەکانی بەرگریکردن لە خراپترین سیستەمە سیاسییەکان یان سیستەمە سەرمایەدارییەکانیان پێدەبەخشێت، ئەو سیستەمانەی لەژێر ئاڵای سۆشیالیزم و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ڕزگاریی نیشتمانیدا بەرهەمهێنران..

دوێنێش بەرەنگاری (فۆکۆیاما) بوونەوە، کە بەهۆی چەمکەکەیەوە دەربارەی «کۆتایی مێژوو» پاشکەوتوویی و دەستەوسانیی ئەوانی ئاشکراکرد، ئەوەی کردیان کاردانەوەیەک بوو یەکسان نەبوو بە خودی کارەکە. ئەوان لە مانای «کۆتایی» تێنەگەیشتبوون، کە مانای پەڕینەوە و گوێزانەوەیە لە جیهانێکەوە بۆ یەکێکی تر، یان لە سوڕێکەوە بۆ یەکێکی تر، یاخود لە وێنەیەکەوە بۆ یەکێکی تر... لەکاتێکدا ئەوان تەمەنی تێکۆشانی خۆیان بە ناز و فیزەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکاریی مێژوویی تەرخانکردبوو.

لەوانەیە (فۆکۆیاما) لە داهاتووناسیدا بەهەڵەداچوووبێت، کاتێک پێیوابوو سەرکەوتن بۆ لیبرالیزم و دیموکراسی و ئابووریی بازاڕە... بەڵام ئەو یەکەمین کەس بوو پاش دە ساڵ پێداچوونەوەی بۆ چەمکەکەی خۆی کرد و پەنجەی خستە سەر ئیشکالیەتێکی گەورە: هێشتا مرۆڤ، بە گشت نموونە مرۆڤایەتی و شێوازە کولتوورییەکانیەوە، دەستەوسانە لەئاست ئەندازەیەکی کۆمەڵایەتیی وەهادا، کە بتوانێت بڕێک لە بەڵێنەکانی هەزارەی سێیەم لە ڕێگەی دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئاشتی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانییەوە بهێنێتەدی... پێش تەقینەوەی قەیرانەکەی ئەم دواییەش، هەڵوێستی بەرامبەر بەدەوڵەت هەبوو: پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەی ئەنجامدا و بەرگریی لە هێز و پێویستیی دەوڵەت کرد، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی دەوڵەت بەرامبەر بە کۆمەڵگەی ئەهلی لاواز یان فشۆڵە.

ئەمەش ئەوەیە کە ئێستا (فۆکۆیاما) بۆ بەرەنگاربوونەوەی قەیرانەکە دەیکات: خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی ئەوەی پێشهاتووە، وەک لە وتارەکەیدا دەربارەی مارکەی ئەمریکی هاتوە. ڕەخنەگرتن هەڵگەڕانەوەی مرۆڤە لە خودی خۆی و پێداچوونەوەی بیرۆکەکانیەتی. ئەمەش مانای ئەوەیە ناڕەوایە (فۆکۆیاما) بەو ڕووناکبیرانە بەراوردبکەین کە ڕەخنەیان لێ گرتووە، چونکە هەمان بوێریی ڕەخنەگرانەی ئەویان نییە و لە ڕووی مەعریفی و فیکریشەوە لەئاستی ئەودا نین.

بەوجۆرە قەیرانەکە مانای تێکشکانی (فۆکۆیاما) نییە، کە بەردەوامبووە لەسەر

پیادەکردنی سەربەخۆیی و زیندوێتیی فیکریی خۆی، بەڵکو ئەو ڕووناکبیرانەی ڕیسواکرد کە کارەساتەکانی خۆیان دەخەنە ئەستۆی ئەوانیتر، یان شکستهێنانی ئەوانیتر بە سەرکەوتنی خۆیان دادەنێن، یان چەپڵە بۆ هەرەسهێنانەکان لێدەدەن بۆ پەردەپۆشکردنی پەککەوتەیی خۆیان، یاخود بەهەڵەکانی ئەوانیتر پاساو بۆ هەڵەکانی خۆیان دەهێننەوە.

ئەمە خوی ئەوانە. ئەوان کێشەکان بە چارەسەر دەزانن و تەنیا باشن بۆ پەردەپۆشکردنی هەڵە و خەوشییەکان، هەتاکو دواتر بەدووقات کاری خۆیان بکەن. ئەمەش ئاکامی پرۆژە و دروشمەکان دەیخاتەڕوو، چونکە دیموکراسی گۆڕا بۆ چەند ڕژێمێکی دیکتاتۆریانە، سۆشیالیزم گۆڕا بۆ هەژاری و بەربەرییەت، کۆمار گۆڕا بۆ چەند ڕژێمێکی پاشایەتی، بەڵام بەجۆرە خراپەکەی.

ئەگەر سپیکردنەوەی سامانەکان یەکێک بێت لە هۆکانی قەیرانی ئابووری، ئەوا گەورەترین پەککەوتەیی لای ئێمە «سپیکردنەوەی هەڵەکانە»، ئەمە ئەگەر بمانەوێت ئەوە لە (تۆلریش بک)ی کۆمەڵناس بخوازین.

### چەند ژینگەیەکی کولتووری:

سەرەنجامی ئەم دەستنیشانکردنەی قەیرانی جیهانی، کە ئاوێتەیە بە سەرە هەمەڕەنگە ئاسایشخواز و ژینگەیی و خۆراکییەکانی، ئەوەیە کە ناکرێت بە ئەقڵییەت و چەمک، یان بەها و پێوانە، یاخود پلان و ستراتیژە باوەکان جیهان بەڕێوەببرێت و ژیان دروستبکرێت، یان سەرکردایەتیی چارەنووسەکان بکرێت. جا ئەگەر جیهان بە سیستەم و بەهاو نەخشەکەیەوە گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەوا بێگومان بیرۆکەکانیش دەگۆڕێن، سیاسەتی فیکر و ستراتیژییەتی بیریارەکانیش بۆ دەستوەردان و نێوانکاری بەجۆرێکی تایبەتی گۆڕانیان بەسەردا دێت.

لێرەوە، ئێستا مەسەلەکە پەیوەندیی بە کۆتایی یان گەڕانەوەی مێژووەوە نییە، پەیوەندیی بە شەبەنگەکانی (مارکس) و کۆتاییەکانی (فۆکۆیاما)وە یان لۆژیکی هەڵمەتی داگیرکاری و پاراستنی نەگۆڕەکانەوە نییە. مەسەلەکە ئەوەیە کە لۆژیکی بیرکردنەوە بە زمانی دژایەتیکردن و ئەقڵییەتی سەربازگەکان تێکبشکێنین و خۆمان لەو حەتمیبوونە بڕندە، دوانە خنکێنەر و بەتارماییکردنە ئایدیۆلۆژیانە ڕزگاربکەین کە قەیرانەکەیان دروستکردوە، لەپێناو هەڵهێنجانی چەند تێڕوانینێکی جیاواز و داهێنانی کەرەستەیەکی چەمکخوازی نوێ، کە ڕاستبێژتر و لێهاتووتر بێت بۆ توخنکەوتن و چارەسەرکردن و بەشداریدەکەن لە سەرلەنوێ دارشتن و پێکهێنانەوەی مەرجەعەکانی

مانا و شێوازەکانی ڕەوایەتی. لێرەوە، ئەوەی ئێستا مرۆڤایەتی، لەناو ئەو هەموو خەوشی و مەترسی و کارەساتانەدا، پێویستی پێیەتی، گۆڕانکارییەکی دوو جەمسەری و ئاوێتەیە، کە پەی بە چوارچێوەکانی تێڕوانین و مۆدێلەکانی کارکردن ببات، هەروەها پەی بە فۆڕمەکانی ئەقڵانیکردن و ڕێگاکانی مەعریفە بەرێت، ئەمەش بەشێوەیەک کە لەگەڵیدا سیستەمەکانی بەهاکان و ڕێساکانی تاوتوێکردن یان مامەڵەکردن نوێببنەوە.

لەکۆتاییدا، ئایا خۆم هەمان هەڵەی ئەوانیتر دەکەم کە ڕەخنەیان لێ دەگرم، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی گشتی یان هەمەلایەنگیر دەکەومە ناو کاری تیۆریزەکردنەوە؟ ئەمە بەهەڵەتێگەیشتنە گەورەکەیە. لە هەر هەوڵدانێکدا بۆ بیرکردنەوە و تێگەیشتن: بیرۆکە و چەمک و گوتارەکان، هێندەی پڕن لە بەهەڵەداچوون و پارادۆکس، ئەوەندەش پڕن لە پێچوپەنا و پەردەپۆشکردن... لێرەوە ئەوەی یەکێکمان دەریدەبڕێت، چەند حەقیقەتێکی ڕەها یان کۆتایی نین، بەڵکو چەند بیرۆکەیەکن بۆ تاوتوێکردن و گرنگی لەوەوە بەدەستدێنن کە هانی لێپێچینەوە و گفتوگۆکردن دەدەن، یان دەرگا و ئاسۆکان دەکەنەوە بۆ هەڵهێنجانی چەند توانستێکی نوێ بۆ بیرکردنەوە و خەملاندن یان تەگبیر و بەڕێوەبردن، بەشێوەیەک کە ڕۆشنایی بخرێتە سەر هەڵە و خەوشییەکان، یان بەشداریبکەن لە توێکاریی دەردەکان و هەڵوەشاندنەوەی کێشەکاندا.. بەڵام ئەو چارەسەرانەی تایبەتن بە کۆمەڵگەیەک یان سەرجەم جیهان، ئەوە بەرهەمی کۆششەکانی هەموو ئەوانەیە کە بەم یان بەو شێوەیە پەیوەندیی پێیانەوە هەیە، یان کاریان تێ دەکات.

کاتی ئەوە هاتووە، ئێمەی سەرقاڵ بە دروستکردنی بیرۆکەکان یان بەرهەمهێنانی زانست و زانینەکان، لە ڕووی پەیوەندیمان بە پیشەکە و پێگە و ڕۆڵمان لە دروستکردنی ژیان و بنیاتنانی کۆمەڵگەدا گۆڕانمان بەسەردابێت. چونکە ئەگەر بمانەوێ بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ و کاریگەر یان هەنوکەیی بەشداریبکەین لە دروستکردنی ڕووداوەکاندا، ئەوا ناچارین گۆڕانکارییەک بهێنینەئاراوە کە پەی بە بیرۆکەکان و شێوازی بیرکردنەوە و ڕۆڵی بیریاران ببات. سەرەتای ئەوەش پیادەکردنی بێفیزییە، یەکەم بە دەستهەڵگرتن لە بەخشینی خەسڵەتەکانی خواوەندی و بلیمەتی بەیەکتری و وازهێنان لەو وەهم دروستکردن و بەتارماییکردنانەی وامان لێ دەکەن سەدەیەک، کایەیەک، بزووتنەوەیەک، یان شۆڕشێک بگێڕینەوە بۆ ئەدیبێک، یان زانایاک، یاخود فەیلەسووفێک.

دووەم دەستهەڵگرتن لە بانگەشەکانی دڵنیابوون و بەدەستەوەگرتن و کۆنترۆڵکردنی ڕەوتی مێژوو و ڕێڕەوی جیهان، لەبەرئەوەی هیچ کەسێک ناتوانێت، بەشێوەیەکی

وردبینانە و هاوجووت، یاساکان و مەرجەکانی گەشەکردن یان بزووتنەوەی مێژوو و ئاقارەکانی داهاتوو دیاریبکات، یان وێنابکات، یاخود پێشبینی بکات. چونکە ئەو رووداو و راستیانەی پێشدێن یان دەیانخولقێنین، بەردەوام تێماندەپەڕێنن، بۆ ئەوەی حساب و نەخشە ئەقلییەکانمان یان سیستەمەکانی مەعریفەمان تێکبدەن. کەچی خاوەن حەتمییەتە مێژووییەکان و ئەوانەی دەڵێن چەمکەکانی (مارکس) لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەتوانن قەیرانی دارایی ئێستا شرۆڤەبکەن، یان دەڵێن قەیرانەکە راستیی تیۆری مارکسیزم دەسەلمێنێ، ئەوا نوقڵانەلێدەدەن، وەک ئەو جادووگەرانەی پێیانوایە قورئان پێشوەخت هەموو ئەو تیۆرانەی لەخۆگرتووە کە زاناکان بە عەقڵ و تاقیکردنەوەکانی خۆیان پێیگەیشتوون. لێرەوە پێداچوونەوەی بەردەوام پێویستە، بۆ سەرلەنوێ بنیاتنان و پێکهێنان، یان داڕشتن و دروستکردن.

سێیەم بڕوا بەوە بهێنین کە پرۆسەی گۆڕینی کۆمەڵگەکان و جیهان، جا ناونیشان و دروشمەکە هەرچییەک بێت، چارەنووسێکی هاوبەشە، هەر بکەرێک لەئاست و پێگە و بازنەی کارەکەیەوە و بەهۆی بیر و کردار، مەعریفە و شارەزاییی، یان دەستپێشکەری و پێشنیاری خۆیەوە بەشداریی تێدا دەکات. بەوپێیەی مرۆڤ بەپلەی یەکەم بکەرێکی فیکرییە، جا دەرکەوتن و کەرتەکان، یان پیشە و کار و پیشەسازییەکان هەرچییەک بن.

## شۆڕشەکان
## ڕۆڵەکانیان دەخۆن و دوژمنەکانیان لەناودەبەن (١)

### تیرۆر:

شۆڕش ناونیشانێکی نوێیە لە کۆششکردنی مرۆڤ و داخوازییە بوونخوازەکانیدا. زۆربەی ڕۆڵەکانی نەوەکەمان لە تافی لاویدا شـۆڕشـگێڕی خاوەن خەون بوون. سەرەنجامەکەش، پاش گیرۆدەیی و پێوەنالاندن، وردوخاشبوونی دروشمەکان بوو لەسـەر دەسـتی هەڵگرەکانیان، یان هەڵگەڕانەوەی بیرۆکەکان بـوو دژی ئەوانەی خستبوویاننەڕوو.

ئەگەر بمانەوێ بەچاوی ڕەخنە و زمانی تێگەیشتن بڕوانینە دیاردەکە، دەبینین دیارترین شتێک کە ئەو شۆڕشانە جیادەکاتەوە، سروشتی وێرانکارییە نەک بنیاتنان، چونکە بەدەگمەن سەرکردە و پاڵەوانەکانی لە کارەکانی ڕیفۆرم و بنیاتناندا سەرکەوتوودەبن، بەڵکو ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ (هیگڵ)ی فەیلەسووفی ئەڵمانی، ئەوا شۆڕش خاوەن سروشتێکی تیرۆریستانەیە.

ئەمەش نموونە مێژووییەکان دووپاتیانکردۆتەوە، لە شۆڕشی فەڕەنساوە بیگرە، کە (هیگڵ) بیری لێ دەکردەوە و تیـرۆری کـردە ناونیشانەکەی، هەتاکو شۆڕشە بەناوبانگەکانی سەدەی بیستەم، وەک شۆڕشی ڕوسی و چینی و کوبی... یان ئەو شۆڕش و کودەتایانەی بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی ئەنجامیاندان. چونکە شۆڕش بڕوای هەڵبژاردەخواز و مەیلی فاشیانە لەگەڵ فیکری تاکڕەهەند و لۆژیکی دوورخستنەوەخوازی و ڕەفتاری تیرۆریستانە پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئەمە وێڕای تاکپەرستی، کە وامان لێ دەکات بەبەزەیی بین بەرامبەر بە بتپەرستیی لە جاهلییەدا، چونکە توندوتیژی و کاریگەریی لەسـەر ژیانی خەڵـک و چارەنووسـی کۆمەڵگەکان کەمتـریـوو.

بۆیـە شـۆڕشـەکان، بەتـاوانـی خیانەتکردن و بەکرێگیراویـوون، کاردەکـەن بـۆ ڕیشەکێشکردنی نەیارەکانی خۆیان. لەهەمان کاتیشدا ئەوانە دەکەنە قوربانی کە

لە ڕیزەکانیدا کاردەکەن و لە پشت سەرکردەکانییەوە دەجەنگن، بەئەندازەی ئەوەی دەیانکەنە ئامرازەکانی بەجێگەیاندنی ستراتیژە وێرانکارییەکانی خۆی. بەوجۆرە شۆڕش لە هەردوو بارەکەدا خەڵک بەرەو مردن ڕاپێچدەکات. ئەوەی لەگەڵیدا بووە و دروشمەکانی پیرۆزکردۆتەوە و لەپێناو سەرکردەکەیدا قوربانیداوە بۆتە قوربانیی شۆڕش، ئەوەش کە دژی ڕاوەستاوە ڕیشەکێشکراوە یان لەناوبراوە.

## ویلایەتی فەقیهە دژی کۆمار:

ئەمە باری شۆڕشی ئێرانە، چونکە ئەوەی بەدرێژایی سی ساڵی ڕابردوو زاڵبوو بەسەر عەقڵی سەرکردەکانیدا، خەمی پاراستنی ویلایەت و دەسەڵات بوو، زیاتر لە حەقیقــەت و دادپەروەری. ئەوەی ئەوان تیایـدا سەرکەوتووبوون، لەقاڵبدان و دەستەمۆکردن و جۆشدان و بەسەربازکردنی کۆمەڵگە بوو، بۆ کردنی خەڵک بە شەهید یان قوربانییەکانی بانگەشە مەحاڵەکان، یان ئەو ستراتیژانەی بەقازانج بۆ میللەت و بەندەکان ناگەڕێنەوە. ئەمە وای لێ کردن بەپلەی یەکەم بایەخبدەن بە لەناوبردنی نەیارەکانیان لەناوەوە و دوژمنەکانیان لە دەرەوە. ئەمەش لۆژیک و یاسای شۆڕشە و لەپشت دروشـمەکانی ئـازادی و دادپەروەری و یەکسـانیەوە: خوڵقاندنی دوژمنەکان لە دەرەوە و ناوەوە و کارکردن بۆ دەرپەڕاندن، یان ناوزڕاندن، یاخود بەگژاچوونەوە و ڕیشەکێشکردنیان.

بێگومان ئەوەی ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران ڕوویدا، شۆڕشێکی ڕاستەقینە بوو، نەک تەنیا کودەتایەک کە دەستەبژێرێکی سەربازی پێی هەڵدەستێ، وەک ئەوەی لە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکاندا هاتەئاراوە، چونکە ئەوەی ڕوویدا گوزارشتی لە بزاوتێکی میللی کرد، کە بە گەردەلولێکی مرۆڤانە دەچوو و ڕژێمی حوکمڕانیی شایانەی ڕووخاند، بۆ ئەوەی سیستەمێکی نوێی خاوەن مەرجەعیەتێکی لاهوتیی فیقهی دامەزرێنێ.

ئەم شۆڕشە، کە زیندوێتییەکی کۆمەڵگەیی بێهاوتای بەرجەستەکرد، ڕووی نەدەدا ئەگەر شۆڕشێکی ڕووناکبیری و فیکری لەئارادانەبوایە، کە بەدرێژایی زیاتر لە بیست ساڵ سوپایەکی بڕوامەندی چەکدار بە چەندین دروشم و ڕاچێتەی سیحری و تەوباوی لەپشتییەوە نەبوایە، ئەو سوپایەی پێکهاتبوو لە پیاوانی ئایینی و ئەو ڕووناکبیرە نوێخواز و عەلمانیانەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕژێمی پێشوو هاوپەیمانیان بوون.

بەوجۆرە ئەوانە سەرکەوتووبوون لە جۆشدانی شەپۆلانێکی مرۆیی بێوێنەدا بۆ ڕووخاندنی شا و سەرکەوتنەکەشیان بەمانا نێگەتیڤەکەی بوو، واتە ڕووخاندنی ڕژێمی ستەمکار، بەڵام بەمانا پۆزەتیڤەکەی سەرکەوتوونەبوو، چونکە ناوەڕۆکی سەلەفیانەی

رابردووخواز زاڵبوو بەسەر ڕەهەندی ڕۆشنگەر و داهاتووخوازدا، بەئەندازەی زاڵبوونی ئەقڵییەتی دوورخستنەوە و دەرپەڕاندن بەسەر زمانی دانپیانان و شەریکایەتی و ئاڵوگۆڕکردندا.

لێرەوە سەرکردەکانی ڕژێمی نوێ، لە کاتی دەسەڵاتگرتنەدەستەوە، بەپێی فەرمایشەکانی ڕێبەرکاریانکردوە بۆ دەرپەڕاندنی نەیارەکانیان، بەجێگری ڕێبەریشەوە کە دەرکی بەوە کردبوو چۆن شۆڕش لە ئامانجەکانی هەڵگەڕاوەتەوە و دروشمەکانی پێشێلدەکرێن. هەروەها بەشێوەیەکی تایبەتی کاریانکردوە بۆ ڕەتکردنەوە، یان ڕیشەکێشکردنی فراکسیۆنە چەپڕەو و عەلمانیەکان. بەوجۆرەش سیستەمێکی لاهوتیان لە ژێر دروشمی ویلایەتی فەقیهدا دامەزراند، کە ڕەوایەتییەکی باڵای هەیە و کاتێک دەبێتە پیرۆز یان ڕەها، دەگۆڕێت بۆ ستەمکاریی دووقاتی سیاسی و برواخوازی، یان مادی و سمبولی.

## کولتوورێکی دژ بە پەرەپێدان:

نکۆڵی لەوە ناکرێت شۆڕش سیستەمێکی حوکمڕانیی پیادەکرد، کە مەرجەعیەتی فیقهی و میکانیزمی دیموکراتی، ویلایەتی فەقیهە و یاساکانی کۆمار، ئەنجومەنی پسپۆڕان و ئەنجومەنی شۆڕش، حەوزەی ئایینی و زانکۆی نوێی پێکەوە کۆدەکردەوە. ئەم سیستەمە لەسەرەتادا دەرفەتی بەڕێوەبردنی دابەشبوون و ململانێکانی نێوان هێز و دەسەڵات و مەرجەعیەتە جۆربەجۆرەکانی (ڕێبەر، سەرۆک، پەرلەمان و پاسداران) بۆ ڕەخساندن. بەئەندازەی دەرفەتڕەخساندن بۆ میللەتی ئێران، هەتاکو لە ڕێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە، یان لە ڕێگەی بزووتنەوە و گرتبوونەوە سیاسییەکانی شەقام و گۆڕەپانە گشتییەکانەوە زیندوێتیی سیاسیی خۆیان پراکتیزەبکەن. کەچی بنەڕەتی لاهوتی پشتگیریکرا و لەلایەن سوپای پاسدارانەوە کاریکرد بۆ قوتدانی سیستەمی دیموکراسی، چونکە دیموکراسی تەنیا ژمارەکان یان وەرزی هەڵبژاردن نییە، بەڵکو کولتوور و ئەقڵییەت و شێوازێکی بوونە، کە لانی کەم پێویستی بە داننانە بەویتری جیاواز و نەیاردا.

بەوجۆرە ئەقڵییەتی شۆڕشگێڕی، کەسپەرستی، ویستی بەدەستەوەگرتن و کۆنترۆڵکردن، هەوڵدان بۆ قۆرخکردنی ڕەوایەتیی باڵا، بەهۆی بەرزکردنەوەی شمشێری حەرامکردن و بەکافرکردنەوە، بوونە هۆی پێکهێنانی کولتوورێکی دژ بە دیموکراسی و سیاسەت. ئەم کولتورە دژە لەگەڵ هەڵبژاردنی دکتۆر (محەمەد خاتەمی)دا بۆ سەرۆکایەتی بە زۆرینەیەکی میللیی گەورە کەوتەگەڕ. چونکە ئەو دەستبەستراو و

دەستەوسان بوو لەئاست بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی خۆیدا وەک سەرۆک کۆمار، چونکە بڕیارەکە لای هەڵبژێر نەبوو، بەڵکو لای ڕێبەر، سوپای پاسداران، دادگا، ئەنجومەنی پسپۆڕان و دامەزراوەی دەستنیشانکردن بوو. ئەمەش سەیرنییە، چونکە لە سیستەمێکدا کە ڕەوایەتیی لە دەقی پیرۆز یان ئیمامی بەدەر لە هەڵەکردن بەدەستدێنێت، نە ئازادیی تاک بوونی هەیە، نە سەربەخۆیی و بەها، لەبەرئەوەی دروشم، فەتوا، ڕژێم، جەنگ، قوربانیدان و سەرکەوتن لەپێش خەڵک و کۆمەڵگە و ژیانەوەن.

## مارکەی خوێن و حیجاب:

ئەمە لەسەر ئاستی سیاسەت، بەڵام لەسەر ئاستی پەرەپێدان، ئەوا بارەکە باشتر نەبوو. لێرەوە شۆڕش سەرکەوتوونەبوو لە بەڕێوەبردنی وڵات و بەگەڕخستنی توانستەکان بەشێوەیەک، کە بە پەرەسەندن و خێر بۆ ناوچە دوورەدەستەکان و توێژە پەراوێزخراوەکان و دنیاکانی خوارەوە بگەڕێتەوە. کۆمەڵگەی ئێران نەگۆڕا بۆ زیندوێتییەکی داهێنەرانە، ئەوەی ئەوە بەرهەمدێنێ کە خەڵک یان جیهان پێویستیانە و بەهۆیەوە بەشداریبکات لە دروستکردنی ژیواری جیهانیدا. مەبەست ئەوانەیە کە سنوورەکان دەبڕن، یان بەربەستەکانی زمان و کولتوورەکان تیخدەکەن، وەک بەرهەمهێنانی دەقێک، خستنەگەڕی بیرۆکەیەک، دانانی تیۆرێک، دۆزینەوەی شێوازێک، داهێنانی ئامرازێک، هێنانەئارای ئامێرێک، یان هەناردەکردنی مارکەیەکی سوودبەخش یان فریودەر... ئێران لە ڕابردوو و لە بوارێک زیاتردا داهێنانیکردوە، لە شیعرو تەلارسازیدا، وەک لە دروستکردنی فەلسەفە یان فەرشدا. کەچی ئیمڕۆ ئەوەی لە دیمەنەکەدا دەرکەوتووە، دۆزینەوەو داهێنان نییە، بەڵکو موشەک، حەشامات، خوتبەی ئاگرین، هەڵوێستی ووڕژێنەر، زمانی بەڵێن و هەڕەشە، هەناردەکردنی مارکەی حیجاب و خوێن و قوربانیدان... بەڵام لۆژیکی توندوتیژی و جەنگ لەم سەردەمەدا داهاتوویەک دروست ناکات، بەڵکو دەستکەوتەکان لەناودەبات، وەک ئەوەی لە ئێران ڕوودەدات، یان نموونەی سەرکەوتوو پیشاندەدات، وەک ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوویدا و (فرانسیس فۆکۆیاما) سیاسەتی سەرۆک (بوش)ی کوڕ و پلان و جەنگەکانی پێ هەڵسەنگاندوە.

## ئەقڵییەتی تۆڵەسەندنەوە:

ئەگەر شۆڕشەکان بەگشتی لە کاری ڕووخاندندا، وەک قۆناغی یەکەم و دەستپێکی کارەکانی بنیاتنان لە قۆناغی دواتردا، سەرکەوتووبووبن، وەک ئەوەی لە شۆڕشی فەرەنسیدا ڕوویدا و چەندین ئاسۆی نوێی بۆ ڕۆشنگەریی ئەقڵەکان و ڕزگارکردنی

جەستەکان لەبەردەم مرۆڤایەتیدا کردەوە، ئەوا سەخت و بەڵکو مەحاڵە ئەو کودەتا و شۆڕشانە سەرکەوتووبن کە پیاوانی ئایینی فەندەمەنتالیست بە ئەقڵییەتی تاکڕەهەند، هەڵبژاردەخواز و بەکافکەر سەرکردایەتیدەکەن.

ئەمە ئەوەیە کە فەندەمەنتالیزمی گەڕاوە دەیخاتەڕوو، چونکە پاش هەرەسهێنانی پرۆژەی ناسیونالیستی و شکستخواردنی پرۆژەی سۆشیالیستی کە لە بنەڕەتدا بە مردوێتی لەدایکببوو، پیاوانی ئایین وتیان: ئیسلام چارەسەر و ئەڵتەرناتیڤە. ئاکامیش پاش سی ساڵ تێکشکانی خێرا، هاتنەسەر کاری ئیسلامییەکان بوو. ئەمەش سەیرنییە، لەبەرئەوەی فەندەمەنتالیزم شەپۆلێکی هەڵگەڕانەوەخوازی گرێدراوی ڕابردووە. بۆیە تەنیا لە بەهەدەردانی کات و وزە و سامانەکاندا باش بووە، هەروەها ڕەقهەڵاتوە و بە لۆژیکی فەتوا و بەکافرکردن دژی لۆژیکی ڕەخنە و ڕۆشنگەری کاردەکات. سەرباری ئەوە داخراوە بەڕووی ڕووداو و جیهان و ئەویتردا. ئەمەش وای لێ دەکات سەرلەنوێ تایبەتمەندی بەهۆی هەژاری و بێدەرەتانی و ستەمکارییەوە بەرهەمبهێنێتەوە. لێرەوە، فەندەمەنتالیزم کە لەم وڵاتی عەرەبی یان ئەو وڵاتی ئیسلامیدا باوبوو، نەبووە مایەی هەستانەوە یان بەئاگاهاتنەوەیەک، بەڵکو پووکانەوە و هەڵگەڕانەوە بوو لە دەستکەوتەکانی سەردەمی ڕێنسانس و ڕیفۆرم و ڕزگاری.

ئەگەرچی شۆڕشی ئێران لەگەڵ شۆڕشەکانی تر جیاوازبوو، بەڵام لە دوائەنجامدا ڕیزپەڕنەبوو، بەڵکو لە ڕووی تێکشکانی پرۆسەکانی نوێکردنەوە و گەشەپێدانەوە، ڕێسای تایبەت بە مەسەلەکە دووپاتدەکاتەوە. ئەو شۆڕشە نەیتوانی نموونەی ژیواری و پەرەپێدانخواز، یان سیاسی و مەدەنیی خۆی بنیاتبنێ، واتە ئەو سەرکەوتنەی بەدەست نەهێنا کە وڵاتانی تر بەدەستیانهێنابوو. چونکە ئەو بایەخدان بە دەرەوەی زاڵکرد بەسەر بەرژەوەندییەکانی ناوخۆدا، بۆ هەڵهاتن لەو هەقدارییانەی پەیوەندییان بە پرۆژەکانی ڕیفۆرم و پەرەپێدانەوە هەیە. ئەوەی من ئێستا دەیڵێم، پاش ڕووداوەکانی دوای هەڵبژاردنی سەرۆک (ئەحمەدی نەژاد) بۆ جاری دووەم، دووبارەکردنەوەی هەندێک لەوانەیە کە لە نووسینەکانی پێشوودا (٢) و لە کات و دوای جەنگی تەمووزی ٢٠٠٦ دەرمبڕیون. چونکە ئێرانی فەندەمەنتالیزمی شۆڕشگێڕانە سەرکەوتووبوو لە سەرکوتکردنی ئەو ئازادیانەی بەڵێنی واڵاکردنیانی دابوو، یان دوای هەڵگیرسانی شۆڕش دەرگاکان بەڕوویاندا کرابۆوە، بەڵام سەرکەوتوونەبوو لە بنیاتنانی ئابوورییەکی کارادا. واتە دەرفەتێکی لەدەستدا و پەرەپێدانێکیشی دروست نەکرد. بەوەش ئەزموونەکە تێکشکا و کۆتاییهاتنەکانی بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی دووبارەکردەوە. ئەگەر وانەبوایە، ئەوا ملیۆنەها ئێرانی لە ژێر هێڵی هەژارییەوە

نەدەژیان، وەک ئامارەکان هێمای بۆ دەکەن. ئەوەتا شۆڕش نرخەکەی دەدات و مەسەلەکەن دژی هەڵدەگەڕێنەوە و واقیع بەشتێک، کە بە شۆڕش لەناو شۆڕش دەچێت، تۆڵەی لێ دەکاتەوە و ڕێبەر و سەرکردەکانیشی درەوشانەوە و ئامێزگرتنی (حصانە) خۆیان لەدەستدەدەن. ئەمە ئەوەیە کە ئێستا ڕوودەدات، بە بەڵگەی ئەوەی توێژێکی فراوانی میللەتی ئێران، بەتایبەتی ژنان و بەتایبەتیتریش لاوان، کە داهاتووی ئێرانن نەک ڕابردووی، بەهەمان شێوەی ڕوانینە شا بەر لە سی ساڵ سەیری دەسەڵاتبەدەستان دەکەن. بەو جۆرە شۆڕش جگە لە هەڵتەکاندنی ئەو پرنسیپانەی بیانوی دامەزراندنی بوون شتێکی تری نەکرد، بەئەندازەی ئەوەش شکستخواردوویوو لەئاست هێنانەئارای گۆڕانکارییەکی ژیواریی چۆنایەتی لە ژیانی میللەتی ئێراندا. ئەمەش چارەنووسی هەریەکێکە بانگەشەی ئەوە بکات یان پێیوابێت پرنسیپەکانی دەرەقەتی بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکاری و تەحەدداکان دێن: خۆی پرنسیپەکان پێشێلدەکات و دەگۆڕێت، بەڵام بەشێوەیەکی خراپ یان بێسوود.

## هەناردەکردنی بڕوا و شۆڕش:

بۆیە قەیرانەکەی ئێستا ناگەڕێتەوە بۆ کەسایەتیی سەرکردە یان ڕێبەر، چونکە ئەگەر (خومەینی) ش لە جێگەی (خامەنائی) بوایە، ئەوا مەسەلەکان بۆ ڕەوتی ڕیفۆرمخواز باشترنەدەبوو. بەپێچەوانەوە، لەوانەبوو خراپتربێت، چونکە (خومەینی) لە ڕووی پەیوەندییەوە بە پرنسیپەکانی شۆڕشەوە، لەوانەی دوای خۆی بەهێزتر و توندتر و توندوتیژتر بوو، بۆیە ڕوویکردە لەناوبردنی دوژمن و نەیارەکانی خۆی. ئەوەی بەزەییشی پیایدا هاتبێتەوە، دووچاری نیشتەجێبوونی زۆرەملێی کردوە، وەک ئەوەی بەسەر (شێخ مونتەزەری) هات، یان هەڵهاتنی بۆ ئاسانکردوە، وەک ئەوەی بەسەر (بەنی سەدر)ی سەرۆکی پێشووتردا هات، لەبەرئەوەی (بەنی سەدر) لە تاراوگە و ماڵەکەی خۆی لە پاریس پێشوازیی لێ کرد، هەتاکو سەرکردایەتیی شۆڕش بکات.

بەوجۆرە شۆڕش، پاش سی ساڵ، دروشمەکانی سوان و بەپێچەوانەکانیان گۆڕان. بۆیە چیتر میللەتی ئێران شتێک لەو شتانەدا بەدیناکەن کە دەردەبڕێن و داکۆکی لە شتێک ناکەن کە سوودیان پێ ناگەیەنێت، جا ئەوەی پەیوەندیی بە بەرنامە ئەتۆمییەکەوە هەبێت، یان ڕۆڵی هەرێمایەتی، یان دروشمی ڕزگاریخوازی، یاخود هێرشکردنە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەوەی ئێران پێویستی پێیەتی، هەناردەکردنی بڕوا و شۆڕش یان پیتاندنی ئەتۆمی نییە، بەڵکو داماڵینی عەبای فەندەمەنتالیزم و ڕزگاربوونە لە وەهمە

هەڵبژاردەخوازییەکانی، بۆ هەنگاونان بەرەو بنیاتنانی هێزی نەرم و ژیر، وەک ئەوەی لە داهێنانی کایەکانی ئەدەب و هونەر و لقەکانی زانیندا دەردەکەوێت، یان داهێنانی نموونەیەکی کارای پەرەپێدان، یاخود دۆزینەوەی چەند شێوازێکی بەکەڵک بۆ کارگێڕی و بەڕێوەبردن و خستنەکار، وەک ئەوەی دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان دەیکەن و پەرەپێدان دروستدەکەن و پێشکەوتن دێننەدی و گەشەسەندن بەدیدەهێنن، وەک چین و هیندستان و تورکیا. ئەگەر ئێران لەوەدا سەرکەوتووبێت، ئەوا دەتوانێت هەندێک لە خواستەکانی میللەتەکەی بهێنێتەدی و بەشێوەیەکی تر ڕۆڵی هەرێمایەتی بگێڕێت، واتە ڕۆڵی **نێوانکاری کارامە**. هەروەها وەک ترکیا یان مالیزیا دەبێتە شوێنی تێڕامان. ئێران دەتوانێت ئەوە بکات، چونکە لە ڕووی دەرهاویشتە و سامانەکانەوە دەوڵەمەندە، تەنیا پێویستی بەو بیرۆکە خوڵقێنەر و تیخکەرانە هەیە، کە دەرفەت بۆ بەکارهێنانی ئەقڵەکان و خستنەگەڕی تواناکان و خستنەکاری وزەکان هەیە. کەواتە ئەوەی ئێران نییەتی، گۆڕینی ئاراستە و ڕوانینە بۆ مەسەلەکان، بەشێوەیەکی جیاواز کە لەگەڵیدا کۆمەڵگە ببێتە وۆرکشۆپێکی بەردەوامی بیرکردنەوەی بەپیت و کاری بەرهەمدار، وەک ئەوەی کۆمەڵگەی دینامیکی کە بە هێز و چالاکییەکانی دەوڵەمەندە و تاک تیایدا تەنیا کەسێک نییە ملکەچ بێت و بروابهێنێ یان هاواری خۆشی بکات و چەپڵەلێبدات، بەڵکو وەک بکەرێکی بەرپرسیار و بەشدار لە بنیاتنانی کۆمەڵگەکەیدا مامەڵە لەگەڵ خۆیدا دەکات، بە ئەندازەی ئەوەی شارەزا و بەرهەمهێن یان داهێنەرە لە یەکێک لە بوارەکاندا.

ئەمە ئەوەیە کە کۆمەڵگەکان ئیمڕۆ پێویستیانە: تاکێکی بەتوانا و کارا کە زیندوێتیی بەرهەمهێنەرانە و داهێنەرانەی خۆی یان جیاکاریی و بێوێنەیی خۆی پیادەدەکات، نەک ئەو تاکەی تەنیا کۆپیی ئەوانیترە یان دەنگدانەوەی سەرۆکەکەیەتی، وەک ئەوەی لە ڕژێمە فەندەمەنتالیست و تۆتالیتارەکاندا ڕوودەدات. کەچی ئەوەی لە وڵاتێکی وەک لوبنان پێویستمانە، کردنەوەی چەند بەرەیەکی نوێ نییە بۆ هێزەکانی بەرگری و قاییل نەبوون، وەک ئەوەی (ئەحمەدی نەژاد)ی سەرۆکی ئێران ئاواتەخوازیەتی، بەڵکو خوڵقاندنی نێوەندێکە بۆ دیالۆگ و لێک تێگەیشتن و تاوتوێکردن، یان سەرهەڵدانی نێوانکارەکانی فەزای گشتییە، کە لەگەڵیاندا پرنسیپەکانی کۆمار و دیموکراسی و ڕێساکانی ژیانی مەدەنی بەهێزدەبێت.

ئەمەش پێویستی بە گۆڕینی شێوەی بیرکردنەوە و شێواز و کەرەستەیە.. لەبری هێرشکردنە سەر ئەمریکا، دەبێت زۆر شتی لێوە فێربین و بیسەلمێنین کە دەتوانین بۆ بەرەنگاربوونەوەی قەیران و تەحەدداکان بگۆڕێین. چونکە لەکاتێکدا ئەمریکا (ئۆباما)ی

بۆ سەرۆکایەتی هەڵدەبژارد، کە خاوەن شوناسێکی فرەڕەگی تێپەڕێنەری ڕەگەز و ڕەنگ و تایەفەکانە، زاناکانی ئیسلام لای خۆمان لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەکانەوە بە زمانی دوورخستنەوەو ڕەتکردنەوە بەگژی یەکدا دەچوون. (ئۆباما)، وەک (ئەحمەدی نەژاد) و (شافین)، بەشێوەی پیاوێکی بڕوامەند ڕەفتارناکات، بەڵکو ئەو لە ڕووی بیرکردنەوەوە نزیکترە لە (ئەردۆگان)، واتە کراوەیە بە ڕووی مۆدێل و قوتابخانە جۆربەجۆرەکانی پێکهێنانی چارەسەرەکان و دۆزینەوەی دەروازەکانی قەیرانەکاندا.

بەم مانایە، (ئەردۆگان) کە لە حیزبێکی ئیسلامییەوە هاتوە و عەلمانییەت بە فرەشێواز پێناسەدەکات و بەشێوەیەکی کراوەو ئاوێتە، بە ڕەگە ئایینی و کۆڵەکە نەتەوەیی و ئاسۆ نوێگەری و مەودا ئەوروپییەکەی، پیادەی شوناسەکەی دەکات، لە نموونەکانی فەندەمەنتالیزم بەتواناترە بۆ دەستکردنە کارەکانی ڕیفۆرم و نوێکردنەوەو گەشەپێدان. هەروەها لە نموونەکانی عەلمانیەت و چەپڕەو، کە بەشێوەی لاهوتیانەی تاکڕەهەندی هەژاری تەوباوی مامەڵەیان لەگەڵ دروشمەکانیاندا کرد.

پێدەچێت ئەمە جیاوازیی نێوان مۆدێلی تورکی و ئێرانی بێت. چونکە تورکیا بایەخدەدات بە نوێکردنەوەی ئابووری و پەرەپێدانی سامانەکانی، کەچی ئێران دەیەوێت بڕوا و شۆڕش هەناردەبکات. تورکیا کرانەوە بەڕووی دنیادا پیادەدەکات، لەکاتێکدا ئێران بەقسە تۆقاندنی ئایدیۆلۆژیانە بەرامبەر بە هەڵمەتی داگیرکاریی کولتووریی خۆرئاوا پیادەدەکات، وەک ئەوەی عەرەب، ئەفغانی، پاکستانی و ئەوانیتر دەیکەن. تورکیا ڕۆڵێکی نێوانکار دەبینێت بۆ چارەسەرکردنی کێشمەکێشە عەرەبی و هەرێمایەتیەکان، لەکاتێکدا ئێران دەیەوێت سەرلەنوێ باروودۆخی سیاسی و کۆمەڵگەیی لەناوچەکەدا ڕێکبخاتەوە. تورکیا کار بە نەرمەهێز دەکات، کەچی ئێران بایەخ بە پیتاندنی ئەتۆمی و وەگەڕخستنی کولتووری کەربەلا دەدات، کە خەڵک دەکاتە قوربانی. لێرەوە مۆدێلی تورکی سەرکەوتوە و مۆدێلی ئێرانی تێکشکاوە. ئەو پشێویانەی ئێرانیش بەخۆوەیان دەبینێ، سەرچاوەکەی خودی ئەو تێکشکانەیە.

پێدەچێت بەهۆی ئەوەوە بتوانم پەی بە هۆکانی تێکشکان و شکستخواردنی شۆڕشەکان بەرم، بەتایبەتی شۆڕشەکانی جیهانی سێهەم. لێرەدا هۆکە ناگەڕێتەوە بۆ فشار و دەستوەردان و پیلانەکانی دەرەوە، هەروەها ناگەڕێتەوە بۆ دەستەیەک ڕێونکەر، یان ڕیاکار، یاخود بەکرێگیراوی ناوخۆ، بەڵکو لە ئاوێتەیەکەوە سەرچاوەدەگرێت، کە لە ئەقڵەکاندا چێنراوە و بەری خراپ و نەزۆک، یان وێرانکەری خۆی داوە: هەڵبژاردەخوازیی بڕوامەند، بەوەهمکردنی لاهوتیانە، بەهەشتی یەکسانی، بەتارماییکردنی شۆڕشگێڕانە و خەباتکارانە.

## دەردی هەڵبژاردەخوازی:

مەبەست لێی ئەو گەنجینە بڕوامەندییەیە کە لە جولەکەوە بۆ موسڵمانەکان ماوەتەوە و بەشێوەیەکی دووقات لای ئەوان کاریکردوە. هەروەها بریتییە لەو بڕوایەی ئەوان کە باشترین نەتەوەن و تەنیا ئەوان کلیلەکانی حەقیقەت، ڕێی ڕاست نیشاندان، سەرڕاستی و بەختەوەریان بەدەستەوەیە... ئەم هەڵبژاردەخوازییەی سوننە و شیعە، بەشێوەی دوورخستنەوە و پەراوێزخستن، یان بەساختە و کافردانان، دژی یەکتر پیادەیدەکەن، دیالۆگی نێوان هەردوو کۆمەڵەکە پێش دەستپێکردنی مینرێژدەکات. لەو وڵاتانەی فرەتایەفە و فرەمەزهەبن- وەک لوبنان و عیراق- ئەقڵی هەڵبژاردەخواز وەک کارگەیەکی بەرهەمهێنانی جیاوازیخوازی و پارچەپارچەکردنی کۆمەڵگە و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت و زەبروەشاندن لە بیرۆکەی هاوڵاتیبوون کاردەکات، کە تەڵەی ڕیزپەڕەبوونە دژی خاوەنەکەی هەڵدەگەڕێتەوە، چونکە وای لێدەکات پێیوابێت پێشکەوتوو یان باڵادەستە، کەچی دواتر بۆی دەردەکەوێت لە رووی بەشداریکردنەوە لە دروستکردنی ژیواردا لە پەراوێز یان ڕیزی دواوەی کاروانی جیهانیدایە.

## بەتارمایکردنی شۆڕشگێڕانە:

ئەمەش لەلایەن مۆدێرنیتە و بەهۆی شۆڕشە فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانیەوە کنەیکردۆتە ناو مێشکەکانەوە. ئەم وەهمە ئەنجامی زاڵبوونی ئایدیۆلۆژیا سۆشیالیستییەکان و بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان و ڕژێمە پێشکەوتنخوازییەکان دووقات بووە. ئەوەش لەو دروشمانەدا بەدەردەکەوێت کە داوای دامەزراندنی کۆمەڵگەی دوور لە جیاوازی و یەکسانیی نێوان خەڵک دەکەن، بەئەندازەی ئەوەی پڕ بەدڵی خۆیان ئازادیی دەربڕین، ڕێکخستن، بەکاربردن، سەرگەرمکردن و ڕابواردن پیادەدەکەن... ئەمەش تا ئەندازەیەکی زۆر ساویلکەیی و سادەکاری و هەڵخەڵەتاندنە... ئەو یۆتۆپیایەیە کە وا لە خاوەنەکانی دەکات خەو بە بەهەشتێکی زەمینییەوە ببینن، بەڵام بەبازدان بەسەر واقعی مرۆڤدا، بەو ئاڵۆزی و بەهەڵەتێگەیشتن و پاردۆکسانەی تیایدان و بەو جیاوازیخوازی و دەرد و تاوانکارییانەی هەمیشە بەرهەمیاندێنێت. ئەمەش وادەکات دروشمە ئەرخەوانییەکان دەربارەی یەکسانی و ئازادی تەنیا توێژاڵێکی ژیواری بن بەسەر ڕووی هوشارییەوە یان تەنیا داڕشتنی ڕەوانبێژانەی گوتاری دەربڕاو بن، چونکە بنەڕەتی شۆڕبۆوە و شاراوە و پەردەپۆشکراو، هەندێک جار بەهۆی ڕوونیی زیادەڕوانە و هەندێک جاری تر بەهۆی نەبینین ئەنجامی نەخوێندەواریی زیادەڕۆیانە، پێچەوانەی ئەوەیە کە دەردەبڕێت و دەوترێت. واتە ئەقڵ، ئازادی، یەکسانی و ڕەوا نییە، بەڵکو

هەوەس، چاوچنۆکی، جیاوازیخوازی، دەرخستنەوە و ستەمکارییە... ئەمەش ئەوەمان بۆ لێکدەداتەوە چۆن کۆمەڵگەکان هەمیشە ئەوە دەخەنەوە کە دژی یاسا، دەستوور، مافەکان و بەها کۆکەرەوەکانە... بۆیە ناونیشان و دروشمەکان، جا پەیوەندییان بە دادپەروەرییەوە هەبێت یان بە ئەقڵانیەتەوە، بەردەوام پێویستی بە پێداچوونەوە و بنیاتنان هەیە، بەمەبەستی گەشەپێدان و بەهێزکردنیان. ئەمە ئەوەیە کە دەربارەی دیموکراسی لە خودی خاکەکەی خۆیدا ڕوودەدات، چونکە بیرۆکەکە هەمیشە دەکەوێتە بەر ڕەخنەگرتن و پێداچوونەوە، بەمەبەستی فراوانکردن و گەشەپێدان و بنیاتنانەوە، بۆ بەرەنگاربوونەوەی تێکشکان و گۆڕانکارییەکان، وەک ئەوەی لە وڵاتێکی وەکو فەرەنسا ڕوودەدات. ئەی لە وڵاتەکانی ئێمەدا چۆن بێت، کە ڕژێمە دیموکراتیەکان دەگۆڕێن بۆ چەند حکومەتێکی دیکتاتۆری، یان پاشایەتیی خراپ؟!

## وەهمی سەرکەوتنی خواوەندانە:

بنچینەکەی بڕوابوونە بەوەی، لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئێران و پشتگیریکردنی بۆ حیزبولڵا، ئەوە هاتەدی کە عەرەب لە ڕۆژگاری سەلاحەدینەوە بەدەستی نەهێناوە. هەروەها زۆرێک زیادەڕۆییدەکەن و شتەکان قەبەدەکەن: تۆمارکردنی سەرکەوتن بەسەر ئەمریکا و ئیسرائیل و جیهانی خۆرئاوادا. ئەوان پێیانوایە ئەوە بە پشتگیریی خوا ڕوویداوە، بۆیە بە «سەرکەوتنی خواوەندانـە» ناونراوە. بەخشینی خەسڵەتە خواوەندەکان بە کارەکان و دامەزراوە دنیایی و مرۆڤایەتیەکان، بە خۆبەرزکردنەوەی مرۆڤ بۆ پلەی خواوەندی و مامەڵەکردن لەگەڵ شۆڕش بەو شێوەیەی پیرۆزترینی پیرۆزەکانە، ئاکامەکەی قۆرخکردنی ڕەوایەتی و زەوتکردنی ئازادی و دەستگرتنە بەسەر چارەنووسەکاندا، یان شاردنەوەی ئابڕوچوون و تاوانەکانە لە ژێر ئاڵای تاقە سەرۆک و سەرکردەی ئیلهامبەخش یان پاڵەوانی ڕزگارکەردا. ڕووەکەی تری ئەو بەوەهمکردنە خواوەندییە، بڕوابوونە بەوەی لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئێراندا عەرەب و موسڵمانەکان شکۆدارییی خۆیان بۆ دەگەڕێتەوە و دەستپێشکەریی مێژوویی بەدەستدێننەوە، بۆ دامەزراندنی دەوڵەت یان خیلافەتەکەیان. ئەوەش مانای نەهێشتنی زوڵم و هێنانەدیی هەقـە، واتـە هێنانەدیی ئەوەی پێغەمبـەر و هاوەڵەکانی- کە ڕێزپەڕبوون- نەیانتوانی بیانهێننەدی.

## ئەرمە شۆڕش:

بە سێ ڕاستکردنەوە کۆتایی بەبابەتەکە دەهێنم:

یەکەم/ ئایا من دەستوەردەدەمە کاروبارەکانی ئێرانەوە؟ وەڵامەکەم ئەوەیە، ئێمە ئێستا لەسەردەمی پشت بەیەکتری بەستندا دەژین، کە کێشە و شوناسەکان بەجیهانیبوون، بەئەندازەی ئەوەی بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان تێکهەڵکێشن. ئەم واقیعە گەردوونییەی لە ئاستەکان و بازنەکان و کایەکانیدا بەیەکداچووە، وادەکات بۆ هەریەکێک شیاو و ڕەوا بێت دەستوەرداتە کاروبارەکانی کەسێکی تر. بەهەرحاڵ، ئێرانێک کە خۆی بەخاوەنی مەسەلە ئیسلامییەکان دەزانێت، لەکوێ بۆی بلوێت دەستوەردان پیادەدەکات، بەڵام کاتێک من دەستوەردەدەم، ئەوا لە ڕوانگەیەکی پراکتیکییەوە ئەوە دەکەم، ئەمەش لە دەرگایەکی تایەفەگەرانە یان ناسیونالیستانەوە نا، بەڵکو لە فراوانترین دەرگای جیهانی و گەردوونییەوە، هەتاکو بڵێم و دووبارەبیکەمەوە کە چیتر زمانی موشەک، تۆپ، هەناردەکردنی شۆڕش و بڕوا، زمانی سەردەم نییە.

دوەم/ سەبارەت بە پەیوەندیی عەرەب بە ئێرانەوە، لەوانەیە وەک نارەزاییدەربڕین بوترێ: عەرەب یان هەندێکیان دژی ئێرانی شۆڕشن، لەکاتێکدا ئێران بۆتە هێزێکی پشتگیریکەری مەسەلەکانی عەرەب بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئیسرائیل و ئەمریکا. پێموایە پشتگیریکردنی دەرەوە بۆ عەرەب، تەنانەت ئەگەر لەلایەن دەوڵەتێکی ئیسلامیشەوە بێت، زۆر سوودبەخش نییە، کاتێک عەرەب لە دۆخی دەستەوسان و لاوازیدایە، واتە کاتێک عەرەب توانای ئەوەی نییە دەستدانەکان وەبەربهێنن و هێزی خۆیان بنیات بنێن و کۆمەڵگەکانیان بگۆڕن بۆ چەند کۆمەڵگەیەکی بەرهەمهێن، کە بتوانن ئامادەگیی چالاکانەی پۆزەتیڤ و بنیاتنەرانەیان لەسەر شانۆی جیهان هەبێت.

بەڵگەی ئەوەش، پشتگیریکردنی یەکێتیی سۆڤییەت بەدرێژایی دەیان ساڵ، ڕێگرنەبوو لە ڕوودانی نسکۆ و شکست و داگیرکارییەکانی ئیسرائیل. پشتگیریکردنی ئێرانیش بەهەمان شێوەیە، چونکە ئەگەرچی ئێران دەوڵەتێکی ئیسلامییە، بەڵام ڕوویەکی تریشی هەیە، ئەویش ئەوەیە ئێران دەوڵەتێکی عەرەبی نییە، بەڵکو ستراتیژی خۆی هەیە، کە ئامانجی ڕۆڵبینینی هەرێمایەتی و جیهانییە، لە ڕێگەی بەکارهێنانی مەسەلەی فەڵەستینەوە. شایەتی هەرە گەورەش ئەوەیە، کە پشتگیریکردنی ئێران هیچ هێزێکی بەرهەم نەهێنا، چونکە بووە مایەی کەرتبوونی عەرەب و پارچەپارچەبوونی یەکریزیی فەڵەستینی، لەبەرئەوەی ئامانجەکە ژێراوژوورکردنی بارودۆخ و ڕژێمەکانە لە جیهانی عەرەبدا، بەمەبەستی داڕشتنەوەی نەخشەی سیاسی یان کۆمەڵگەیی. ئەو هێزەی واقیع دەگۆڕێت و هاوکێشە نوێکان دروستدەکات، ئەوەیە کە میللەتە عەرەبییەکان بنیاتیدەنێن.

ئەو کاتـە پشـتگیریی ئێـرانی یـان تـورکـی بـەرهـەمـدار و بنیاتنـەر دەبێت.
سەرباری ئەوە، چۆن دەوڵەتێک دەتوانێت پشتگیریی خەڵکانێک لە دەرەوە بکات و سوودیان پێ بگەیەنێت، لەکاتێکدا لەسەر خاکەکەی خۆی سەرکەوتوونەبووە لە چاککردنی هەلومەرجەکانی ژیان و بەدەستهێنانی پێشکەوتن و پەرەسەندندا.
سێیەم/ قسەکردنم دەربارەی شۆڕش مانای ئەوە نییە من دژی شۆڕشم، یان داوای هەڵنەگیرسانی دەکەم، یان بە بێکەڵکی دەزانم. من بۆخۆم لەو کارانە توڕەدەبم کە بە زۆردارانە یان بە گەندەڵیان دەزانم و دژیان ڕادەبم، بەڵام چوونە ڕیزەکانی شۆڕش یان بانگەوازدان بۆ هەڵگیرسانی جیاوازە لەگەڵ تێگەیشتن لە لۆژیکی شۆڕش. جیاوازییەکە لەنێوان زمانی تێگەیشتن و دەستنیشانکردن لەلایـەک و زمانـی زیادەڕۆیـی و بەوەهمکـردن یان بەتارماییکردنی خەبـات و بـڕوادایـە.
بۆیە واچاکە بەم شێوەیە کۆتایی بە بابەتەکە بهێنم: وەک ئەوەی شۆڕشەکان فێریانکردووین، چیتر توڕەبوونی شۆڕشگێڕانە لەم سـەردەمەدا بەرهەمدار نییە، پاش ئەوەی بەرژەوەندییـەکان و چارەنووسـەکان تێکهەڵکێش و بەیەکداچوون، سەرکەوتن بەهۆی بەکارهێنانی توندوتیژی و چەکەوە مەحاڵـە. زمانی موشەک، تۆپ، حەشاماتی ڕیزبەستوو و جەماوەری نادیدە ژیانێک دروستناکات و ئازادییەک ناهێنێتەدی و واقعێک بەرەو باشتر نابات. ئەمەش ئەوەیە کە لوبنان پێی ڕاگەیاندین: چونکە بەدوای یەکهاتنی شۆڕشەکان و سەرکردەکان و دەربڕینی دروشمەکان، بە وێنە و ناونیشان و نموونە ناسیونالیست، یان چەپڕەو، یاخود ئیسلامییەکانەوە، ڕیفۆرم یان نوێکردنەوە، پێشکەوتن یان پەرەسەندنی دروست نەکرد، بەڵکو بەشداریکرد لە هەڵگیرسانی شەڕە ناوخۆییەکان و هەنجن هەنجکردنی یەکگرتنی نیشتمانی و وێرانکردنی شارستانێتی- شـۆڕش لە دوای شـۆڕش- بۆ گێڕانەوەی بارودۆخەکان بۆ دواوە.
پێدەچێت لە ڕۆژگاری هەرەسهێنان و کارەساتەکان و لەبەر ڕۆشنایی شۆڕش و گۆڕانکارییە تەکنۆلۆژی و زانیاری و زانستییەکاندا پێویستمان بە جۆرێکی تری شۆڕشەکان هەبێت: پیادەکردنی خۆپارێزی و بێفیزی لە ڕێگەی شۆڕشکردنەوە لەنـاو خـوددا، بۆ کەمکردنـەوەی نەخۆشـییەکانی نەرجسییەت، ناوەندێتی، هەڵبژاردەخوازی، ئیمپریالیزم و ستەمکاری... ئەو هەموو بەخوابوون و پەرستنە سوودیان چییە کە دەبنە مایەی بڵاوبوونەوەی جادووگەری و چاندنی وێرانی و بەرهەمهێنانی بەربەرییەت لە سـەرجەم گۆی زەویـدا؟ دروشمە جۆربەجۆر و

دژیەیەکەکان سوودیان چییە، ئەگەر شارەکانمان بگۆڕین بۆ سەربازگەکان، کە تیایاندا ئاسایش بەهۆی ئەقڵە مینرێژکراوەکان، شوناسە داخراوەکان، کولتوورە شەڕانگێزەکان، دەستە تایەفەگەر یان حیزبییە هار و ئامادەباشەکانەوە تێکدەچێت؟

## پەراوێزەکان:

(١) زۆربەی ئەم وتارە لە ڕۆژنامەی (الحياة)دا بڵاوبۆتەوە.

(٢) بڕوانە کتێبی «پێکهاتنی دژەکان»، ئێران و ڕۆڵی هەرێمایەتیی، الدار العربية للعلوم ناشرون، موءسسة الاختلاف ٢٠٠٨.

# خورپە و کارەسات

## ١ - چاوچنۆکی و ڕابواردن:

ڕاستیی قەیرانی دارایی سەبارەت بە ڕەهنکردنی خانوبەرە کامەیە؟ ئەو قەیرانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەقییەوە، وەک هەر قەیرانێکی ناوچەیی گەورە، ئاسەوار و کاریگەرییەکانی لەسەر ئاستی جیهان جێدەهێڵێت. پێشدەچێت قەیرانەکە ڕێکەوت نەبێت، بەڵکو بونیادییە و لە جۆری ئەو خولە قەیرانانەیە کە ناویەناو کەرتی ئابووری بەخۆیەوە دەبینێت، بۆیە بە قەیرانی مەزنی ساڵی ١٩٢٩ی دەشوبهێنن.

بێگومان لێکدانەوەکان بۆ تێگەیشتن و دەستنیشانکردنی قەیرانەکە جۆراوجۆرن، بیروڕاکان زۆرن و تیۆرەکانیش دژ بەیەکن. پێدەچێت مامەڵەکردن لەگەڵ پارە، کە کارێکی ڕۆژانەیە و هەریەکێک لە ئێمە ئەنجامیدەدات، لانی کەم بۆ کڕینی ئەو شتانەی پێویستن، ئاڵۆزترین مەسەلە و سەخترینیان بێت بۆ تێگەیشتن. چونکە لە دوائەنجامدا ئەو دراوە نەختیانەی مرۆڤ لە جزدانەکەیدا دایاندەنێت، یان لە بانق ڕایاندەکێشێت، ئەو سمبولانەن کە هاوکێشەیەکی تیۆری، یان گریمانەیی ناڕاستەوخۆ پێکدێنن بۆ پارەپەیداکردن و دەستکەوت. واتە ئەو کۆششانەی مرۆڤ لە کارەکەیدا دەیکات، وەک ئەو موچەیەی فەرمانبەر لەکۆتایی هەر مانگێکدا وەریدەگرێت، یان ئەو پارەیەی پاشەکەوتیدەکات. پاشکەوتەکان لە ڕابردوودا لە ئاڵتون، یان زیو، یاخود پارەی نەگوێزراوەدا بەرجەستەدەبوو.

ئەمەش دەمانباتــە ناو زانستی داراییــەوە، بــە عەمبارێک زارەوە و چەمکەوە، وەک قەرز، قیست، سلفە، سوود، بۆرسە، هەڵئاوسان، دراوی بەکارهێنراو، پشک، پێشبڕکێی بازرگانی...

هەریەکێک لەو زاراوانەش هێما بۆ لایەنێکی چالاکیی ئابووری یان کاری دارایی و بانقی دەکات، کە بەیەکداچوو و تێکهەڵکێشن، بەجۆرێک هەر ڕوویەک یان ئاستێک کاریگەریی لەســەر ڕوو و ئاستــەکانی تــر دەبێــت. بۆیە سەرەنجام هاتنەئارای

کۆمەڵێک تیۆرە، کـە بە زمانی ماتماتیکی تەکنۆلۆژیانەی زۆر ئاڵۆز داڕێژراون.

هەرکاتێک من بابەتێک دەربارەی مەسەلەکە دەخوێنمەوە، لێی نزیک نابمەوە، بەڵکو زیاتـر تووشی دۆشـدامان و ناڕوونی دەبـم، ئەمەش لەبەر پێکداچوونی لایەنەکـان و هەمەجۆریی شیکردنەوە و شرۆڤەکردنەکان.

هەیانـە قەیرانەکە، بەڵکو کارەساتەکە، دەگێڕێتەوە بۆ گۆڕانی نەخشـەی ئابووری، ئەنجامی سەرهەڵدانی یاریکەری نوێ لەسەر شانۆکە و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو و بەهەموو هێز و لێهاتوویی خۆیانەوە، وەک چین و هندستان و پڵنگەکانی ئاسیا. هەیانە دەیگێڕێتەوە بۆ چاوچنۆکی و تینوێتی بۆ قازانجی خێرا. هەشیانە پێیوایە دەگەڕێتەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی ناماقوڵی پارەکان، یان گەمەکردن بە سیستەمە داراییەکان و پێشێلکردنیان. ئەمە وێڕای ئەوانەی لەو بڕوایەدان کـە دەگەڕێتەوە بۆ نەزانیی گەمەکەرەکان لەبارەی ڕێکارەکان و میکانیزمـە ئاڵۆزەکانی پرۆسەکانی داراییەوە، کە دەبێتە هۆی خەمڵاندنی هەڵەی بەرزی و نزمیی بەهاکان.

بەهەرحاڵ، من پسپۆڕی بواری دارایی نیم و ناشبمە پسپۆڕ، بەڵام دەتوانم لە دەروازەی جیاوازەوە توخنی مەسەلەکە بکەوم. سـەرەتا دەگەڕێمەوە بۆ (ئیبن خەلـدون)ی زانا، کە هەرەسهێنانی دەوڵەتەکانی لە ڕێگەی دوو هۆکارەوە لێکداوەتەوە: نەمانی پارەو لەناوچوونی هێز. هەردووکیشیان بەرئەنجامی ئەوەن کە ناوینناوە «ڕابواردن». بەپێی زاراوەی بەکارهاتوو، کۆمەڵگە هاوچەرخەکانمان کۆمەڵگەی «بەرخۆرن». ئێمە بووینەتە ئەو بوونەوەرانەی دەژین و کاردەکەین و بەرهەمدێنین، بۆ ئەوەی بەرخۆری ئەنجامبدەین. ئەمەش مانای ئەوەیە خەرجییەکان، داهاتەکان تێدەپەڕێنن. بەو جۆرە ئێمە بەرخۆری ئەنجامدەدەین، بۆ ئەوەی هەژاربین و لەناوبچین.

هۆکارێکی تر ئەوەیە، کە هێنانەژێرباری مرۆڤ و کارەکانی بۆ لێکۆڵینەوەو شیکردنەوە، بەمەبەستی ئاشنابوون پێیان بەشێوەیەکی بڕواپێکراوی هاوجووت، یان بەڕێوەبردنی بەشێوەیەکی توندوتۆڵ، مەسەلەیەکی ئیشکالییەتئامێزە، ئەمە ئەگەر مەحاڵ نەبێت. هۆکاری ئەوەش دووفاقیی نێوان خود و بابەتە، واتە نێوان زانا و زانراو، یان بکەر و ئامێر. چونکە ئەوەی مرۆڤ دەیەوێت دەربارەی خۆی وەک بکەرێت بیزانێت، بەهۆی هەمان مەعریفەوە گۆڕانی بەسـەردا دێت کـە دروسـتکردن و گۆڕانکارییە. ئەمەش بۆ پێشبڕکێکاری سوڕی ئابووری ڕاستە، چونکە کاردەکات و کاریگەریدەخاتەوە، تەنانەت ئەگەر کەمیش بێت. واتە بەشداریدەکات لە گۆڕینی ئەو دەرهاویشتەیەی حساباتەکانی خۆی لەسەر سەقامگیری و جێگیریی بنیاتدەنێت. ئەم کارتێکردنە شاراوەیە ئەو شتەیە کە ئابووریزانان و پسپۆڕانی دارایی فەرامۆشیدەکەن.

لەوەوە دەگەمە هۆکارێکی گرنگ، کە پەیوەندیی بە ڕەوتی جیهانیی هەنوکەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئیمڕۆ کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی، بەهۆی شۆڕشی زانیارییەکان و کۆمۆنیکاشیۆنی تەکنیکی و دیجیتاڵییەوە، دەچنە ناو واقعێکی گەردوونیی نوێی خێرا و بێهاوتاوە.

جا لەبەرئەوەی بە شێواز و بزاوتەکەی خێرایە، بۆیە وا لە کەرەستەکان و ڕێکارەکان دەکات پێش ئەوەی بەرهەمبدەن بسوێن. ئەمەش مانای ئەوەیە، بەئەندازەی دۆزینەوەی چارەسەرەکان چەند کێشەیەی تر دێنەئاراوە، بەڵکو لەوانەیە هێنانەئارای کێشەکان لە دۆزینەوەی چارەسەرەکان زیاترین. بۆیە ئیمڕۆ دەبینین ڕادەی قەیرانەکان و هەرەسهێنانەکان خێراتربوون.

هەروەها لەبەرئەوەی واقیع بەهۆی زانیاری و تەکنیکەکانیەوە بێهاوتایە، بۆیە جیهان خەریکە لە ژێر سمبول و نیشانە کیشوەرپەڕەکان و لە ڕێگەی تۆڕەکانیەوە دەشاردرێتەوە یان وندەبێت. ئەمەش مانای زاڵبوونی بەرهەمهێنانی نەرمە بەسەر بەرهەمهێنانی قورسدا. هەروەها مانای زاڵبوونی سەرمایەی داراییە بەسەر جۆرەکانی تری سەرمایەدا و پەرەسەندنی دووقات و خێرای بازرگانییە لەسەر حسابی پیشەسازی و کشتوکاڵ. سەرەنجامی واقیعی گریمانەییەش ئەمەیە: کرانەوەی بوار لەبەردەم بازاڕی ئەلکترۆنیدا و لەسەر ئاستێکی فراوانی گەردوونی، بەشێوەیەک کە دەبێتە مایەی سامان کەڵەکەکردن، بەبێ هیچ کۆششێکی ڕەوا یان ماقوڵ. ئاکامەکەش هەرەسهێنانی ئەوەیە کە پێیدەڵێن کازینۆکانی دارایی. ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەو سیستەمە داراییەی کۆنترۆڵی جیهان دەکات، دەستەوسانە لەئاست کۆنترۆڵکردنی خۆیدا.

بێگومان لێرەدا پرسیارێکی گەورە دەورووژێنرێت: چۆن ئەو قەیران و هەرەسهێنانانە ڕوودەدەن، لەکاتێکدا سوپایەک زانا لەئارادان، کە شیکردنەوە و دەستنیشانکردن ئەنجامدەدەن؟ چۆن بڕوا بەوە بکەین، لەگەڵ بەدەستەوەگرتنی عەمبارێک تەکنۆلۆژیای ئەقڵانیی ئاڵۆز و ورددا، کەچی هەرگیز سەرکەوتوونین لە چاوەڕوانکردنی قەیرانەکاندا و ناتوانین خۆمانیان لێ لابدەین؟!

لێرەشدا دەتوانین بڵێین، تیۆرەکان شمشێرێکی دووسەرەن، چونکە هەتاکو ئەو تیۆریانە زیاتر ڕووبکەنە ڕووتکاری و ئەقڵانیکردن یان شێوازسازی و پڕۆگرامکردن، ئەوا واقیعی زیندووی مرۆڤایەتی، بە بزووتنەوە و زیندوێتییەوە، بە تریە و شڵەژانییەوە، بەگۆڕانکاری و نەشونماکردنیەوە، بەهێنانەئارای ڕووداو و بازدانەکانییەوە زیاتر پەردەپۆشدەبێت. ئەمەش مانای چاوەڕوان نەکردنی ڕووداوەکەیە.

باسکردنی عەقڵ و تواناکانی دەمانگەیەنێتە دوا هۆکاری بەرهەمهێنی هەرەسهێنان،

ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ ئەقڵێکی ڕووت یان کۆمپیوتەرێکی بەرنامەڕێژکراو نییە، تەنانەت لە مەسەلە ئابوورییەکاندا. بۆیە قازانج تەنیا کەڵەکەکردنی پارە نییە، هەروەها بازاڕ تەنیا حساباتی وردی دارایی نییە، وەک کتومت چۆن مرۆڤ تەنیا بکەرێکی ئابووری یان پێشبڕکێکارێکی دارایی نییە. چەندین هۆکاری تێکهەڵکێشی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی هەن، کە بەشداریدەکەن لە بەرهەمهێنانی قەیرانەکەدا و هەندێک پسپۆڕیش، ناودارترینیان ئابووریناسی فەرەنسی (ئەندرێ ئورلیان)، مایەپووچیی پێشهاتوو دەستنیشاندەکەن. بەوپێیەی پێکدادانی هێزەکان و لێکدژیی بەرژەوەندییەکان و هێزی هەستوسۆز و ئارەزووەکان لەئارادایە. هەروەها بڕوابوونی کوێرانە بە دەسەڵاتەکانی دراو لەگۆڕێیە، ئەو کەللەڕەقییە لەئارادایە، کە وا لە خاوەنەکەی دەکات سووربێت لەسەر ڕێڕەوی شیکردنەوەی خۆی. هەروەها پەتاکە لەناو ئەو خەڵکەدایە کە متمانە لەدەستدەدەن، بۆ ئەوەی قەیرانەکە پاش پێشهاتنی ئاڵۆزتربکەن. لەپشت هەموو ئەوانەشەوە تەماعکاری، چڵێسی، ڕابواردن و خراپەکاری هەیە. هەموو ئەو هۆکارانەش کاریگەرییان لەسەر بڕار و ڕێکار و چالاکییە داراییەکان دەبێت، چونکە یاریکەر یان بکەرەکە بەرەو شوێنێک دەبەن، کە نایەوێت یان بڕوای پێی نییە، بەڵکو هەندێک جار ڕاپێچیدەکەن بۆ ئەوەی ئازار یان زیانی ئەوی تێدایە. واتە ئەوەی نەزانی و نادیدەیی، یان بەڵاو کارەسات بەرهەمدێنێت.

ئەوەتا مرۆڤایەتی، سەرباری هەموو وریاکردنەوەکان، خەریکە زەوی دەکاتە «گوندێکی خۆڵ و خاشاک»، ئەوەتا جەنگەکانی دژی تیرۆر چەندین قات توندوتیژدەبن. ئەوەتا قەیرانی دارایی، وێڕای ئەو هەموو ئەقڵ و حساباتەی شیکەرەوەکان و تیۆری زاناکان، بەخێرایی دووبارەدەبێتەوە.

یەکێک لە پارادۆکسەکان لەمبارەیەوە ئەوەیە، ئەو قەیرانە بانقییەی لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٨دا ئەنجامی کەمیی پارەی بەکارهێنراو تەقییەوە، لەسەردەمێکدایە کە پێیدەوترێت سەردەمی مۆدێرنیتەی هرۆژمهێنی نیشانە و دەرهاویشتەکان.

ئایا ئێمە، لە ڕووی پێزانین و جڵەوکردن و کۆنترۆڵکردنەوە، لەوە بێتواناترین کە بانگەشەی بۆ دەکەین؟ مێژووی مرۆڤایەتی شایەتی ئەوەیە کە ئارەزووە کاتییەکان، هەوەس، چاوچنۆکی، ڕق و نەزانیی مرۆڤ، زۆر لە ئەقڵ و دانایی و چاکەکارییەکانی ئاقڵبوون و چاوکرانەوە و تەگبیرەکانی زیاترن.

## ٢ - فەندەمەنتالیستەکانی سەرمایەداری و تاڵەبانییەکانی سۆشیالیزم:

ئەو قەیرانە داراییەی تووشی ئەمریکا بووە و دەنگدانەوە و کاریگەرییەکانی لەسەر

ئاستی جیهان جێدەهێڵێت و لە هەرەسهێنانی بۆرسەکاندا بەرجەستەبووە، هێشتا و شان بەشانی جەنگ و چالاکییە تیرۆریستیەکان، دەرکەوتووترین ڕووداوە. بۆیە هەموو خەڵکی جیهانی بەخۆوە سەرقاڵکردوە، جا ئەوانە بەرپرس بن یان نا، شارەزابن یاخود نا. بێگومان ئەم قەیرانە، کە دەبێتە مایەی تیاچوونی پاشکەوتەکان، لە چەند ڕوویەکەوە هۆی نزیک و دوور، کاتی و بونیادی هەیە:

یەکەم هۆی ئەخلاقییە، وەک ئەوەی لە چاوچنۆکیی پێشبڕکێکار، یان نەزانیی وەبەرهێن، یاخود گەمەکـردن بـە دەرهاویشـتەکان و پێشێلکردنی یاسـاکان لەلایەن مەعمیل و بانقکارەکانەوە دەردەکەوێت. ئەم دەردە شتێکە ئەو بانقانەی سـێبەر، کازینۆیانەی دارایی و دامەزراوە نارەوایانەی تر شارەزان تیایدا، کە لە دەرەوەی یاسا و دامەزراوە ڕەواکـان کاردەکـەن. ئاکامەکەش پەیداکردنی چەندین سامانی ناماقوڵ و نارەوایە. سروشتییە ئەمە لە سەردەمی خێرایی بێهاوتا و زیادەبەهادا ڕوویدات، بەشێوەیەک کە قازانجەکان بەشێوەیەکی خەیاڵی و ئەوپەڕی خێرایی چەند قات دەبن.

لەلایەکی ترەوە هۆی مەعریفی هەیە، کە لە نەزانی دەربارەی دەرهاویشتەکان و تێنەگەیشتن لە پێشهاتەکاندا دەردەکەوێت. خستنەڕووشی بەو شێوەیەیە، کە ئیمڕۆ جیهان بەخێرایی بێهاوتا و ئاڵۆزییە لەڕادەبەدەرەکانییەوە، زیاتر لە هەرکاتێکی تر وای لێهاتووە کە ئابڵوقەدان و کۆنترۆڵکردن، یان جڵەوکردن و لەقاڵبدانی سەخت بێت. ئەمەش وادەکات ڕووداوەکان لە ژێر دەسەڵاتی پسپۆڕ و شیکەرەوەکان، یان زانا و تیۆریستەکان دەربچن.

ڕاستە ئەوانە کاردەکەن بۆ چاککردنی کارڕاییکردن، ئەوەش لە ڕێگەی دۆزینەوەی فۆرم و تیۆرەکان، یان چەند هاوکێشەیەکی نوێوە کە ئاستی پێکهاتن و لەباوەشگرتنیان باشتربێت، بەڵام بزاوتی ترسێنەر و خێرای جیهان ئەو گۆڕانکاری و بازدانە کتوپڕانە دێنێتەئاراوە کە چاوەڕوان ناکرێن.

هۆی سێیەمیش تەکنۆلۆژیانەیە و پەیوەندیی بەو قۆناغە ژیارییەوە هەیە کە کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی، لەگەڵ لەدایکبوونی سەردەمی کۆمپیوتەر و تەکنۆلۆژیای بێهاوتـا کەوتوونـەتـە ناوییـەوە و لـە شـۆڕشـی کۆمۆنیکاشـیۆن و زانیارییـەکاندا بەرجەستەدەبێت. ئەو شۆڕشەی دەرفەتی گوێزانەوەی سمبولەکان و پارەکان بە خێرایی بروسەکە دەڕخسێنێت، هەتاکو جۆرێکی نوێی بازرگانی بهێنێتەئاراوە، کە پێیدەوترێت بازرگانیی ئەلکترۆنی.

ئەگەر بازرگانی، وەک گوێزانەوەی کاڵا و شتومەکەکان، نەک بەرهەمهێنانیان، ئەنجامی قەبەبوونی لەسەر حسابی بەرهەمهێنانی پیشەسازی یان کشتوکاڵی، قەیران

بخاتەوە، ئەوا کاتێک بازرگانیی ئەلیکترۆنی دەکەوێتەگەڕ و قەبەدەبێت، قەیرانێکی دووقات دەخاتەوە و چەند کارەساتێکی ئابووری و دارایی دەخوڵقێنێت. هەروەها دەرفەتی پارەپەیداکردنی زۆر بۆ چەند توێژێکی فراوانی خەڵک دەرەخسێنێت، ئەمەش بەبێ هیچ کۆششکردنێک و تەنیا بەهۆی نامەناردن و پەیوەندیکردنەوە لە ڕێگەی هەوا و بۆشاییەوە.

لەوانەیە ئەم دەردە هۆکارێکی بنچینەیی دروستکردنی قەیرانەکە بێت، چونکە خەوشییەکە تەنیا گەمەکردن یان خراپ بەکارهێنان نییە، بەڵکو لەکارکەوتنێکی بونیادییە تووشی کاری سیستەمی ئابووری دەبێت، وەک ئەوەی قەیران یەک لەدوای یەکەکانی ئەمریکا دەریدەخەن، لە کۆمپانیای ئینرۆن (٢٠٠٢) وە بیگرە، هەتاکو بە قەیرانی ڕەهنی خانوبەرەدا (٢٠٠٧) تێدەپەڕێ و دەگاتە مایەپووچیی بانقی لیمان بـرازەر (٢٠٠٨).

لێرەوە هەندێک باسی هەرەسهێنانی گشتی و خەوشییەکی بنچینەیی لە شێوازی پارەپەیداکردن و بەڕێوەبەری پارەکاندا دەکەن. ئەمەش سـەیرنییە: چونکە ئەگەر بمانەوێت تیۆرەکەی (ئیبن خەلدون) وەبەربهێنین، ئەوا مایەپووچی یان نەمانی پارە، دەبێتە هۆی هەرەسهێنان لە شوێنێکی دیاریکراودا. ئەوەی ئێستاش هەرەسدەهێنێت دەوڵەتەکان نین، بەڵکو درزکەوتنە سیستەمی دارایی جیهانییە، کە بەشێوە لیبرالییە نوێ و خراپەکارەکەی باڵادەستە.

ئەم هەرەسـهێنانە وایکـردوە، دەستوەردانی دەوڵەت بۆ ڕزگارکردنی دۆخەکە و چارەسەرکردنی قەیرانەکە زۆر پێویست بێت. وەک ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکـا ڕوویدا و سـەرکردەکانی دەوڵەتـە ئەورووپییـەکان داوای کۆبوونەوەیەکیان کردوە، بەمەبەستی کۆڵینەوە لە کاریگەرییەکانی قەیرانەکە لەسەر وڵاتەکانیان.

مەسـەلەکـە بەهـەر جۆرێک بێت، قەیرانەکـە بەسادەیی مانای هەرەسهێنانی سەرمایەداری یان سەرکەوتنی سۆشیالیزم لە (وۆڵ ستریت) نییە، مانای گەڕانەوە نییە بۆ پیادەکردنی مۆدێلی دەوڵەتەکانی ئۆردوگای سۆڤییەتی و سورگەکەی، وەک تاڵەبانییەکانی چەپ و سۆشیالیزم بیری لێ دەکەنەوە، یان وەک بانگەشەکارە نوێکانی گۆڕەپانی ئایینی دەیخەنەڕوو، ئەوەش لە ڕێگەی دەربڕینی دروشمێکەوە: ئیسلام چارەسـەرە، کـە پاش شکستخواردنی پڕۆژەی ناسیونالیـزم و بەرنامەی سۆشیالیستی سەریهەڵدا. ئەنجامەکەش ئاڵۆزبوونی قەیرانەکان و بەدوای یەکهاتنی کارەساتەکانە. مەغزاکەش ئەوەیە کە گەڕانەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی تاقیکراوەتەوەو شکستیخواردوە یان گێڕانەوەی ئەو نموونانەی لەمێژە سواون، کارێکی مەحاڵە.

بەڵام قەیرانەکە لەبەرامبەردا ئەو فەندەمەنتالیستانەی لیبرالیزمی راپسکاو لە هەر سانسۆر، یان رێکخستن، یاخود پیوانەیەک ریسوادەکات، وەک ئەوەی تاڵەبانییەکانی بازاڕی پیرۆز بیری لێ دەکەنەوە. ئەوەی ئەو ناوەشی لێناون، کارێکی زۆر باشی کردوە.

بەمە دەگەمە هۆی چوارەم، کە خاوەن سروشتێکی کولتووری و بڕواخوازانەیە. چونکە قەیرانەکە لە روانگەی ئەم ئاستەوە، بەرەنجامی شێوازی بیرکردنەوەو کار و بنیاتنانێکە کە پشتبەستووە بە تاکرەهەندی لە نموونە و پێوانە، یان روو و رەهەندا... ئەو تاکرەهەندییەی لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا پیادەدەکرێت.

قەیرانەکە، بەلای ئەوانەی بەباشی دەخوێننەوە و دەستنیشاندەکەن، هێمایە بۆ پێگەیشتن بەپێی تاقە مۆدێلێک، سەرمایەداری یان سۆشیالیستی، ئایینی یان دنیایی، ئەورووپی یان ئاسیایی... کە شکستخواردنی سەلماوە. ئەمەش مانای ئەوەیە، چارەسەرەکە سەرەتا بەرووی فرە قوتابخانە و رێرەودا دەکرێتەوە، بەبێ رەتکردنەوەی تاقیکردنەوەکانی پێشوو و مۆدێلە سەرکەوتووەکان، بەڵام بەبێ مامەڵەکردن لەگەڵیاندا وەک قاڵبی حازربەدەست، یان چەند پێوانەی کۆتایی. لەبەرئەوەی کاری ریفۆرم و پێگەیشتن و بنیاتنان بەپێی لۆژیکی خوڵقاندن و داهێنان روودەدات، بەئەندازەی هەمەرەنگی و جیاوازییەکان بەپێی رەوت، ژینگە، کولتوور و کۆمەڵگەکان. لێرەوە تاقە نموونەیەکی یەکگرتوو نییە بتوانێت حەقیقەتی هیچ کایەیەک قۆرخبکات، ئەمە لای ئەوانە کە لە روانگەی رێژەییبوون، فرەیی، پێکهاتنخوازی، گەشەکردنخوازییەوە دەروانن شتەکان، بەڵکو هەر مۆدێلێک دەکەوێتە بەر گفتوگۆ و تاقیکردنەوە، بەمەبەستی راستکردنەوە و چاککردن، یان گۆڕین و پێکهێنانەوە.

هەروەها چارەسەرەکە، لەسەر ئاستێکی تر، مانای ئەوەیە کە پێگەیشتن تاکلایەنانە نییە، بەڵکو ئەنجامی فرەرەهەندیی ژیانی مرۆڤایەتی، فرە روو و ئاستە. بۆیە پێگەیشتن تەنیا کەڵەکەکردنی پارە نییە، بەڵکو پەیوەندییە لەگەڵ سامان یان دەسەڵات، وەک چۆن پەیوەندییە لەگەڵ بەها و مەعریفە، یان ئازادی و شکۆ، چاکە و سوودی گشتی، کە سروشتێکی جیهانی و گەردوونیان پۆشیوە. بۆیە ئێستا رووی هەرە گرنگی پێگەیشتن ئەوەیە، کە لەسەر حسابی سروشت و بوونەوەرەکانی تر نەبێت.

پوختەی قسە: پاش ئەو هەموو تێکشکان و هەرەسهێنانانە، چاککردنی ژیان یان بەرێوەبردنی ژیان بە لۆژیکی تاکرەهەندی لاهوتی، یان لۆژیکی فەندەمەنتالیستی سەرتاپاگیر نابێت. بۆیە سەدەی بیست و یەکەم سەدەی ئایینی نابێت، وەک هەندێک رووناکبیری گەورەی خاوەن ئەقڵی تاکرەهەندی ئایدیۆلۆژییانە نوقڵانەیان بۆ لێداوە،

یان وەک بانگەشەکارانی چاندنی ویّرانە و گەندەڵی لە سەرجەم جیهاندا خەونیان پیّوە بینیوە، بەڵکو فرە شێواز و مۆدێل، یان فرە ڕێڕەو و سەرچاوە دەبێت...

ئەمە بڕوای (لۆران جرفرو)ی فەرەنسییە (بەڕێوەبەری مۆزەخانەی بوونەوەرە زیندووەکان) کە داوای کارکردن دەکات بۆ بنیاتنانی کولتوورێکی نوێی فرەڕەگی خاوەن مەیلی ژینگەپارێزیی فرەلایەن. دەربڕینی ئەمجۆرە وێناکردن یان بانگەوازەش سەیرنییە، بەلای فەندەمەنتالیستەکانی بڕوا و مەزهەبەکانەوە نا، بەڵکو بەلای کەسێکەوە کە تاوتوێی ژیان دەکات، بە دەوڵەمەندی، ئاڵۆزی، بزوات، جۆر و بازدانەکانییەوە، ئەمە وێڕای جیهانی مرۆڤ، کە بەئەندازەی فرەیی بوونەوەرەکان و جیاوازیی مانای بونەوەرەکان فرە بژار، ڕێگە، ڕێڕەو و داهێنانە. ئەمەش ئەوەیە کە ئەکادیمیای سویدی ئەمساڵ (٢٠٠٨) هێمای بۆ دەکات، کاتێک خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب دەداتە (لوکلیزیو)ی فەرەنسی، کە بەمێژووی خۆی کراوەبووە بە ڕووی مۆدێلە ژیوارییە هەرە کۆن و نوێ جۆربەجۆرەکاندا.

## لە دیموکراسیی وەرزییەوە بۆ دیموکراسیی ڕۆژانە

**پارادۆکسەکە:**

ئایا دیموکراسی بە قەیراندا تێدەپەڕێت. یان بەپێچەوانەوە پەرەدەستێنێ و بەهێزدەبێت؟

ئەوەی بە چاوێکی ئاوێتە دەڕوانێتە مەسەلەکان، دەبینێت بارەکە تەمومژاوییە، بەڵکو بێئەندازە ئاڵۆزە، بۆیە وەڵامی پرسیارەکە تەنیا یەک دانە نییە. ئێمە دەزانین کەسانێک هەن ئیمڕۆ باسی سەرکەوتنی دیموکراسی دەکەن، وەک ئەو تیۆریست و بڕوامەندانەی بە زمانی مژدەبەخشین یان پڕوپاگەندەکردن مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکان دەکەن.

بەڵام کەسانی شارەزا و ئەوانەی بە ئەقڵێکی ڕەخنەگرانەی ئارام مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکان دەکەن، بڕوای تریان هەیە. چونکە زۆربەی ئەو نووسینانەی خاوەنەکانیان بایەخ بە فیکری سیاسی دەدەن، هێما بۆ ئەوە دەکەن کە دیموکراسی بێ عەیب و کێشە نییە. لێرەوە ناونیشانی نووسین و لێکۆڵینەوەکان لەنێوان وشەکانی قەیران، تەنگژە، مین، یان نەخۆشیدا دەبێت...

سەیرنییە دۆخەکە بەو جۆرەیە، چونکە باری جیهانی، باری قەیرانی هەمەلایەنە کە هێرشدەکاتە سەر زیاتر لە ئاست و سەرچاوە و شوێنێکی جیهان و زەبریان لێ دەوەشێنێت. ئەگەرنا، چۆن ئەو پشێوی، شڵەژان، تێکشکان، بێهودەیی، شێتی و تیرۆرە لێکبدەینەوە کە لەسەر ئاستی گەردوون تیایدا دەژین... وەک ئەوەی گرفتەکانی ئاسایش، ژینگە، بژێوی، دارایی و سیاسی... دەیخەنەڕوو و هەموویان ئاسەوار جێدەهێڵن و کاریگەرییان لەسەر کایەی سیاسی هەیە.

ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بە ئەقڵێکی بەهەشتئاسا مامەڵە لەگەڵ سیستەمی دیموکراتیدا بکات، وەک بانگەشەکارانی دیموکراسی دەیکەن، ئەوا دەکرێت بوترێت: لە بنەڕەتدا سەردەمانی زێڕینی دیموکراسی لەئارادانییە، چونکە هەمیشە چەندین تەحەددا و قەیرانی کتوپڕ یان بونیادی، لە دەرەوە و ناوەوە، لەئارادابوون.

لە ڕابردوویەکی نزیکدا، واتە لە سەردەمی پێش داڕمانی دیواری بەرلین دا،

دیموکراسی ڕووبەڕووی دەردە گەورەکە دەبێوە: ئەو ڕژێمە تۆتالیتارانەی لە ئەورووپا پێکهاتبوون و ماوەیەکی درێژی پڕ ململانێ و پیاهەڵشاخانی نەتەوەیی و چینایەتی و ئایدیۆلۆژی بەردەوامبوون.

لە جیهانی عەرەبیشدا، کە لە دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکانەوە سیستەمێکی دیموکراتیی بەمیرات بۆ مابۆوە و لەسایەی حکومەتە پاشایەتی و دەرەبەگایەتی یان ڕژێمە بۆرژواییەکاندا تۆزێک جێبەجێکرابوو، دەبینین دیموکراسی سەرسمیداوە، بەڵکو لەچاو ئەوەی سەردەمی کۆلۆنیالیزمدا پاشەکشەیکردوە. ئەوەش بەهۆی ئەقڵی ستەمکاری، ڕژێمانێکی شۆڕشگێڕ، یان چەند حکومەتێکی پۆپۆلیستەوە، ئەمە سەریاری دەستەگەرییە تایەفەگەرییەکان و بونیادە هۆزدارەکان.

## سەرکەوتنێکی هەڵخەڵەتێنەر:

بێگومان دیموکراسی لەسەر خاکی خۆی و پاش سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر نازیزم و فاشیزمدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چونکە ڕژێمە دیموکراتیەکان ڕووبانکردە ئەنجامدانی ڕیفۆرم لە چوارچێوە و میکانیزمەکانیدا، ئەگەر کەمیش بووبێت. هەروەها بەردەوامبوون لەسەر بەرەنگاربوونەوەی هاوپەیمانی سەرکەوتنەکەیان (یەکێتیی سۆڤییەت)، واتە ڕووەکەی تری سێکوچکەی تۆتالیتاریزم، هەتاکو کاتی هەرەسهێنان و شکستپێهێنانی. ئەو هەرەسهێنانەش هاوشانی هەرەسهێنانی هەندێک ڕژێمی دیکتاتۆریی ئەورووپای خۆرئاوا بوو، وەک ئیسپانیا و پورتوگال یان یۆنان. ئەمەش سەرکەوتنی دیموکراسی بوو بەسەر دوژمنە تۆتالیتار یان دیکتاتۆرییەکەیدا.

لێرەوە دیموکراسی لە ساڵانی دواییدا پێشکەوتنێکی تۆمارکرد، جا ئەوە لە گوتار و داتاکاندا بووبێ، یان لە دیدار و کۆنگرەکاندا، یاخود لە بەڵێن و ئاواتەکاندا. ئەمەش وای لە پێغەمبەر و بانگەشەکارانی دیموکراسی کرد باسی سەرکەوتنی تەواوەتیی بکەن، وەک ئەوەی ڕۆژێک (فۆکۆیاما) مژدەی پێ داین.

## چەند تەحەددایەکی نوێ:

کەچی بیست ساڵ پاش هەرەسهێنانی دوژمنی تۆتالیتاری، دەبینین دیموکراسی ڕووبەڕووی چەند تەحەددایەکی نوێ بۆتەوە، جا ئەوە لەلایەن ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانەوە بێت، یان لەلایەن دەوڵەتە گومڕاکان، یاخود لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە کە دژی کۆدەنگیی نێودەوڵەتین، یان لە ململانێدان لەگەڵ دەوڵەتە دیموکراتییە خۆرئاواییەکاندا. بەوپێیەی جەنگ دژی تیرۆر بۆتە هۆی ئاڵۆزبوون و

بڵاوبوونەوەی ململانێ لەم سەردەمە بەجیهانیبووەدا. ڕووخانی دیکتاتۆرییەتی عیراقیش نەبووە مایەی تۆمارکردنی سەرکەوتنێک بۆ دیموکراسی، بەڵکو عیراقی کردە گۆمێک خوێن و دەستەوسانی ئەو زلهێزەی ئاشکراکرد کە لە بەڕێوەبردنی کاروبار و مەسەلە گەردوونییەکاندا تێوەدەگلێت و سەرسمدەدات.

ئەمە لە ڕووی دەرەوە، بەڵام لەسەر ئاستی ناوخۆ، ئەوا دەوڵەتە خاوەن ڕژێمە دیموکراتیەکان ڕووبەڕووی چەندین تەحەددا و پێشێلکاریی هەمەجۆر بوونەتەوە: چونکە سێکوچکەی ئازادی و برایەتی و یەکسانی، کە پێش دووسەد ساڵ بەهاکانی مۆدێرنیتەی سیاسیی بەرجەستەکرد، بەردەوام لەلایەن سێکوچکەی لیبرالیزم و پەرەپێدان و جیهانگیرییەوە پێشێلدەکرێت، ئەو سێکوچکەیەی دەبێتە مایەی بێکاری و هەژاری، یان گەندەڵی و تاڵانکاری، یاخود دوورخستنەوە و پەراوێزخستن، ئەمە سەرەڕای پیسبوونی ژینگە.

ئیمڕۆش دیموکراسی ئاستەنگ و کۆسپی هەمەجۆری لەبەردەمدایە: ئەو تاک جەمسەرییەی زلهێزەکان لە ڕووی دەستوەردانە گۆڕەپانی گەردوونییەوە پیادەیدەکەن، پێکدادانی ژیوارەکان، زاڵبوونی مەیلی تاکگەرایی، دیاردەی بایکۆتکردنی هەڵبژاردنەکان، جیاوازیی ترسناکی نێوان بەهەشتی دەوڵەمەندەکان و دۆزەخی هەژاران، گۆڕینی هاوڵاتی لە بوونەوەرێکی سیاسییەوە بۆ بەرخۆر، وەبەرهێن، یان ئەسپەردەکارێکی ڕووت... ئەوانە و چەندین کێشەی تر، کە وادەکەن قسەکردن دەربارەی سەرکەوتنی دیموکراسی جۆرێک ساویلکەیی یان چاوبەستەکی بێت.

## تیرۆر و پارە:

ئایا باسکردن و دەستنیشانکردنەکەم زیادەڕۆیانەیە؟ با لەئاست دوو مەسەلەدا هەڵوەستەبکەین:

**یەکەم** خراپبوونی ئاسایشە. ئەوەتا شارەکانمان شایەتی لەسەر ئەوە دەدەن، چونکە لەبەر زیادەڕۆیی ڕێکارە توندەکانی ئاسایش، بەو سەربازگانە دەچن کە بە تەلبەند و ئاستەنگ و دەرگاکەلی ئەلیکترۆنی تەنراون. ئەمە باری بارەگای سەرۆک و سەرکردە و ڕابەر و باڵوێزەکانە، بەڵکو باری دامەزراوە سیاسی و گەشتوگوزارییەکانیشە. لەبەرامبەر ئەم خراپبوونەی ئاسایشدا مرۆڤ دەپرسێت: سوودی ئەو هەموو سامان یان دروشمانە چین کە بەرزکراونەتەوە، جا پەیوەندییان بە ئەقڵ، ڕۆشنگەری، ئازادی و دیموکراسییەوە هەبێت، یان بە خوا، ئیسلام، مەسیحییەت، عەرەبایەتی و بەرگرییەوە؟!

دووەم پەیوەندیی بە قەیرانی دارایی بانقییەوە هەیە، کە بە تارماییەکەی جیهانی سەرمایەداری و لیبرالیستانەی داپۆشیوە، بەشێوەیەک کە قەیرانی ئابووریی جیهانیی بەناوبانگی ساڵی ١٩٢٩مان وەبیردێنێتەوە. چونکە کارینۆی تیۆریی و گریمانەیی (وەک ناویدەنێن) بەبەرچاوانەوە هەرسدێنێت، ئەمەش بەهۆی نەزانیی بکەران یان بەشداربوان بەرامبەر بە ئاڵۆزییە لەڕادەبەدەرەکانی پرۆسە بانقییەکان، یان بەهۆی بەدەستەوەگرتنی پارەی ناڕەوا، یاخود بەهۆی دزین و پێشێلکردنی سیستەمە داراییەکان، ئەمە وێڕای چاوچنۆکی بۆ بەدەستهێنانی قازانجی خێرا و دووقات...

بەهەرحاڵ، من پسپۆڕێکی دارایی نیم، بۆیە دەمەوێت لە ڕێگەی ئەو واقیعە گەردوونییە گریمانەییەی تیایدا دەژین و واقعێکی خێرا و بێهاوتایە، شرۆڤەی قەیرانەکە بکەم. کاتی خێرا مانای بێکەڵکیی ڕێکارەکان و ئامرازەکانە، پێش ئەوەی لەسەر زەوی و ناو گۆڕەپانەکەدا بەری خۆیان بدەن. واقیعی بە کەرەستە و تەکنیک بێهاوتاش مانای پیواری (غیابی) جیهانە لەژێر هێما و سمبولە سنووربڕ و کیشوەریپەکاندا و لە ڕێی تەلەفزیۆن و کەناڵەکانەوە. ئەمەش دەبێتە مایەی زاڵبوونی نەرمەبەرهەم بەسەر قورسەبەرهەمدا، هەتاکو بوار بۆ پیادەکردنی جۆرێک بازرگانیی ئەلیکترۆنی بخوڵقێنێت، کە دەبێتە هۆی دووقاتکردنی ئەو قازانجە بێشومارەی بەبێ ماندووبوون بەدەستدێت.

ئەمەش سەیرنییە، چونکە وەک بۆی دەچین و بەخەیاڵ بەمێشکماندا دێت، کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی، بەهەشتەکانی ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری نین، بەڵکو هەمیشە دژەیاسا بەرهەمدێنن و ئەو شتانە دێننەئاراوە کە دەبنە مایەی پێشێلکردنی ڕێسا و پرنسیپەکان، یان سوانی مۆدێل و ئامرازەکان. لەبەرئەوەی بەرامبەر بە یەکسانیی ڕووت جیاوازی و دوورخستنەوە هەیە، بەرامبەر پەرەپێدان تاڵانکردن و بەهەدەردان هەیە، بەرامبەر ئازادیی دەربڕین میکانیزمەکانی پەردەپۆشکردن و گەمەکردن و ساختەکاری هەیە، بەرامبەر ئازادیی بازاڕیش جیهانگیری و تیرۆر هەیە...

## بارودۆخی ئاڵۆز:

بەکورتی، ئەگەر حکومەتە دیکتاتۆرییەکان و دەستەگەرییە هۆزداریان تایەفەگەرییەکان ئەوانە بن کە لای ئێمە بیرۆکەی هاوڵاتیبوون تێکدەشکێنن یان دامەزراوەی دیموکراتی مینرێژدەکەن، لە ڕێگەی بەتاڵکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی یان گۆڕینی بۆ سیستەمێکی ستەمکاری یان دامودەزگایەکی هەواڵگری، ئەوا ئەوەی دیموکراسی لەسەر خاکەکەی خۆی (وڵاتە خۆرئاواییەکان) مینرێژدەکات، کۆمپانیا، بانق، کەناڵ، بازرگانیی ڕاپسکاو

لەهەر کۆتوبەندێک و ئەو تیرۆرەیە کە خراپتردەبێت و لەسەر ئاستی گەردوونی بڵاودەبێتەوە، بۆ ئەوەی هەڕەشە لە ئاسایشی هەموان بکات. چونکە ئێمە دەزانین ئیمڕۆ چەند کۆمپانیایەکی سنووربڕ یان چەند کەناڵێکی سەرکەوتووی وەها هەن، کە لە حکومەت و پەرلەمانەکان بەهێزترن، ئەمەش وایان لێ دەکات فێڵ لە دامەزراوە دیموکراتیەکان بکەن، یان کار بۆ تێپەڕاندنیان بکەن، لەسەر حسابی ئەو دامەزراوانە.

ئەم قەیرانە ئاوێتەیە، بە ڕووە هەمەلایەن یان نیشانە هاوبەشەکانیەوە، سەرەتا مانای ئەوەیە ڕەوتی جیهانی بەتەنیا بەس نییە بۆ شرۆڤەکردنی. لەلایەکی ترەوە مانای ئەوەیە هۆ و هۆکارەکانی قەیرانەکە پەیوەندییان بە سروشتی دیموکراسییەوە هەیە، هەروەها بە چوارچێوە و میکانیزمەکانیەوە، واتە بە بیر و پراکتیک بەیەکەوە. چونکە وەک فەیلەسووفەکان دەڵێن، کێشەی هەرشتێک لە چەمکەکە و بەکارهێنانەکەیدایە.

ڕوانینە مەسەلەکە لەم ڕوانگەیەوە دەریدەخات، بیرۆکەی دیموکراسی لەسەر بنچینەی ئاڵۆزی و پاردۆکس بنیاتدەنرێت، بەئەندازەی ئەوەی هەوڵدەدات بۆ پێکەوە کۆکردنەوەی ئەو ناکۆکیانەی بە ئاقاری دژیەیەک یان پێچەوانەدا دەڕۆن: ئازادی و یەکسانی، ئاسایش و مافەکان، مافە تاکەکەسییەکان و پرۆژە بەکۆمەڵەکان...

## ڕووەو دیموکراسیەکی کارا:

ئەو دوانانە هەمیشە بەشێوەی مینەکان یان شەیتانەکان کاردەکەن بۆ دروستکردنی قەیرانەکان، وەک ئەوەی لە فێڵکردن و لادان لە یاساکان یان چوارچێوە دیموکراتیەکان و پێشێلکردنیاندا بەرجەستەدەبێت.

لێرەوە پیادەکردنی دیموکراسی بەهەمان کەرەستەی کۆن یان باو و بەئەقڵی لاهوتیی ئایینی، یان مەیلی پاکیزەخوازی و فریادڕەسانە و تەنانەت لەسەر ئاستی ڕووت و یاساییش بێکەڵکە. ئەوەی ئێستا، لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانکاری و وەرچەرخانەکان و ئەنجامی تێکشکان و هەرەسهێنانەکان دەشێت بکرێت، سەرلەنوێ کارکردنە لەسەر بیرۆکەی دیموکراسی، بەشێوەی شیکردنەوەو پێکهێنان و تێپەڕاندن، لەپێناو کردنەوەی چەند ئاسۆیەکی نوێی کاری سیاسی بەڕووی زیاتر لە ئاراستەیەکدا و لە چەند ڕوویەکەوە:

١- تێپەڕاندنی دوانەی هەڵبژێر/ نوێنەر کە سواوە و کاریگەریی کەمە، بە مامەڵەکردن لەگەڵ تاک وەک شارەزا و بەرهەمهێن و بکەرێک، کە دەتوانێت کاریگەریی لەسەر بواری کارەکەی، ژینگەکەی، دەوروبەرەکەی و جیهانەکەی هەبێت و وزەی مێشکی خۆی بەکاربهێنێ و هێزە ئەقڵییەکانی خۆی بخاتە گەڕ،

نەک وەک ئیماندار یان هاوڵاتییەکی ڕووت. ئەمە دەستدانێکە ئیمڕۆ سەردەمی جیهانگیری و ئابووریی مەعریفە دەرفەتی بۆ دەرەخسێنێت.

٢ - تێپەڕاندنی دیموکراسیی ڕواڵەتکارانەی کۆماری یەکسانیی ڕووت لەبەردەم یاسادا، لە ڕێگەی فراوانکردنی چوارچێوە و میکانیزمەکانی دەربڕین و بەشداریکردن و دووقاتکردنی تواناکانی لێپرسینەوە و چاودێریکردنەوە، ئەنجامی گۆڕینی فەزای کۆمەڵگەیی بۆ ۆرکشۆپێکی هەمیشەیی و زیندوو لەپێناو دیالۆگ، وتوێژ، گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕکردن و لەسەر ئاستە جۆربەجۆرەکان و لە بازنە، بوار، کەرت و کەناڵە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگەدا. ئەمەش مەسەلەیەکە سەردەمی تۆڕ و کەناڵەکان دەیڕەخسێنن. چونکە چیتر کارەکانی لێپرسینەوە و چاودێریکردن چاوەڕێی سندوقەکانی دەنگدان ناکەن، بەڵکو ئەوانە بوونەتە کاری ڕۆژانە و دەکرێت لە ڕێگەی ڕۆژنامەگەری و لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندندا، یان لە ڕێگەی ئەو کۆڕانەوە ئەنجامبدرێن کە بوونەتە چالاکییەکی بەردەوام. بەوەش کۆمەڵگە دەگۆڕێت بۆ ڕووبەرێکی تاوتوێکردنی کاریگەریی دوولایەنە و کارلێککردنی بنیاتنەرانە، کە لەگەڵیاندا لە دیموکراسیی ناوەندی و دەستەبژانە و وەرزییەوە هەنگاو بەرەو دیموکراسیی ڕۆژانەی ئاسۆیی هەڵدەنێین، کە دیموکراسییەکی مەیدانی و بەشداریکارانەیە...

٣ - شکاندنی ئەقڵییەتی مۆدێل یان قاڵب، بەوپێیەی تاقە مۆدێلێک بۆ کاری دیموکراتی یان هەر بوارێکی تر بوونی نییە، چونکە ئەو مۆدێلانەی شوێنپێیان هەڵدەگرێت، لای ئەوانەی لێیاندەکۆڵنەوە و سوودیان لێ وەردەگرن، تەنیا چەند هاندەر یان بابەتێکن بۆ بنیاتنانی مۆدێلێکی نوێ لە ڕەوتێکی جیاوازدا. بەوەش لە دیموکراسیی ڕۆتینییەوە هەنگاودەنێین بەرەو دیموکراسیی کراوە، کە بزۆک و گەشەکردوە.

٤- ڕزگاربوون لە وەهمی پێکەوەگرێدانی میکانیکیانەی دیموکراسی و پەرەپێدان، چونکە پەیوەندیی پێویستخواز لەنێوانیاندا حەتمی نییە، بەوپێیەی پەرەپێدان لۆژیکی خۆی هەیە و بریتییە لە زیادکردنی بەرهەمهێنان و دووقاتکردنی سامانەکان، لەکاتێکدا دیموکراسی لۆژیکی خۆی هەیە و بریتییە لە پاراستنی مافەکان و مسۆگەرکردنی ئازادییەکان. هەندێک دەوڵەتی دیموکراتی چەسپیوو هەن (وەک فەرەنسا) کە ئەنجامی سوانی مۆدێلەکەی و کۆشش نەکردن بۆ نوێکردنەوەی، لە بواری پەرەپێداندا پاشکەوتووە. بەپێچەوانەشەوە، دەوڵەتی ناوەندخوازی وەهاش هەیە- وەک چین- کە لە بەرنامەی پەرەپێداندا سەرکەوتووە و بەدەوڵەتی دیموکراتی ناژمێردرێت. باشترە بە ئەقڵێکی ئاوێتە بڕوانرێتە مەسەلەکە، چونکە پەرەپێدان

بەپێویست نابێتە مایەی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، بەڵام دەشێت دەرفەتەکانی هاتنەدیی ئەو دادپەروەرییە بخولقێنێت. کتومت وەک چۆن دەشێت خستنەگەڕی ئازادیی بیرکردنەوە یاریدەدەربێت بۆ خولقاندنی دەرفەتەکانی پەرەپێدان، بەئەندازەی خستنەگەڕی هێزە زیندووەکانی کۆمەڵگە.

٥ - کرانەوە بە ڕووی دەرەوەدا، لە ڕێگەی چەند دامەزراوەیەکی هەرێمایەتی و دامودەزگایەکی نێودەوڵەتیی ئاشتیخواز و مەدەنیانەوە، کە بایەخدەدەن بە بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ و داکۆکیکردن لە ئازادییە دیموکراتیەکان، چونکە چیتر لە سەردەمی تێکهەڵکێشیی چارەنووسەکان و بەرژەوەندییەکان و بەجیهانیبوونی جەنگ و شوناسەکاندا، دەرفەت بۆ گۆشەگیری نەماوەتەوە. لێرەوە دەستوەردانی دەرەوە لە کاروباری ناوخۆ مافێکی ڕەوایە.

بەوجۆرە چەند ئاسۆیەکی نوێ بۆ فیکری سیاسی لەناو کایەکانی کارکردن و بەشێوەی ئاسۆیی و شاقوڵی، ناوەکی و دەرەکی دەرەخسێت، ئەمەش دەرفەت بۆ دیموکراسی دەرەخسێنێت، هەتاکو دەوڵەمەندبێت و نوێبێتەوە، یان بەهێزبێت، جا ئەوە بەکرانەوە بێت بەڕووی فەزای کۆمەڵایەتیدا، بەهەموو هێز و چالاکی و دامەزراوە ئەهلی و مەدەنی و سیاسییەکانەوە، یان بەکرانەوە بێت بەڕووی دەرەوەدا، لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە لە گفتوگۆ جیهانییەکانی ناو دامودەزگا و دامەزراوە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکانەوە. بەوەش دەرفەت بۆ گۆڕانکاری ڕەوو دیموکراسییەکی نوێی کارامەتر و دینامیکیتر و بەکوالێتی باشتر و ئەزموونگەرتر و جیهانیتر دەرەخسێت.

## دیموکراسی پرۆسەی زیندوو و خولقێنەری خۆیەتی:

پوختەی قسە: جیهان لە ڕووی چەمک، پێوانە، دامەزراوە، بزوێنەر، نەخشە و گەمەکارەکانیەوە لەسەر شانۆکەی، وەک خۆی نەماوەتەوە، بەڵکو هەمووشتێک لەگۆڕاندایە، بە مرۆڤ و سروشت و زەویشەوە. هەمان شت بۆ دیموکراسیش ڕاستە، کە لە ڕووی بیر و کردارەوە لەگۆڕاندایە، بەتایبەتی ئەنجامی قەیرانە یەک لەدوای یەکەکان، یان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەددا و گۆڕانکارییە دەرەکی و ناوخۆییە کتوپڕ و بونیادییەکان. ئەمەش وامان لێدەکات چەمک و شێوازەکانمان بگۆڕین، جا لە ڕووی توخنکەوتن و دەستنیشانکردنەوە بێت، یان چارەسەر و تەگبیرکردنەوە. وەک چۆن پاڵمان پێوە دەنێت بۆ کەمکردنەوەی بانگەشە تەوباوییەکان و دەستبەرداربوونی ئەو بانگەشە ئایدیالیستیانەی پەیوەندییان بە کاریگەرییەکانی سیستەمی دیموکراتییەوە هەیە.

کەواتە ئێمە لەم سەردەمەدا چاوەڕوانی بەهەشت نین، چونکە بەهەشت لەسەر ئەم

زەوییە نییە، ئەوەی دەتوانین پێی بگەین، بنیاتنانی دانوستان و رێککەوتننامەیە، کە سازش و ئاشتبوونەوەن.

چاوەڕوانی چارەسەرە لەڕادەبەدەرەکان نین، هەتاکو بەهۆی واقیعەوە دڵشکاوو بێهیوا نەبین. لێرەوە دیموکراسی هەمیشە گرێدراوی ئەوە دەبێت کە بیری لێ دەکەینەوە یان دەیکەین، بەو واتایەی دیموکراسی نەشونمای چەمکەکەیەتی لەسەر ئاستی فیکر، بەئەندازەی ئەوەی بەری چەند ئەزموونێکی بێوێنە و دەوڵەمەندە، لەسەر زەمینەی واقیعی مرۆڤانەی هەمیشە مینرێژکراو بە هەوەس و تەماعکارییەکان، یان نەزانی و بیرچوونەوە، یاخود هەڵخەڵەتاندن و خەیاڵپڵاوییەکان.

بێگومان دیموکراسیی نوێنەرایەتی: دیموکراسیی دەنگدان و پەرلەمان، دەستکەوتێکە دەیپارێزین و شتی تری لەسەر بنیاتدەنێین، بەڵام چیتر بەس نییە، بەڵکو بۆتە شتێکی لەخشتەبەر و پەککەوتە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو گۆڕانکاریانەی ڕوودەدەن، یان هێزی کۆمپانیا و کەناڵ و بکەرە نوێکان (پارەدار و بزنزمانە نوێکان، ڕاگەیاندنکار و ئەستێرەکانی لە هەر پۆل و شێوەیەک) لەسەر شانۆ. ئەمەش دەرفەتێکی ڕەخساوە بۆ عەرەب، هەتاکو بچنە ناو گفتوگۆی جیهانییەوەو بەشدارییەکی بنیاتنەرانە و بەرهەمداریان هەبێت لە گەشەکردنی چەمکی دیموکراسی و کردنەوەی تواناگەلی نوێ لەبەردەمی کاری دیموکراتیدا.

## سەرچاوەکان:


1. بـيار روزانفالون، العالمية الديموقراطية، تاريخها ومشكلاتها، مجلة اسبري (Esprit)، عدد كانون الثاني، 2008.
2. روبـرت رايخ، الديموقراطية رداء الرأسمالية الفائقة، حوار أجراه معه لكزافييه دي لافيغا، في مجلة "العلوم الإنسانية"، العدد 191، آذار، 2008.
3. كاترين هلبان، هل الديموقراطية في أزمة؟ مجلة "العلوم الإنسانية"، العدد 192، نيسان، 2008.
4. مارسـيل غوشـيه وبـيار مانيه، معاودة التفكير في الديموقراطية، حوار أجراه معهما بيار سيمون ناحوم، في مجلة "Le Magazine Littéraire"، العدد 472، شباط، 2008.
5. لجنة تحرير النموّ في فرنسا، كتاب مشترك برئاسة جاك أتالي.
6. علي حرب، تواطؤ الأضداد، الإصلاح والتجديد، المصدر السابق.

# ئیجتیهادکردن و ڕەخنەگرتن

## گرەوەکانی نوێکردنەوە(١)

**پرسیاری نوێکردنەوە:**

کۆبوونەوەمان بۆ تاوتوێکردنی گرەوەکانی نوێکردنەوە لە جیهانی عەرەبدا مانای چییە؟

خوێندنەوەم بۆ ناونیشانەکە دەڵێت قەیرانێک هەیە، ئەگەر نەڵێین کارەساتێک هەیە. پێویستیش بە بەڵگە ناکات، چونکە دەبینین ئەو وڵاتانەی لە ڕووی باروتۆخی پاشکەوتنەوە بە وڵاتە عەرەبییەکان دەچوون، یان لە دوای ئەوەوە بوون، پێشدەکەون و گەشەدەکەن، بۆ ئەوەی پێشمان بکەون. لێرەوە چیتر پرسیارەکە ئەوەی سەردەمی ڕێنسانس نییە: بۆچی خۆرئاواییەکان پێشکەوتن و موسڵمانەکان پاشکەوتن؟ خۆرهەڵاتی و ئاسیایی و بگرە موسڵمانی وەهاش هەن کە پێشدەکەون، جگە لە عەرەب (بێجگە لە وڵاتانی کەنداو) کە سەرسمدەدەن، بەڵکو هەندێک وڵاتی عەرەبی پاشەکشەیەکی ترسناک یان تۆقێنەر لە زیاتر لە بوارێکدا، بەتایبەتی بواری ئاسایش، بەخۆوە دەبینن.

من لە وڵاتێکەوە هاتووم کە بە سویسرای خۆرهەڵات ناویاندەبرد، لە شارێکەوە هاتووم ناویان نابوو بووکی شارەکان، یان خانمی دنیا، کەچی بۆتە سەربازگەیەکی تەنراو بە شریتی زەرد و بەربەستی کۆنکرێتی و چوارچێوەی ئاسایشئامێز. لەپشت ئەوانەشەوە ئەو بەربەستە سمبولییانە هەن، کە لە ئەقڵە مینرێژکراوەکان و دەروونە زیانپێکەوتوو و دەردەدارەکاندا دانراون. وەک ئەوەی لەو وتارە ئاگرینانەدا گوزارشتی لێ دەکرێت کە حوکمی لەسێدارەدان دەدەن بەسەر ئەویتردا، هەتاکو فیتنە مەزهەبییەکان و شەڕەکانی ناوخۆ بچێنینەوە. ئەمەش باری زیاتر لە وڵاتێکی عەرەبە، کە نییەتە شەڕانگێزەکان و خەونە شێتەکان و بانگەوازە مەحاڵەکان و ستراتیژە کوشندەکان مینرێژیدەکەن. بەئەندازەی ئەوەی تەنهاییخوازی و ویستی بەخوابوون کۆنترۆڵیدەکەن، بۆ بەرهەمهێنانی ئەو هەموو لێکدابڕان و نوشوستیهێنان و دڕەندەییە.

بۆیە زۆرجار دەپرسم یان پرسیاردەکەمەوە: ئەو ناونیشانانەی بەرزدەکرێنەوە سوودیان چییە، ئەگەر ململانێ دەربارەیان ببێتە مایەی ئەو هەموو تەنگژە و کەمین، یان دەردەسەری و کارەساتانە، جا ئەوانە دەربارەی خوا، ئیسلام، مەسیحییەت، عەرەبایەتی و بەرگری بن، یان سەبارەت بە مرۆڤ، ئەقڵ، ئازادی، سەروەری و نیشتمانپەروەرین؟

بەهەرحاڵ، ئەگەر قەیرانێک لەئارادابێت، ئەوا لە خەوشی یان لەکارکەوتنێکدا دەبینرێ، کە ئاستەنگ بۆ پرۆژەکانی نوێکردنەوە دروستدەکات، بەئەندازەی ئیفلیجکردنی وزە زیندووەکان لەئاست خوڵقاندن و داهێناندا، بەئەندازەی دروستکردنی ئاستەنگ بۆ پرۆسەی ئازادی و گۆڕانکاری، بۆ ئەوەی رێگە لەوە بگرێت کۆمەڵگە عەرەبییەکان ئەوە بهێننەدی و ئەنجامبدەن کە خۆیانی پێ دروستدەکەن و بەو نموونانەی پەرەپێدان، یان شێوازانەی حوکمڕانی، یاخود شێوانەی پێکگەیشتن و ئاڵوگۆڕکردن بەشداریی لە دروستکردنی ژیانی هاوچەرخدا بکەن، کە سوودبەخش، یان سەرکەوتوو، یاخود بەنرخن.

## حەشارگەی خەوشییەکە:

خەوشییەکە لەکوێدایە؟

من لەگەڵ لێکدانەوەی یەکلایەنەدا نیم، بەڵام وەک کارکەرێکی لقێکی مەعریفی لە کایەیەکی تایبەتمەندەوە دەچمە ناو کێشەکەوە، هەتاکو بڵێم کێشەکە بەپلەی یەکەم لە چەمکەکاندایە، کە پێداویستیی دروستکردنی فەلسەفەن. کۆمەڵگە عەرەبییەکان کەلەپورێکی دەوڵەمەند و سامانێکی بێشوماریان هەیە، بۆیە پێویستیان بە یارمەتییە دەرەکییەکان نییە. دەرهاویشتەی زۆر و زەبەندیان هەیە، لەبەرامبەر کەمیی ترسناکی ئەو بیرۆکانەی بەپیت و داهێنەرن.

لەم دەروازەیەوە، دەبینم لەکارکەوتنەکە لە داخرانی ئەقڵەکان و پەرستنی مۆدێل و رەچەڵەکەکاندایە.

یەکەم لای دیناسۆرەکانی کەلەپوور، کە بوونەتە نێچیری دەردی هەڵبژاردەخوازی، ئەوەی وامان لێ دەکات پێمانوابێت خوا هەڵیبژاردووین بۆ ئەوەی پەیام و بڕیارەکانی بەجیهان بگەیەنین و باشترین میللەتین هاتبێتینەئاراوە و شەریعەتەکەمان هەموو وەڵامەکان و چارەسەرەکانی گشت پرسیارەکانی سەردەم و کێشەکانی واقیعی پێیە. واتە ئێمە بەتەنیا کلیلەکانی حەقیقەت و رێی راست پیشاندان و بەختەوەریمان بەدەستەوەیە، کەچی دەبینین لە پەراوێز و ریزی دواوە راوەستاوین.

ئەم دەردە ئیمڕۆ لای فەندەمەنتالیستە جیهادخوازەکان و خاوەنەکانی دروشمی «ئیسلام چارەسەرە» ڕاگیداکوتـاوە، ئەوەش لە ڕێگـەی پڕۆژەکانی حوکمڕانیی خواوەندانە، حکومەتی ئیسلامی، ویلایەتی فەقیهە، یان دادگا ئیسلامییەکانەوە، کە جیهادخوازەکانی سۆماڵ دەوڵەتەکەی خۆیان پێ ناونا. ئەوەش دەردی نەرجسیبوونی ئایینی کوشندە و وێرانکارە، کە بەشێوەی شەڕە ناوخۆییەکان یان تیرۆر گوزارشتی لێ دەکرێت و هەناردەی جیهان دەکرێت.

ڕووی دوەمی دەردی نەرجسیبوونی ئایینی، سـەربازگیریی ئایدیۆلۆژیانەیـە کە لای پەککەوتەکانی مۆدێرنیتە دەبینرێت و چاکترە بڵێین لای منداڵەکانی مۆدێرنیتە بەدیدەکرێت، ئەوانەی بەشـێوەیەکی تەقلیدی و منداڵکارانە و دۆگماییانـە خۆیـان هەڵواسیوە بە مۆدێرنیتەی سەرەتا و ناونیشان و نموونەکانیدا، چونکە زۆربەی مۆدێرنیستەکان وەک پۆلیسی پاسـەوانیی بیرۆکەکان کاریانکردوە و گۆڕیویانە بۆ چەند بتێکی تیۆری و چەند زاتێکی پیرۆز، بەو شێوەیەی مامەڵەیان لەگەڵ وشەکانی ئەقڵانیەت، ڕۆشنگەری، عەلمانیەت و ئازادیدا کرد. بۆیە دەیانبینین وا بەخەیاڵیاندا دێت کە داهاتوی عەرەب وەک ڕابردووی ئەورووپای پێش سێ سەدە دەبێت، لەکاتێکدا هەمووشتێک ئیمڕۆ ملکەچی گۆڕانکاری و گۆڕانە، چونکە جیهان بە چەمک و بەها و سیستەمەکانیەوە دەگۆڕێت، وەک چۆن کۆمەڵگە و ڕووناکبیری و مۆدێرنیتە، بەڵکو خودی مرۆڤ و سروشت، گۆڕانیان بەسەردا دێت.

ئەو سـەنگەرلێدانە لەپشـتی دروشـمەکانەوە، وای لـە مۆدێرنیسـت کـردوە دەستەوسان بێت لەئاست نوێکردنەوەدا، واشی لێ کردوە ببێتە پڕوپاگەندەکار و مژدەبەخشێکی ڕووت، کە بەشێوەیەکی کورتکراوە و هەژار یان نەزۆک چەمکەکانی خۆی دووبارەدەکاتەوە. بەوەش مۆدێرنیتەیەکی فەندەمەنتالیستانە پیادەدەکات کە ڕووەکەی تری فەندەمەنتالیزمی کەلەپوورخـوازە. ئاکامیش پشـێوی و کارە تاریکیخوازەکان و ڕژێمە ستەمکارەکان و ڕەگداکوتانی دەستەگەرییە تایەفەگەر و ڕەگەزپەرستەکانە، کە بیرۆکەی هاوڵاتیبوون تێکدەشکێنن و دەوڵەت و دامەزراوەکانی وێرانـدەکـەن.

## بکەرە نوێکان:

ئایا ئەوە مانای ئەوەیە جیهانی عەرەبی دەکەوێتە دەرەوەی خولگەی نوێکردنەوەوە؟

بەپێچەوانەوە، بکەرەکانی کۆمەڵگە عەرەبیەکان لە سەردەمی ڕێنسانسەوە و بەبێ بانگەشەکردن، یان تیۆریزەکردن، یاخود ڕاگەیاندن لە بوارەکانی شارەزاییو کەرەتەکانی

بەرهەمهێنانی خۆیاندا کەوتوونەتە نوێکردنەوەی ژیان. ئەمەش ئەوەیە کە ئێستا بزنزمان، پاردار، ڕاگەیاندنکار و خاوەن بانق و کۆمپانیا و کەناڵەکان، یان ئەستێرەکانی هونەر و گۆرانی و تۆپی پێ دەیکەن. هەروەها ئەو هونەرمەند و شاعیر و ڕۆماننووس و بیناسازانە دەیکەن، کە زۆر بایەخ بە تیۆریزەکردن یان ڕەسەنایەتی نادەن. جا ئەگەر قەیرانێک یان ئاستەنگ لەئارادابێت، ئەوا لای بانگەشەکارانی مۆدێرنیتە و خاوەن پرۆژەکانی ڕۆشنگەری و نوێکردنەوە و گۆڕین بەرجەستەدەبێت، کە خۆیان سەرچاوە و یەکێک لە نیشانەکانی قەیرانەکەن.

بۆیە ئیمرۆ خەڵکانێک دەبینینەوە خاوەن نازناوی فیکریی گەورە نین و بەشێوەیەکی زیندوو و نوێبوەوە، داهێنەر و بەرهەمدار، لێهاتوو و هەنوکەیی مامەڵە لەگەڵ بیرۆکەکانی کارەکەی خۆیان دەکەن، لەکاتێکدا بیریار و تیۆریست و خاوەن پرۆژە و هەڵگرانی دروشمەکان دەبینین، کە لە ڕووی توانای تاوتوێکردنەوە بۆ خولقاندنی چەند ڕووبەرێکی پێکگەیشتن و تاوتوێکردن و ئاڵوگۆڕکردن، یان لە ڕووی وزەی خولقاندن و داهێنان و نوێکردنەوە و گۆڕینەوە لەپێناو پێشکەوتندا مامەڵەیان لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆیان نەکردوە، بەڵکو بە لۆژیکی فەندەمەنتالیستانەی پاشەکشەخوازی هەڵگەڕانەوەخواز مامەڵەیان لەگەڵ کردوە، هەتاکو ئەو تێکشکان و پاشەکشە و هەرەسهێنانانە بچنینەوە کە هاتوونەتەئاراوە.

## بانگەشەکارانی مۆدێرنیتە نوێکردنەوە دروستناکەن:

ئەمەش پارادۆکسە ئابڕووبەرەکەیە بە ڕوو هەمەجۆرەکانییەوە:

ڕووی یەکەم، ئەو ڕووناکبیرەی وەک بکەرێکی مێژوویی و هەڵگری ئاڵای گۆڕان و پێشکەوتن و ئازادی و داهێنان ڕەفتاریکردوە، بەراورد بە بکەرە نوێکانی سەر شانۆی گەردوونی، کەوتۆتە پەراوێزی کاری مێژووییەوە، بەڵکو پاش ئەوەی شۆڕشگێڕ، لیبرالیست، ڕیفۆرمیست یان پێشکەوتنخوازبوو، ئێستا بۆتە موحافەزەکارێک کە لە گۆڕانکارییەکان دەترسێت. لێرەوە ئەو بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی جەماوەرێک دەکات کە دژی هەڵدەگەڕێتەوە، یان بانگەشەی نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵگەیەک دەکات کە بایەخ بەوە نادات ئەو دەیڵێت، بەڵکو بۆ خۆی کەوتۆتە پەراوێزی کۆمەڵگەوە.

ڕووی دوەم، کارەکانی نوێکردنەوە و بەرنامەکانی پەرەپێدان لە شوێنێکدا سەرکەوتووبوون کە چاوەڕوان نەدەکرا. ئەمە لە شوێنێک زیاتر ڕوویدا، وەک سەنگافورە، یان چین، یاخود مالیزیا، ئێستاش لە تورکیا ڕوودەدات. لەبەرامبەردا بەرنامەکانی نوێکردنەوە لەسەر دەستی خودی بانگەشەکارەکانی خاوەن پرۆژە

چەپڕەو و ناسیونالیست و ئیسلامیەکان لەو شوێنانە شکستیانخوارد یان سەرسمیاندا، کە پێویست بوو بەری خۆیان بدەن. زیادەڕۆنیم و زولّمیش ناکەم، چونکە هەموو ئەو دروشم و پرۆژانە لەو وڵاتانە شکستیانخوارد کە خاوەن دروشمی ناسیونالیست، یان چەپڕەو، یاخود ئیسلامی حوکمڕانیدەکرد. ئەمەش وای لێ کردم بڵێم، ترسم لێ نیشتوە کاتێک دەبینم مالیزیا هەندێک بیریاری عەرەبی بانگکردوە بۆ وانەوتنەوە لە زانکۆکانیـدا.

ڕووی سێیەم، ڕووناکبیری مۆدێرنیسـت گەیشـتۆتە هەڵگەڕانـەوە لە پرۆژەکانی خۆی، لەپێناو پیادەکردنی ئەو پرۆژانەی خۆی لـە بنەڕەتدا داوای دەرچوون لێیانی دەکـرد، یان پشتگیریکردنی ئەو سـیسـتەمانەی خـۆی و هاوشـێوەکانی کاریان بۆ ڕەتکردنەوەی دەکرد. لێرەوە ئیمڕۆ دەبینین هاوپەیمانێتیی چەپڕەو و ناسیونالیست و ئیسلامی لەژێر ئاڵای ئەو فەقیهەدایە کە پرۆژەکەی لەسەر بنچینەی دوورخستنەوە یان ڕیشەکێشکردنی مۆدێرنیستەکان دادەمەزرێت. ئای چ کۆتاییەکە ڕووناکبیری ئەقڵانی و ڕۆشنگەر و عەلمانی پێیگەیشتوون.

بێگومان ئەوانـە هاواردەکـەن و بیانـوو دەهێننـەوە بـۆ ئەوەی لایەنگری هێزە ناقابیلەکانە، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەوەی پێیدەڵێن هەڵمەتی داگیرکارانە یان هەژموون لە ژێر ناونیشانەکانی بەخۆرئاواییکردن، یان بەجیهانیکردن، یاخود بەئەمریکاییکردندا. ئەمەش پارادۆکسە مەزنەکەیـە، چونکـە ڕژێمـە ناقابیلەکان لە زۆربەی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا، لەگەڵ ئەو کۆمەڵگـە و کولتوورانـەی لە پشتیانەوەن، جگە لە وێرانکردنی سەرچاوەکانی هێز و بەرگریکردن لای میللەتەکانیان شتێکی تر ناکەن، چونکە ئەوانە سڵ لە خۆپیشاندانێکی بچووک، یان بەیاننامەیەکی ڕووناکبیران، یاخود ڕەخنەی بیریارێکی ئایینی و پیاوەکانی دەکەنەوە، یان یاساکان پەکدەخەن و ئازادییەکانی بیرکردنەوە و دەربڕین و ڕێکخستن زەوتدەکەن، کەواتە چۆن هێزی ناقابیل دەبن!!

دوا ڕووی پارادۆکسەکە، وێڕای ئەو هەموو تێکشـکانە، هێشـتا بانگەشەکارانی نوێکردنەوە خۆیان بە نمایندەی کاروباری گشتی دەزانن. بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە، ئێمە لە کۆڕ و دیدارە فیکرییەکاندا کە مەسەلەکانی نوێکردنەوەیان تیادا تاوتوێدەکەین، ئەو کەرتانەی تر دووردەخەینەوە کـە بەشێوەیەکی بەرهەمهێن و هەنوکەیی کاران. واتە ئەوانە دووردەخەینەوە، کە لەسەر زەمینەی واقیع لە ئێمە مۆدێرنیستترن.

پوختەی قسەکە: کێشەی مۆدێرنیست ئەوەیە، هەرشتێک ئەو بە چارەسەرکەی داناوە کێشەیە. ئەو بانگەشەی پێشڕەوایەتیی کۆمەڵگەی کرد، کەچی وا دەکەوێتە

پەراوێزەوە. ئەو بانگەشەی ئەوەی کرد هۆشمەندە و ئاشنای یاساکانی واقیع و مێژووە، کەچی نەزانیی ئاوێتەی بەرامبەر بە خۆی و واقیع و جیهان ئاشکرابوو. ئەو خۆی وەک بەرجەستەکاری بەهاکانی حەقیقەت و ئازادی و دادپەروەری خستەڕوو، کەچی تەنیا لە پێشێلکردنی ئەوانە لە زەمینەی واقیعدا باشبووە.

ئایا زیادەڕۆیی دەکەم؟

با بڕوانینە چارەنووسی ئەو بیرۆکانەی بەرزمانکردنەوە یان پیادەمانکردن، با وێنای ئاکامی ئەو ئیجتیهادە بکەین کە شانازیمان پێوە دەکرد، یان ئەو مۆدێرنیتەیەی دەمان پەرستن، یاخود ئەو ئازادییەی عاشقیبووین.

## لە ئیجتیهادەوە بۆ جادووگەری:

ئاشکرایە وشەی «ئیجتیهاد» لە وشەی کۆشش وەرگیراوە، کە مانای وزە و فراوانبوون، یان تێکۆشان و ڕەنجکێشانە بۆ گەیشتنە مەبەست دەربارەی مەسەلەیەک. ئینجا ئیجتیهاد گۆڕانی بەسەردا هات، بۆ ئەوەی ببێتە زاراوەیەک بەمانای فراوانبوون یان تەرخانکردنی کۆشش بۆ ئەو مەسەلانەی حوکمڕان پەنایان پێ دەبات، بەمەبەستی گێڕانەوەی مەسەلەکان بۆ قورئان یان سوننەت، چونکە ئیجتیهاد لەکاتی بوونی دەقەکەدا بوونی نییە.

لێرەوە ئاولێنانەکە زیاتر لە بواری فیقهدا بەشێوەیەکی تایبەتی باڵادەستبوو، واتە نازناوی ئیجتیهاکار زیاتر درایە فەقیهـ، نەک نوێکەرەوە، یان قسەکەر، یاخود فەیلەسووف... ئەمە بەواتای سنووورداری وشەکە، بەڵام ئیجتیهاد بە مانا هەرە فراوانەکەی، تەنیا لە بواری فیقهدا گیری نەخوارد، بەڵکو لە فەزایەکدا، کە تەوەرەکەی خوێندنەوەی دەقی نێردراوە، ستراتیژێکی فیکریی کامڵی پێکهێنا بۆ دروستکردنی دەستدان و هەڵهێنجانی، لە ڕێگەی کارکردنی ئەقڵ و پیادەکردنی زیندوێتیی فیکرەوە.

بەوجۆرە ئیجتیهاد ئامرازی ڕوانین، یان میتۆدی لێکۆڵینەوە، یاخود دەرگایەکە بۆ مەعریفە، جا ئەوە لە کارپێکردنی داوەرییەکاندا بێت بەسەر دەقەکاندا، یان هەڵهێنجانی داوەرییەکان بێت لەوانەوە کە لە دەقەکاندا نەهاتوون، یان لە شرۆڤەکردنی دەقەکاندا بێت کە جێی ناکۆکی و گومانپێکردنە، یاخود تەنانەت لە سەرچڵییەکان و دەروازەکردنەوەکانی ئەقڵدا. ئینجا مەسەلەکە کۆتاییهات و دەرگاکانی ئیجتیهاد داخران، ئەوەش لەگەڵ داخرانی ئەقڵەکان و زەوتکردنی ئازادیی بیرکردنەوە و دامرکانەوەی دینامیکیەتی بوونخوازانە و کپبوونەوەی ئەو پەرۆشە

خولْقێنەرەی عەرەب لەگەڵیدا پەراوێزبوونی جێهێشت، بۆ ئەوەی بەدرێژایی چەندین سەدە پێشەوای کار ژیواری و بەرهەمهێنانی زانستی بن.

مەسەلەکە لەو ئاستەدا ڕانەوەستا، بەڵکو پاشگەزبوونەوە و گەڕانەوە بۆ دواوە هاتەئاراوە، چونکە لەبری تێکۆشان و ئیجتیهادکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەحەددا ژیوارییە نوێکان و نوێکردنەوەی ئەو زانستانەی دەوروخولی دەقی نێردراویان داوە، لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی زانینەکان دەربارەی واقیع و جیهان، یان دەق و بنەڕەتەکانەوە، دەبینین ئیمڕۆ ئەو فەتوایانە دەردەکرێن کە ناومان دەزڕێنن، وەک فەتوای بارۆکە، یان پیرۆزبوون بە خواردنەوەی میزی پێغەمبەر، یان شیردان بە گەورە. هەروەها دەبینین، بەبێ هیچ ئابڕوویەکی ئەخلاقی یان سڵەمینەوەیەکی فیکری، زانینەکانی ئەو زانایانە بەتاڵاندەبرێن کە بە ئەقڵ و تاقیکردنەوەی خۆیان بەرهەمیانهێناون و گێڕانەوەیان بۆ قورئان، وەک ئەوەی ئەو بانگەشەکارە نوێیانە دەیکەن کە چەندین جۆری جادووگەرێتی فیکری لە لێکدانەوە «زانستییەکان»ی دەقی قورئاندا ئەنجامدەدەن. ئای کە شەرمەزارین بەرامبەر بە شافعی و جرجانی و خوارزمی.

بەوجۆرە ئێمە زۆر باسی ئیجتیهادی کراوە دەکەین، بەڵام بێئاکام بووە، چونکە نە لە کایەکان یان میتۆدەکان و نە لە مەزهەب یان مەبەستەکاندا، هێشتا نوێکاریمان نەکردوە. ئەمەش کاریگەریی نەرجسیبوونی ئایینی کوشندەیە: زانا دەگۆڕێت بۆ بانگەشەکار، لێکدەرەوە دەگۆڕێت بۆ جادووگەر، فەتوا دەگۆڕێت بۆ ئابڕووچوون، بانگەواز دەگۆڕێت بۆ تیرۆر. ئەمەش وامان لێ دەکات بەشێوەیەکی هەژارانە، بێدەرەتانانە، ڕەقهەڵاتوانە، شەڕانگێزانە و کاریکاتۆرانە شوناسەکەمان پیادەبکەین، هەتاکو ناومان لە جیهاندا بزڕێت، دوایش تۆباڵی ئەوە بخەینە ئەستۆی جیهان.

## دینامیکییەتێکی نوێ:

کەچی لەکاتێکدا فەزای فیکری لە جیهانی ئیسلامیدا لەگەڵ (ئیبن خەلدون) وەک زانا لە تێکڕای کۆمەڵگە و مێژوو و ژیواردا، یان لەگەڵ (سەدرەدین شیرازی) دوا فەیلەسووفی گەورە پاش چەندین سەدە بوژانەوەی فیکری بەرەو داخران دەچوو، مرۆڤایەتی لە شوێنێکی تر، کە پێمانوابوو خەڵکەکەی لەپاش ئێمەوەن یان لە خولگەی حەقیقەت، ئیمان، باشە، چاکەکاری و مرۆڤایەتی دوورماندەخستنەوە، لە جیهانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دێنە ناو سەدەی نوێمانەوە، بۆ خستنەگەڕی وزکشۆپی کاری ژیواری. بەوجۆرەش فەزایەکی فیکریی نوێ و جیاواز سەریهەڵدا کە دروشمەکەی مرۆڤ، ئەقڵ، یاسا، دەوڵەت، هاوڵاتی، تاکی داهاتوو بوو،

پێش ئەوەی خوا، دەق، بڕوا، تایەفە، فەتوا، وەلا یان گوێڕایەڵی بێت... کە لە دینامیکییەتی بوونخوازی هەمەلایەندا، بە وێستگە، شەپۆل و شۆڕشە ئەقڵی، تەکنۆلۆژی، پیشەسازی، سیاسی و کۆمەڵگەییەکانیەوە، بەرجەستەبوو... ئەمەش ئەوەیە کە لە سەردەمی ڕێنسانسەوە دەستیپێکرد و گەیشتە سەردەمی کلاسیک، سەردەمی ڕۆشنگەری، سەردەمی پێشکەوتن، هەتاکو گەیشتە سەردەمی شۆڕش و بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی و سیاسی لە سەدەی بیستەمدا.

ئیمرۆ لەگەڵ چوونە ناو سەردەمی کاتی هەنوکەیی و زانیاریی دیجیتاڵ و واقیعی گریمانەیی و نەرمەهێزەوە، مرۆڤایەتی کەوتۆتە ناو شەپۆلێکی ژیاریی نوێوە، کە واقعێکی گەردوونیی خێرا بە جوڵە و ڕیتم و بەیەکداچوو لە شوێن و دەوڵەتەکاندا، بێهاوتا لە ڕووی کەرەستە و ئامرازەکانیەوە، ئاڵۆز لە ڕووی کێشە و گرفتەکانیەوە، قەیراناوی لە ڕووی مانا و بەهاکانییەوە، هەڕەشەلێکراو لە ڕووی ئاسایش و سەلامەتییەوە پێکدێت. وەک ئەوەی تێکهەڵکێشیی بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان لەسەر گۆڕەپانی گەردوونی دەیخاتەڕوو. هەروەها پێکدادانی نێوان پرۆژەکانی ئیمپریالیزم و زلهێزەکان لەلایەک و هێزە فەندەمەنتالیستەکان و ڕێکخراوە تیرۆریستەکان لەلایەکی ترەوە کڵپەدەستێنێ.

## ستراتیژی ڕەخنەگرانە:

ئەگەر ئیجتیهاد شێوەی پاشایانەی ژیاری عەرەبی پێکهێنابێت بۆ گەڕان بەدوای مانا، یان دەرککردن بە حەقیقەت، یان بنیاتنانی حوکمڕانی، یاخود بەرهەمهێنانی مەعریفە، ئەوا ڕەخنە بەمانا نوێ و نوێترەکەی شێوەی ستراتیژی فیکری و پاشایانەی لە فەزای ژیاریی نوێدا پێکهێناوە، وەک کارکردنێکی بەردەوام لەسەر دەرهاویشتەکانی بوون و پێشهاتەکانی ژیان، بەهۆی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە، یان توێکاری و هەڵوەشاندنەوەوە، بەمەبەستی تێپەڕاندن و بەزاندن، یان پێکهێنان و بنیاتنانەوە. ئەوەش لە ڕێگەی چوونە ناو چەند ناوچەیەکی نوێوە بۆ چالاکیی فیکری و چەند کایەیەکی تر بۆ کارکردن. بێگومان ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی سەرچڵییە مەزنەکان، تاقیکردنەوە بێوێنەکان، دۆزینەوە نوێکان، وەرچەرخانە مێژووییەکان، بازدانە ژیارییەکان و شۆڕشە بنەڕەتی یان بونیادییەکان لە بوارەکانی ژیان و کەرتەکانی بووندا.

ئەم ستراتیژە ڕەخنەگرانەیە، کە دەستکەوتی ئیجتیهاد لەئامێزدەگرێت و ڕەتیناکاتەوە، لە وێستگە جۆربەجۆرەکاندا دەرکەوتوون، لە ئەلف و بێی (گالیلۆ) وە بیگرە هەتاکو بێباوەڕیی (ڤۆڵتێر)، لە گومانی (دیکارت) ییەوە بۆ ڕەخنەی (کانت)ی، لە

دیالەکتیکی (هیگڵ)ەوە بۆ مەتریالیستبوونی (مارکس)، لە ئارکیۆلۆژیای (نیتشە)وە بۆ هەڵوەشاندەوەکانی (هایدگەر)، هەتاکو دەگاتە ئارکیۆلۆژیای (فۆکۆ)وهەڵوەشاندنەوەکانی (دریدا). لێرەشدا دوایین بێباوەڕەکانی ڕەنجدەرانی ئەقڵ و کارگەرانی ڕەخنە بەرامبەر بە جادووگەرییە ئایینیەکان لەبیرناکەم. مەبەست (دانیال دنت)ی خاوەنی کتێبی «خوا تەڵەکەبازی و وەهمە»، کە ئێستا دەچێت بەگژی خاوەنەکانی تیۆری دیزاینی ژیرانەی موحافەزەکارە نوێکاندا، وەک بەشێک لە ململانێی نێوان هەردوو گرووپەکە سەبارەت بە ڕەوایەتیی تیۆری گەشەکردن یان بڕوای خوڵقاندن.

ئەوەی پەیوەندیی بەمنەوە هەیە، لەبەر ڕۆشنایی بازدانە مەعریفییەکانی بوارەکانی زمان، مرۆڤزانی، دەروونشیکاری، ڕەخنەی ئەدەبی، ئارکیۆلۆژیای مەعریفە، زانستی نووسین، لۆژیکی هەستکردن و فەلسەفەی جیاوازیدا، هێمادەکەم بۆ گوێزانەوەی چۆنایەتی لە «ڕەخنەگرتن لە ئەقڵ»ـەوە بۆ «ڕەخنەگرتن لە دەق». ئەو مەسەلەیەی بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو عەمبارە لۆژیکییەی لە وشەکانی گشتی، پێویستی، تاکڕەهەندی، باڵاڕەوی و چییەتیگەری دروستبووە... سەرباری ئەوە دانانی دروشمە جۆربەجۆرەکانی مۆدێرنیتە لەسەر مێزی لێپێچینەوە و پێداچوونەوە، بەشێوەیەک کە بووە هۆی گۆڕانی پەیوەندیمان بە وشەکانی بوونمانەوە، بە حەقیقەت و ئەقڵ و دەقەوە، هەروەها بە شوناس و مانا و جیهانەوە...

## قەیرانی گەردوونی:

ئەم ڕەخنەگرتنە، ڕابواردن یان نمایشکردنێکی فیکری نییە، بەڵکو دەستنیشانکردنی ئاستەنگەکانی مۆدێرنیتە و قەیرانی کۆمەڵگە هاوچەرخەکانە، کە لە زیاتر لە بوارێکدا و لە زیاتر لە سەرچاوەیەکەوە بەدەست مەسەلە و کێشەکانیەوە دەناڵێنن، وەک ئەوەی گرفتەکانی ژینگە و تەندروستی و بژێوی و بەتایبەتی ئاسایش دەیخەنەڕوو.

ئێمە لەبەردەم قەیرانێکی گەردوونیی هەمەلایەندایـن، کە پـەی بە شـێوەکانی ڕاستبێژی و ڕەوایەتیـی مەعریفـی و ئەخلاقی و سـیاسـی دەبـات، هەروەها پەی بە پلەداریی بەهاکان و پێوانەکانی حەقیقـەت دەبات، بەئەندازەی ئەوەی لەگەڵ زانستەکانی ئەتۆم، جینەکان، میکرۆب و زانیاریدا مرۆڤایەتی فڕێدەداتە ناو کۆمەڵگەی مەترسی و سەردەمی کارەساتەوە.

ئەم قەیرانە بەپلەی یەکەم لە نەمانی دەسەڵاتی(٢) مرۆڤ بەسەر خۆی و شتەکاندا دەردەکەوێت. هەروەها لە دەستەوسانی پەرەسەندووی لەئاست بەدەستەوەگرتن و دڵنیایی و کۆنترۆڵکردندا بەدیدەکرێت. ئەمەش وا لە دەستکردەکانی مرۆڤ، واتە

سیستەم و ڕێکخستنەکانی، دەکات لە دەسەڵاتی ڕاپسکێن و واش دەکات کەرەستە و ئامرازەکان پێش ئەوەی بەری خۆیان بدەن بێکەڵک بن، چارەسەرەکانیش چەندین کێشەی ئاڵۆزتر و مەترسیدارتر بخەنەوە.

ئەمەش وادەکات ئاکامەکان پێچەوانەی بانگەشەکان بن، بەئەندازەی ئەوەی دەبێتە مایەی ئەوەی خاوەن پرۆژەکان لە بیرۆکەکانی خۆیان هەڵبگەڕێنەوە، یان پێشێلی ئەوە بکەن کە داوایدەکەن، یاخود تەنگژەکانی خۆیان دروستبکەن، هەتاکو ڕووداوەکان ڕیانچڵەکێنن و پێشهاتەکان تۆڵەیان لێ بسەنێت.

لەکۆتاییشدا ئەمە لێکیدەداتەوە بۆچی ئیمڕۆ مرۆڤ جگە لە لەناوبردنی مەسەلەکانی بەمەبەستی پێکهاتن لەگەڵ ئەوەی بانگەشەی بەگژاچوونەوەیان دەکات، هیچ شتێکی نازانێت. ئەوەش سەرەنجامی پیادەکردنی تەنهاییخوازی و ویستی بەخوابـوون و هۆگربوونی شتەکانە و تەنانەت دژەکانیشیانە: پێکهاتن دژ لەگەڵ دژەکەی لەسەر دروستکردنی وێرانی، بەڕادەیەک کە کارەکەی بەدەستکردی دوژمن بچێت، یان لە یەکێک لە ڕووەکانییەوە پێی بچێت.

هەموو ئەوانە شایەتیدەدەن لەسەر شکستخواردن و دۆڕانی مرۆڤ و دەستەوەستانی لەئاست داخوازی و ناونیشان و ئەو مەسەلانەدا، کە جگە لە دژەکەیان یان پێشێلکردنیان لەسەر خاکی تێداژیاو شتێکی تری لەدەست نایەت. پێدەچێت ئەمە باری مرۆڤ بێت کە هەمیشە خۆی ڕووبەڕووی کتوپڕ دەکاتەوە، جا بە ڕووە پۆزەتیڤ و بنیاتنەرەکەیدا بێت، وەک ئەوەی کارە باشە ژیواری و تەکنۆلۆژییەکان دەیانخەنەڕوو، ئەوەی ئەویان گەیاندە مەریخ، یان بە ڕووە نێگەتیڤ و وێرانکارییەکەیدا بێت، وەک ئەوەی گازە ترسناکەکان و پاشماوە پیسەکان و توندوتیژیی دڕندانەی نادیدە و ناماقوڵ دەیخەنەڕوو.

ئەگەرنا، چۆن ئەو هەموو خراپەکاری و مەترسی و کارەساتانە لێکبدەینەوە...؟ چۆن ئیمڕۆ ئەو هەموو بەربەرییەتە دەچنینەوە؟ ئەوانە بەری خراپ و وێرانکاری مۆدێلە مرۆڤایەتیەکان و شێوازە کولتوورییەکان و پێوانە ئەخلاقییەکانمانە.

با دان بە پێشهات و گۆڕانکارییەکاندا بنێین، هەتاکو بزانین چۆن دەستنیشانکردن و چارەسەرکردن ئەنجامدەدەین، لەبری ئەوەی تووشی ڕاچڵەکین یان بەڵا بین. چیتر مۆدێرنیتە وەک ئەوەی سەردەمی زێڕین و ڕۆشنگەریی نییە، بۆیە لێرەوە وشەکان و ناونیشانەکانی دەکەونە ژێر پێداچوونەوەی فەیلەسووف و زانا پەیوەندیدارەکان، هەریەکە و بەپێی کەرەستەی کایەکە و شارەزایی خۆی.

ئەمە باری دیموکراسیشە؛ ئێمە ئێستا دیموکراسی بەواتا کلاسیکییەکەی خۆی، واتە دیموکراسیی چەندایەتی، ژمارەیی، وەرزی، بیروکراتی، لەسەرەوە شۆڕبووەوە

تێدەپەڕێنین بۆ دیموکراسیی ڕۆژانە، کارلێککردو، بەشداریخواز، ڕاگەیاندنکار، کەرتخواز، تاوتوێکار و ئەزموونگەر... وەک (بیار ڕۆزانفالون)ی سەرۆک «کۆماری فیکر» لە فەرەنسا دەریدەخات.

## گەڕانەوەی تۆقێنەر:

لێرەوە و بەو جۆرەی بە مێشکدا دێت، قەیرانی مۆدێرنیتە بایەخ بۆ ئایینی گەڕاوە ناگێڕێتەوە، بەپێچەوانەوە ئەوە قەیرانی ئایینە بە نەخۆشی و دەردە کوشندەکانیەوە، وەک ئەوەی گەڕانەوەی تۆقێنەر لەسەر دەستی شێتەکانی خوا و ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان دەیخاتەڕوو، هەروەها قەیرانی مۆدێرنیتەیە بەئاستەنگ و لەکارکەوتنەکانیەوە. بۆیە پەی بە ناونیشان و چەمکە جۆربەجۆرەکان دەبات، جا ئەوە پەیوەندیی بە ئەقڵ، ڕۆشنگەری، ئازادی، دیموکراسی و مرۆڤەوە هەبێت، یان بە شوناس، کولتوور، خوا، نیشتمان و ئیمانەوە. ئەوانە ئەو ناونیشانانەن کە دەکەونە بەر ڕەخنەگرتن و هەڵوەشاندنەوە، لەپێناو سەرلەنوێ بنیاتنان و پێکهێناندا.

یەکێک لە پارادۆکسە ئابڕووبەرەکانیش ئەوەیە، مۆدێرنیستەکان - بەتایبەتی عەرەبەکانیان - لەوە بترسن مۆدێرنیتە لەباربرلو، قەیراناوی، سەرسمخواردوو، یان ئەزۆکەکەیان بکەوێتە بەر ڕەخنەی نوێی پۆست مۆدێرنیتە، کە بە هەڕەشە و ڕووخاندن یان دێوودرنجی دەزانن. لەکاتێکدا پۆست مۆدێنیتە چەندین ئاسۆی بەپیتی بەڕووی بیرکردنەوە و کارکردندا کردۆتەوە، کە دەشێت وەبەربهێنرێت بۆ چوونە ناو گفتوگۆ جیهانییەکان، لەپێناو نوێکردنەوەی چەمک و ناونیشانەکان و لەبەر ڕۆشنایی تێکشکان و هەرەسهێنانەکان، یان ئەو داگیرکردن و گۆڕانکاریانەی سەرهەڵدەدەن. لێرەشدا ئای چەند شەرمەزارین بەرامبەر بە دیکارت، کانت، هیگڵ و مارکس، کە دەقەکانیانمان پیرۆزکرد، لەکاتێکدا ئەو دەقانە کاری ڕەخنەگرانەی بێوێنەن و لۆژیکی خوڵقاندن و گۆڕانکاری بەرجەستەدەکەن، بەئەندازەی ئەوەی دەرفەتیان ڕەخساندوە بۆ تواناکانی ڕۆشنگەری و ڕزگارکردن و گۆڕانکاری، یان کەرەستە بەپیتەکانی لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕان، یاخود دۆزینەوە و پشکنینیان...

بەوەش مۆدێرنیستەکان جارێکی تر ڕووەکەی تری دیناسۆڕەکانی کەلەپوور پێکدێنن. جا لەبەرئەوەی ئەوانە زانینەکان تاڵاندەکەن، لەبری ئەوەی کار بۆ بەرهەمهێنانیان بکەن، بۆیە زۆربەی مۆدێرنیستەکان وەک خۆماکێکی ڕەسەن کە بەدەستیدێنینەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئازادیدا کرد، وەک ئەوەی کەسانێک بە تەمبەڵی یان ساویلکانە تێیدەگەن، ئەوانەی بە فەنتازیایەکی بەهەشتیی ستەمکارانە مامەڵەیان

لەگەڵ ئازادیدا کرد، هەتاکو بەهۆیەوە ستەمکاری ئەنجامبدەن، یان خۆیان ببنە نێچیری چەند ڕژێمێکی ستەمکار. لێرەدا ئەوانەمان لەیادناچێت کە دەڵێن ئازادی بە قوربانیدان و خوێن- جا بەشەهیدبوون بێت یان خۆکوشتن- دێتەدی. لەکاتێکدا ئازادی ئەوەیە کە دەرەقەتی دێین، واتە دەرگا و دەرفەت، یان جیهان و بوار، یاخود ئەو کایە و کەرتانەی بە کۆشش و هێز و مەشقکردن و کارکردنی بەردەوام لەسەر دەرهاویشتەکان دەیانکەینەوە، یان دایاندەهێنین، یاخود دروستیاندەکەین، بەمەبەستی دروستکردن و گۆڕانکاری، یان پێکهێنان بۆ هێنانەدیی دەستکەوتەکان: مەعریفەیەک، زانیارییەک، ئامرازێک، کاڵایەک، خزمەتگوزارییەک، سامانێک، یان ڕووەکانی تری هێز.

## گرەوەکانی نوێکردنەوە:

لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەدا گرەوەکانی مۆدێرنیتە کامانەن؟

**گرەوی یەکەم** ئەوەیە، بەباشی پێشهاتەکان بخوێنینەوەو واقیعی گەردوونیی ئێستا، بە گۆڕانکاری و تەقینەوەکانیەوە، بە دەستبەسەراگرتن و شۆڕشەکانیەوە، بە ململانێ و پێکدادانەکانیەوە، بە تێکشکان و هەرەسهێنانەکانیەوە دەستنیشان بکەین...

**گرەوی دووەم**، تێکشکاندنی لۆژیکی کارکردنە بە وشەکانی حەتمی و کۆتایی، یان پێشوەخت و ئامادە، یاخود دۆگمایی و مۆدێلخواز بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ واقعێکدا بە بونیادە ئاڵۆز و تەمومژاوییەکەیەوە، بەوپێیەی واقیع عەمباری ئەو دەستدانانەیە کە پڕن لە ئەگەرەکان، بەئەندازەی ئەوەی ڕوو و ئاستەکانی تێکهەڵکێشن یان فرەهێڵ و فرەواتان. ئەمەش پێویستی بەوەیە بە وشەکانی ڕێژەیی، تێپەڕاندن، گۆڕان، پێکهێنان و بنیاتنان مامەڵە لەگەڵ بیرۆکە و چەمکەکاندا بکرێت، چونکە ئەو بیرۆکە و چەمکانە پێکهاتەی گوتارئامێز یان بونیادگەلی فیکرین لەنێوان دەستکەوت و قەیرانەکانیاندا، یان ناکۆکیی زیندوو و یەکگرتوویی ڕواڵەتکارانەیاندا لە هەڵبەزودابەزدان.

بەوپێیەی جیهان سەرلەنوێ، بە بزوێنەر و کەرەستە و بکەرەکانیەوە، بە ستراتیژ و ململانێ و دەستێکەڵکردنەکانیانەوە نوێدەبێتەوە، وەک ئەوەی لای خوا نوێکان دەیبینین، وەک ئیمپراتۆرەکان و تیرۆریستەکان، موحافەزەکارە نوێکان یان بانگەشەکارە نوێکان، فەنەدەمەنتالیستە ئینجیلییەکان یان جیهادکارە ئیسلامییەکان.

بەکورتی، چیتر ناکرێت بەڕێوەبردنی جیهان و کاروباری گەردوونی، سەبارەت بە

بەها، ماف، بەرژەوەندی و شوناس و مەسەلەگشتییەکان، بە کەرەستەی فیکریی کۆن، بە وشەکانی تاکڕەهەندی، قۆرخکردن، زەوتکردن، هەڵبژاردەخوازی، دەستەبژێرخوازی، ناوەندخوازی، بێگەردیی کولتوور، یان پێکدادانی ژیواری ئەنجامبدرێت.

بۆیە گرەوەی سێیەم بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەحەددا و قەیرانەکان، ئەنجامدانی گۆڕانکاریی بونیادیی بێوێنەیە لە چەمکەکاندا، بەمەبەستی دیاریکردنی کەرەستەی بیرکردنەوە و ستراتیژی کارکردن، بەجۆرێک کە بە وشەکانی ئەقڵی تاوتوێکار، لۆژیکی گۆڕانکاریخواز، ڕەهەندی هەمەلایەنبوون، شوناسی دووڕەگ، فیکری پێکهێنانخواز، مرۆڤی هەرە خوارەوە، بێفیزیی بوونخواز و هەموو ئەو چەمک و چوارچێوە، یان میتۆد و ڕێسا، یان فۆڕم و هاوکێشە، یاخود شێواز و میکانیزمانە بیربکەینەوە و کاربکەین، کە دەشێت تاقیکردنەوە و ئەزموونەکانیان لێوە دروست بێت...

## شەپۆلە ژیوارییەکان:

گرەوی ئێمە وەک عەرەب لەمجۆرە واقیعە گەردوونییە جیهانگیرەدا چییە؟

گرەوەکە ئەوەیە، لەسەر هەمان میتۆد یان لۆژیک بەردەوام نەبین کە دەستەوسان و هەژاریی بەرهەمهێناوە، یان بۆتە مایەی تراژیدیا و کارەساتەکان، چونکە چیتر پشتکردنە شوناس، مەسەلە، ماف، بەرژەوەندی و کاروبارەکانمان و بەکارهێنانی ئەو قاڵب و میکانیزمانەی پشتبەستوون بە ڕەهەندی تاکلایەن، بڕوای هەڵبژاردەخواز، ستەمکاریی سیاسی، تۆقاندنی ئایدیۆلۆژی، کۆتوبەندی مرۆڤزانی، مەیلی تەوباوی، ئەقڵی دەستەبژێرانە و لۆژیکی پیرۆزکردن سوودی نییە... ئەمە وێڕای بێکەڵکیی چیرۆکی پیلانگێڕی و ئەقڵییەتی تۆمەتبارکردن و تاوانبارکردن، کە دوژمنایەتیی جیاواز و ئەویتری ناوخۆیی و دەرەکی دەکات. کەواتە گرەوەکە ئەوەیە بەچاکی شارەزای زمانی سەردەمەکە بین و بە لۆژیکی گۆڕانکاریی خوڵقێنەرانە کاربکەین، هەتاکو بەشدارییکەین لە دروستکردنی ژیواری دامەزراو و لە سەردەمێکدا، کە بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان تێکهەڵکێشن و کێشە و شوناسەکان بەجیهانیبوون، وەک چۆن جەنگ و ململانێکان بەئەندازەی تێکهەڵکێشبوونی ناوچەیی و گەردوونی، یان تایبەتی و جیهانی، یاخود نیشتمانی و هەرێمایەتی بەجیهانیبوون.

جیهانی عەرەب سێ وێستگە یان شەپۆلی ژیواریی بەخۆوە دیوە، کە هەریەکێکیان دینامیکییەتێکی بوونخوازانە پێکدێنێت: شەپۆلی ڕێنسانس و ڕۆشنگەری بە هەردوو ئاقاری ژیاندنەوەخواز و پێشکەوتنخوازەوە، ئەوەی ناودارانی وەک عەبدە و ئەفغانی و شبلی شەمیل نوێنەرایەتیاندەکرد.. دوەم شەپۆلی لیبرالیستانە کە ناودارانی وەک

لوتفی سەید، قاسم ئەمین، فەرەح ئەنتوان، تەها حسێن، عەلی عەبدولڕەزاق و ئەوانە نوێنەرایەتیاندەکرد کە بەڕووی کولتووری خۆرئاوادا کرانەوە و ڕێباز و میتۆد و سیستەمە فەلسەفییە نوێکانیان پیادەکرد. سێیەم شەپۆلی شۆڕش و بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکان بوو، کە تیایاندا ئایدیۆلۆژیا پۆلایینەکان و ڕژێمە تۆتالیتارەکان باڵادەستبوون و خاوەنەکانی پرۆژەی ناسیونالیست پێشرەوایەتیاندەکرد، بە جیاوازیی ئامادەگی و کاریگەریی ئاقارە چەپڕەو و لیبرالیست و ئایینیەکانەوە... لەگەڵ ئەم شەپۆلەدا ئازادییەکان پاشەکشەیانکرد و پرۆژەکانی دادپەروەری و پەرەپێدان سەرکەوتوونەبوون.

ئیمڕۆش لەکاتێکدا جیهان، لەژێر ئاڵای پەرەپێدان و جیهانگیریدا دەچێتە ناو شەپۆلێکی ژیاریی نوێوە، یەکێک لە پارادۆکسەکان ئەوەیە، فراکسیۆنی فەنەدەمەنتالیست لە ڕیزی پێشەوەی گۆڕەپانەکانی فیکر و کارکردندان و ئاقارە مۆدێرنستەکان بە گشت جۆرە جیاوازەکانییەوە لەپاشەکشەدان، بەڵام پرۆژەی فەندەمەنتالیستانەش بەرەو تێکشکان و سوتان دەچێت، چونکە مۆدێلێکی سوودبەخشی بۆ ژیان نەخستۆتەوە، بەڵکو بۆتە پەتا و ڤایرۆسێکی کوشندە، کە جەستەی نەتەوە هەنجن هەنجن دەکات و بەرەو سەدە تاریکەکانی دەگێڕێتەوە.

ئەگەر نەمانەوێ وەک تاقیکردنەوەکانی پێشوو دەرفەت بەفیرۆبدەین، ئەوا ئێستا دەرفەت لەبەردەمی عەرەبدا ڕەخساوە لە تەنگژەکە ڕزگاریان بێت، ئەوەش بە چوونە ناو شەپۆلی ژیاریی نوێوە، لەپێناو ڕەتکردنەوەی ئەو کەلەپوورە دەوڵەمەندەدا نا، کە چاوەڕوانیی ئەوەمان لێ دەکات کاری لەسەر بکەین و بیگۆڕین بۆ دراوێکی ژیاریی هەنوکەیی، هەروەها بۆ ڕەتکردنەوەی دەستکەوتەکانی شەپۆلەکانی پێشووی سەردەمی ڕێنسان و لیبرالیزم و شۆڕش نا، بەڵکو بۆ خستنەکار و وەبەرهێنانی لە خستنەگەڕی چەند دینامیکیەتێکی نوێ کە لەگەڵیاندا ئاراستە و ئەولەویاتەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەئەندازەی گۆڕانی کەرەستەی بیرکردنەوە و ستراتیژەکانی کارکردن. ئەمەش پێویستی بە بزواندنی گشت کەرتەکان هەیە، بە مامەڵەکردن لەگەڵ هەرتاکێک لە کایەی کار و پێگەی خۆیدا، وەک بەرپرس و بکەر و بەشدارێک، کە خۆی دروستدەکات و کاریگەریی لەسەر دەوروبەرەکەی هەیە و بەشداریی لە بنیاتنانی کۆمەڵگەکەیدا دەکات، بەئەندازەی ئەوەی خاوەن شارەزایی و ئەزموونە و زیندوێتیی خۆی بەشێوەی بەرهەمهێنان و داهێنان یان لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە لەو تاوتوێکردن و گفتوگۆیانەدا پیادەدەکات، کە دەبنە مایەی باشکردنی کاراییکردن یان دەستنیشانکردنی کێشەکان لە بواری کاری خۆیدا.

بەم مانایە، بەرپرسیلرێتی لە کۆمەڵگەی تاوتوێکاردا تەنیا ناکەوێتە ئەستۆی دەستەبژێرە سیاسی یان ڕووناکبیرییەکان، ئەگەرچی ئەو دەستەبژێرە بەپێی پێگە و بانگەشەکردن بەرپرسیارێتیی دووقات دەکەوێتە ئەستۆی، بەڵکو هەر بکەرێک بەرپرسیارە، بەڵکو هەر تاکێک بەرپرسیارە بەرامبەر بە هەژاری و دەستەوسانی خۆی، بەجۆرێک کە بۆ دەربازبوون لە بێتوانایی خۆی کار بۆ خستنەکاری ئەقڵی خۆی و وەبەرهێنانی وزەی فیکریی خۆی دەکات.

بەپێی ئەم دەستنیشانکردنەی نەخۆشی یان کێشەکە، چیتر کۆمەڵگە عەرەبییەکان پێویستیان بە تاقە سەرۆکێک یان پیاوچاکێکی ڕێبەر نییە کە فریادڕەس و ڕزگارکارە، پێویستیان بە چەند پاڵەوانێکی ئەفسانەیی یان سەرۆکێکی مێژوویی یان سەرکردەیەکی ئیلهامبەخش یان بەدەر لە هەڵە نییە، لەکاتێکدا ئەوان هەڵەدەکەن و پۆزشیش ناهێننەوە، بەڵکو هەڵەکان پەردەپۆشدەکەن، هەتاکو بەشێوەی دووقات کاری خۆیان بکەن. هەروەها پێویستیان بە (مەهدیی مونتەزەر) نییە، کە پێغەمبەرێکی مژدەبەخش یان فەیلەسووفێکی تیۆریستە و بەتەنیا کلیلەکانی گشت چارەسەرەکانی بەدەستەوەیە و تەنیا خۆی دەتوانێت نەخۆشییەکە دەستنیشانبکات و دەرمانەکەش پێشکەشبکات. کۆمەڵگەکان بەگرانی نرخی ئەمجۆرە دراوە دەستەبژێر و نەرجسیانەیان دا، وەک ستەمکاری و نابینایی و نامۆبوون و هەژاری. بەئەندازەی ئەوەی سروتەکانی پەرستن و پیرۆزکردنی ئەو سەرۆکانەی بەوێنە و وشە و ناوەکانی خۆیان ئەقڵی کۆمەڵگەکان دادەخەن، دەبنە مایەی ئەوەی ئەو سەرۆکانەش ببنە دیلی دەستی ئارەزووە کاتیەکان، دەسەڵات، نازناو، خەیاڵپلاوی و جادووگەریی خۆیان...

با بێفیزبین و پەند لە ئەزموونەکان وەربگرین: ئەگەر بانگەشەکارانی نوێکردنەوە شکستیانخواردبێ، یان دروشمەکانی خۆیان بە دژەکانی وەرگێڕابێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ دوژمنەکانی خۆیان کۆببنەوە بۆ هێنانەئارای لەناوچوون و وێرانکاری، ئەوا ئەمە مانای ئەوەیە کە توانای کراوە لەبەردەمماندا، پیادەکردنی بێفیزیی بوونخواز و سەرڕاستیی فیکرییە، لەپێناو پیادەکردنی سروت و دابونەریت و بەها نوێکاندا، بەجۆرێک کە بروا بە هێنانەخوارەوەی ئاستی سمبولیی ئەو داخوازی و بانگەشانەدا بهێنین کە پەیوەندییان بە سیفەتەکانی خواوەندی، پیرۆزی، هەڵەنەکردن و پاڵەوانبازییەوە هەیە... چونکە هەتاکو ئەو ئاستە بەرزیکەینەوە، پێشێلکاری و ئابڕووچوون و تێکشکانەکان زیاتردەبن و بەپێچەوانەشەوە.

ڕۆژگاری ڕووناکبیری پەیامبەر و پێغەمبەرئاسا بەسەرچووە، ئەوەی چاودێرکردن و نمایندەبوونی خۆی بەسەر مەسەلە و ئەقڵ و بەها و شوناسەکانەوە پیادەدەکات،

وەک ئەوەی نموونەکەیمان لە دەرەوە لای ڤۆڵتیر، مارکس، سارتەر و چۆمسکی، لە ناوەوەش لای محەمەد عەبدە و هاوچەرخەکانی بینی. ئێمە لەبری خەڵک بیرناکەینەوە، بەڵکو هیچ کەس لەبری یەکێکی تر بیرناکاتەوە، چونکە هەر بیرێک کە کەسێک تاوتوێیدەکات، کەسەکە لەگەڵیدا بەخراپ یان چاک، ڕەقهەڵاتن یان پەرەپێدان، وێرانکاری یان بنیاتنان گۆڕانی بەسەردا دێت. ئێمە بیرۆکەکان دەبزوێنین یان دەیانخەینەوە، ئەوەی ئێمەش دەیانخەینەوە پێویستی بەو داهێنەرانەیە، کە کار بۆ ئەوە دەکەن لە بوارەکانی کارکردن و کایەکانی شارەزایی خۆیاندا بیانخەنەگەڕ یان بیانگۆڕن. هەروەها ئێمە سوود لە ئەزموون و زانینەکانی کارکەرانی بوار و کایەکانی تر وەردەگرین و خۆراکیان لێ وەردەگرین.

بەکورتی ئەوەی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی و عەرەب پێویستیان پێیەتی، خستنەکار و خستنەگەڕی ئەو هێزە زیندوو و خوڵقێنەرانەیە کە بڕوا داخراوەکان، دەستەبژێرە شکستخواردووەکان، کارگێڕییە گەندەڵەکان، ئەقڵییەتە تەمبەڵەکان، کولتوورە هەژارەکان و مۆدێلە تیرۆریستە کوشندەکان دەیانچەسپێنن. چونکە مەسەلەکە پەیوەندیی بە نموونەیەکی مرۆڤانەی شێوە نوێوە هەیە، کە دروشمەکەی بریتییە لە: من دروستدەکەم و دادەهێنم و دەگۆڕێم، هەتاکو خۆم بم و بەشداربیکەم لە بنیاتنانی کۆمەڵگەکەم و دروستکردنی ژیواردا. کەواتە دروشمەکەی بریتییە لە: من دەخوڵقێنم، کەواتە دەبم.

کۆتایی قسە، گرەو لە جیهانی عەرەبیدا بریتییە لە: چوونە ناو دروستکردنی ژیوارەوە، بۆ سەلماندنی لێهاتوویی و پیادەکردنی کاریگەرێتی، لە ڕێگەی شارەزابوونی تەواو لە زمانی خوڵقاندن و گۆڕانکاری و تاوتوێکردندا، بەجۆرێک کە گۆڕانمان بەسەردا بێت و بەچاکی بەرەنگاری تەحەددا و گۆڕانکارییەکان ببینەوە و ئەو شتە دابهێنین و بدۆزینەوە، کە بەهۆیەوە ڕەوایەتیی خۆمان لەناو نەتەوەکان و لەم یان ئەو ڕووەوە بپچڕین و بەباشی تاوتوێ لەگەڵ یەکتر بکەین، بۆ ڕاگرتنی شەپۆلەکانی توندوتیژی و دەستهەڵگرتن لە ئاڵوگۆڕکردنی جنێو و خراپەکارییەکان، هەتاکو خێروبێر و قازانجەکان بگۆڕینەوە، جا لەسەر ئاستی ناوخۆ بێت، یان لە ڕووی پەیوەندییەوە بێت لەگەڵ دەرەوەدا.

بەبێ ئەوە کۆششە فیکرییەکان دەگۆڕێن بۆ جیهادێکی ئایینی ڕووت، کە بەشێوەی شەڕی ناوخۆ لەناوەوە گوزارشتی لێ دەکرێت، بۆ بەرگریکردن لە شوناسێکی قەیراناوی یان پەککەوتە، یان دەگۆڕێن بە خەباتی سیاسیی شکستخواردوو دژی دوژمنێکی دەرەوە کە پاشکۆیەتیمان بۆی زیاتردەبێت. کۆمەڵگە عەرەبییەکان

بەدەست زیادە کەلەپوور و سامان و توانستەکانەوە دەناڵێنێ، ئەوەی نییەتی چەند بیرۆکەیەکی بەپیت، چەند چوارچێوەیەکی گونجاو، چەند چارەسەرێکی سەرکەوتوو، یان چەند دابینکارییەکی کارامەیە.

## پەراوێزەکان:

١- دەقی ئەو بابەتەی لە دیداری «ئیجتیهاد و گرەوەکانی نوێکردنەوە»ی کتێبخانەی جەزائیر و لە ٢٦ی شوباتی ٢٠٠٨دا پێشکەشمکرد.

٢- لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبەکەم «پێکهاتنی دژەکان، مرۆڤی هەرە خوارەوە بەرەو کوێ؟».

## قەیرانی نوێکردنەوە یان قەیرانی بیرباری مۆدێرنیست

### ڕەوتی جیهانی:

ئەگەر قەیران خەسڵەتی دەرکەوتووی ڕەوتی ئێستای جیهان بێت، ئەوا پرسیاری گرنگ لەسەر ئاستی عەرەبی بریتییە لە: چۆن کۆمەڵگە عەرەبییەکان بەرەنگاری تەحەدداکان ببنەوە و قەیرانەکان چارەسەربکەن؟ چۆن عەرەب لە دۆخی دەستەوسان دەردەچن بۆ ئەوەی ئامادەگی خۆیان پیادەبکەن و بەشێوەکی کارامە و لە ڕێگەی داهێنان و دەستکەوتەکانیانەوە بەشداریی لە ژیواری جیهانیدا بکەن؟

ئەگەر قەیرانەکە گەردوونیش بێت، وەک ئەوەی بەر گوێمان دەکەوێت و دەیخوێنینەوە و بەدەست کاریگەریی و سەرەنجامەکانیانەوە دەناڵێنین، ئەوا قەیرانەکە لە جیهانی عەرەب درێژخایانە. بۆیە ئاخاوتن دەربارەی کاروباری ژیاری و چارەنووسساز نوێ نییە، بەڵکو کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی عەرەب بەرامبەر بە دەستەوسانیان لەئاست باڵادەستبوون و پێشکەوتنی خۆرئاوا و هەڵمەتی داگیرکاریی بۆ وڵاتە عەرەبییەکان بەئاگاهاتنەوە. بێگومان ئاخاوتن سەبارەت بە قەیرانەکە لەهەمبەر مافە بوونخوازییەکان قۆناغ، لە دوای قۆناغ، پرۆژە دوای پرۆژە، تێکشکان دوای تێکشکان نوێدەبێتەوە، بەڵام بە ناوی جیاواز و ناونیشانی نوێوە، جارێک مەسەلەی شوناس، یەکێکی تر کێشەی پێشکەوتن، سێیەم مەسەلەی ڕزگاری، چوارەمیش قەیرانی پێگەیشتن یان نوێکردنەوە.

### مانای قەیرانەکە:

یەکێک لە پارادۆکسە ڕووهەڵماڵەکان لەم بارەیەوە ئەوەیە، کاتێک ڕێنسانسخوازەکان مەسەلەی پێشکەوتنیان دەربڕی، ئەوا پێوانە و نموونەکە خۆرئاوا بوو، ئەوەش بەپێی فۆرمە بەناوبانگەکەی: بۆچی خۆرئاواییەکان پێشکەوتن و موسڵمانەکان دواکەوتن؟ بەڵام نەخشەی هێز و سامان لەسەر ئاستی جیهان گۆڕانی بەسەردا هات، لەبەرئەوەی

چیتر تەحەدداکە تەنیا لەلایەن دەوڵەتە خۆرئاواییەکانەوە نەبوو، چونکە چەندین نەتەوەی تر، کە لە ڕووی ژیوارییەوە لە دوای عەرەبەوە بوون، کەوتنە پێش عەرەب، وەک یابان و دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتی ئاسیا و دەوڵەتە هەڵکشاوەکانی ئیمرۆی وەک چین و هیندستان و بەرازیل، بەڵکو مۆسڵمانانی وەهاش هەن کە پێشکەوتنیان بەدەستهێناوە، وەک مالیزیا کە موعجیزەی پەرەپێدانی خۆی دروستکردوە، هەروەها وەک تورکیا کە هاتۆتە ڕیزی ئەو وڵاتە تازەپێگەیشتوانەی پێشکەوتن و پەرەسەندنی خۆی دروستدەکات. بەوجۆرە جیهانی عەرەبی سەرکەوتوونەبوو لە خستنەڕووی نموونەیەکی دیموکراسی یان پەرەپێداندا. سەبارەت بە شوناسیش، ئەوا بەرگریکردن لە شوناس گۆڕاوە بۆ کێشەیەک، وەک ئەوەی فیتنە مەزهەبییەکان و شەڕەکانی ناوخۆ لە وڵاتێکی عەرەبی زیاتر پیشانیدەدەن.

کاتێک من تاوتوێی مەسەلەکە دەکەم، ئەوا لەسەر ئاستە فیکرییەکەی و ڕوانگەیەکی کردەیی و بەکەرەستەکانی کایەیەکی پسپۆڕی، کە پێکهاتووە لە تۆڕەکانی تێگەیشتن و شێوازەکانی مەعریفە و فۆڕمەکانی بەئەقڵانیکردن، ئەوە ئەنجامدەدەم. بۆیە من هەوڵدەدەم کێشەکە بجوڵێنم و نموونەکە ژێراوژوورکەم یان شێوازەکە بگۆڕم، بەجۆرێک ئەرکی ئەو ڕووناکبیر و بانگەشەکارانە بخەمە بەر لێپێچینەوە کە ڕۆڵی ڕیفۆرمیست یان شۆڕشگێڕێک دەگێڕن و چاویانبڕیوەتە گۆڕانکاری و پێشکەوتن و نوێکردنەوە. ئەمەش پشتئەستوور بە دەربڕینەکەم: کێشەی بیریارەکان بەپلەی یەکەم لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆیاندایە (١).

بەمجۆرە قەیرانی جیهانی عەرەبی بەشێوەیەکی تایبەتی دەستنیشاندەکەم. چونکە کێشەی ئەقڵانییەت لەگەڵ بانگەشەکارانییەتی و کێشەی ئازادی لەگەڵ عاشقەکانیدایە، کتومت وەک چۆن کێشەی مۆدێرنیتە لەگەڵ ئەو مۆدێرنیستانەیە کە لە گرەوکانیاندا شکستیانخواردوە، بە بەڵگەی ئەوەی کۆمەڵگە عەرەبییەکان، کە لە بنچینەدا و لەسەردەمی ڕێنسانسەوە کەوتوونەتە ناو نوێکردنەوەوە، بە چاک یان خراپ گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەپێچەوانەی وێناکردنەکانی مۆدێرنیستەکان بۆ جیهان و سیناریۆکانی گۆڕانکاری و ستراتیژەکانی دەستوەردانیانەوە. کەچی مۆدێرنیستەکان بەرپرسیارێتی دەخەنە ئەستۆی ئەوانیتر، لەکاتێکدا چاکتربوو چاویخشێننەوە بە تێگەیشتنیاندا دەربارەی مۆدێرنیتە، کە هۆکاری دەردەکەیە.

## سەرچاوەی کێشەکە:

لێرەوە پێموایە زۆرێک، ناڵێم هەموو، لە گفتوگۆکان دەربارەی قەیران لە جیهانی عەرەب و دەرەوەیدا، باز بەسەر کێشەکەدا دەدەن، چونکە بەهەمان ئەو ئەقڵییەتە

ئەنجامدەدرێن کە قەیرانەکەی دروستکردوە، یان لانی کەم ئەو کەرەستە فیکرییانە بەکاردێنن کە یاریدەدەرنین و بەشداریی ناکەن لە کردنەوەی ئاڕاستەیەکی نوێ بۆ بەدەسهێنانی دەستدان و پێکهێنانی ئەو چارەسەرانەی دەبنە هۆی دەربازبوون لە تەنگەژەی بوونخوازانە یان تونێلی ژیواری. بەم مانایە، سەرچاوەی قەیرانەکە لای ئەوانەیە کە بانگەشەی چارەسەرکردنی دەکەن.

هەروەها لێرەوە چیتر ئەو وەڵام و توخنکەوتنە نێگەتیڤانە بڕوام پێ ناهێنن، کە تۆباڵەکە دەخەنە ئەستۆی عەرەب، بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان کایەیەک و کایەیەکی تردا، یان ئەقڵێک و ئەقڵێکی تردا، هەتاکو لەلایەن ڕووناکبیران و بیریارانی خاوەن ناوی درەوشاوە و نازناوی بەناوبانگەوە دواحوکم لە دژی عەرەب دەربکرێت. وەک ئەوەی ئەو هەڵسەنگاندن و پۆلێنکردنانە پیشانمانیدەدەن کە دەرچوونی عەرەب لە مێژوو ڕادەگەیەنن، یان بە پیاوە نەخۆشەکەی ئیمرۆی جیهان ناویدەبەن، یاخود گیاندانی کولتووری عەرەب و لەناوچوونی ژیواری و سمبولیی عەرەب دووپاتدەکەنەوە.

خاوەنەکانی ئەم حوکمدانە ڕەهایانە لەکۆتاییدا حوکم بەسەر خۆیاندا دەدەن، چونکە چۆن دەکرێت ئەوانە پێشەنگ، ئەقڵەکانی نەتەوە، سەرکردەکانی فیکر، دروستکەرانی ڕای گشتی و بەرهەمهێنەرانی مانا و بەهاکان بن، لەکاتێکدا لە باری پەککەوتەیی و پاشکەوتن، یان خراپبوون و هەڵوەشاندنەوەدابن! چۆن ئەو هەموو دەرد و لەکارکەوتن، یان خراپەکاری و کارەساتانە ڕوودەدەن، لەکاتێکدا ئەو ژمارە زۆرەی تیۆریست و شیکەرەوە لەئارادان و لە ڕێگەی ڕۆژنامەکان و تەلەفزیۆنەکانەوە دەردەکەون. ئەگەر بمەوێت سنووری عەرەبیش تێپەڕێنم، ئەوا دەپرسم: چۆن کارەساتی دارایی ڕوودەدات، لەکاتێکدا ئەو هەموو زانا و شارەزایە بە عەمبارە تیۆرییەکان و کۆمپیوتەرە بێهاوتاکانیانەوە لەگۆڕێن!

بۆیە پێموایە، ئەوەی ئێمەی کارکەری کایەکانی فیکر و لقەکانی مەعریفە دەبێت بیکەین ئەوەیە، لە خودی خۆمان هەڵگەڕێینەوە و ئەو دەستەبژێرییەی خۆمان تێکبشکێنین کە بە وەهم و نەرجسیبوون و بانگەشە پێغەمبەرییەکان مینرێژکراوە، بەجۆرێک کە هەریەکێکمان لە چەند ڕوویەکەوە پێداچوونەوە بکات بۆ وێناکردن و چەمک و ڕۆڵی خۆی، وێنەی خۆی دەربارەی خۆی، ستراتیژی دەستوەردانی لە کاروباری گشتی، تێڕوانینی دەربارەی بکەرەکانی کایە و کەرتە کۆمەڵایەتییەکانی تر.

## پێغەمبەرایەتی و چاودێریکردن:

١-یەکەم کۆتاییهێنان بە چاودێریکردنی پێغەمبەرانە و تێکشکاندنی ئەقڵییەتی

دەستەبژێریی باڵاخواز و ناوەندیخواز، کە بیریارە پیشەکارەکان: فەیلەسووف و بیریارەکان، بەتایبەتی خاوەن پرۆژەکان تووشی خەیاڵپڵاوی دەکات و وایان لێ دەکات پێیانوابێت ئەوان بەرجەستەکاری حەقیقەت و ئازادی و دادپەروەرین، یان هوشیاری و زانست و مەعریفە قۆرخدەکەن، یاخود کلیلەکانی چارەسەری سەرجەم کێشەکانی کۆمەڵگە، یان نەتەوە، یاخود مرۆڤایەتیان بەدەستەوەیە. بەوەش بەچاوی سووک سەیری کارکەرانی کەرتەکانی تر دەکەن، بەمامەڵەکردن لەگەڵیاندا وەک دەستوپێوەند یان ئەو ساوایانەی پێویستیان بە کەسی ڕیزپەڕە: پێغەمبەری مژدەبەخش، یان مەهدیی مونتەزەر، یاخود فەیلەسووفی تیۆریست، ڕۆڵی فریادڕەس و ڕزگارکەر بگێڕێت، بەجۆرێک کە لە بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن و تەگبیرکردنیدا نوێنەرایەتی نەتەوە یان کۆمەڵگە بکات، لەبەرئەوەی بەپێی پێناسەی پێغەمبەرایەتی و چاودێری لە هەموان لەپێشترە.

بەڵام ئاکامی ئەو ئەقڵییەتە پێغەمبەرییە پەیامبەرە چی بوو؟ عەرەب زۆر چاوەڕوان بوون، بانگەشەکار لە دوای بانگەشەکار، پرۆژە لە دوای پرۆژە، شۆڕش لە دوای شۆڕش، موعجیزە لەسەر دەستی سەرکردەیەکی ئیلهامبەخش یان مەهدیی مونتەزەر لەناو حەشاماتدا سەرهەڵبدات، هەتاکو بارودۆخەکان ژێراوژوور بکات، کەچی سەرەنجام چنینەوەی پاشەکشەکان و هەرەسهێنانی پرۆژەکان و گۆڕانی دروشمەکان بوو بە دژەکانیان، وەک ئەوەی پێوەناڵاندنەکانی لەسەر ئاستێک زیاتر، یان پێشێلکاری و مایەپووچی و ئابڕووچوونەکان دەیانخەنەڕوو. ئەمەش سەیرنییە، چونکە ئەقڵییەتی توانەوە لە دروشم یان مەسەلەیەکدا و بەخواکردنی کەسێک یان دەقێک و پیادەکردنی سرووتەکانی پەرستنی سەرۆک و سەرکردە و ڕێبەر و پاڵەوانی فریادڕەس، پێچەوانەی ئەقڵانیەت، ڕۆشنگەری، ئازادی و دیموکراسییە و دەبێتە مایەی دروستکردنی چەند ڕەوەیەکی مرۆیی و گرتبوونەوەیەکی کوێر، کە بابەتی ستەمکاری و ئامێری تیرۆریزمن. بەئەندازەی ئەوەی پێشکەوتن ناهێننەدی، بەڵکو زیندوێتی دەخنکێنن و وەزی داهێنانی چارەسەر و دەروازەکان ئیفلیجدەکەن.

٢- پیادەکردنی خۆپارێزیی فیکری و بێفیزیی مەعریفی (٢)، بەجۆرێک کە دان بەوەدا بنرێت بیریارە پیشەکارەکان حەقیقەت قۆرخ ناکەن، چونکە بڕوابوون بەو قۆرخکردنە، ساویلکەیی و نەزانی و زۆرداریی بڕوایە، لەبەرئەوەی فیکر «پیشە»ی توێژێکی تایبەتی خەڵک نییە، بەڵکو «خەسڵەت»ی مرۆڤە بە گشتی. ئەمەش پوختەی قسەکەی (دیکارت)ە کە دەڵێت «من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم»: پەیوەندیی مرۆڤ بە بوونی خۆیەوە، پەیوەندیی بیرکردنەوە و ویناکردن، یان مێشک

جولاندن و تەگبیرکردنە، بەئەندازەی ئەوەی پەیوەندیی داهێنان و نوێکردنەوە یان گەشەپێدانە. بۆیە هیچ کارێک یان پرۆژەیەک سەرکەوتوونابێت، ئەگەر خاوەنەکەی، بەبێ گوێدانە پیشە و پیشەسازییەکان یان کایە و کەرتەکان، بەشێوەیەکی داهێنەرانە و لێهاتوانە پەیوەندیی لەگەڵ فیکری خۆی نەکات. یەکێک لە بەڵگە زیندووەکانی ئەوە، کاتێک پرسیاری ئەوەیان لە بزنزمانی مەکسیکی بەرەچەڵەک لوبنانی (کارلۆس سەلیم)، دەوڵەمەندترین دەوڵەمەندەکانی دنیا، کرد چۆن ڕۆژی خۆی دەستپێدەکات، لەوەڵامدا وتی بە ئەقڵێکی (دیکارت)یانە: پێش دەستکردن بە سەیرکردنی نامە و پێشهاتەکان، یان ئەنجامدانی کاروباری ژمێریاری و گرێبەستەکان، کاتژمێری یەکەم تەرخاندەکەم بۆ بیرکردنەوە و تێرامان. ئەمەش مانای ئەوەیە چەمکە (دیکارت)ییەکە تەنیا پەیوەندیی (دیکارت) بە فیکری خۆیەوە دانارێژێت، بەڵکو پەیوەندیی نێوان فیکری زیندوو و نوێبوەوە لەگەڵ بوونی گەشەکردوو لای هەر تاکێک لە کارەکەی و کۆمەڵگەکەی یان جیهانەکەیدا دادەرێژێت.

## چاوی ڕەخنەگرانە:

٣- بێداربوونەوە لە سڕبوون، چونکە کەسانێک هەن کە خاوەن نازناوی بیریار نین، کەچی بەشێوەیەکی بەپیت و بەرهەمدار پەیوەندیی لەگەڵ فیکری خۆیاندا دەکەن، جا ئەوە لە جیهانی کارەکاندا بێت، یان دنیای ڕاگەیاندن، کەرتی بانقی، بواری وەرزش، کە کەرتێکی بوونخوازی پێشکەوتووە. بەوپێیەی هیچ بووژانەوەیەک بەبێ فیکرێکی بزۆکی گەشەکردوو و نوێبووەوە نابێت. لەبەرامبەردا کارکەرانی وەهای کایەکانی فیکر هەن، کە ئەرکی کارکردن لەسەر بیرۆکەکان دەگرنەئەستۆ، بۆ نوێکردنەوەی چوارچێوەکانی ڕوانین و میتۆدە فیکرییەکان و فۆرمەکانی بەئەقڵانیکردن، کەچی تاقە پیتێکی ئەو بیرۆکانەیان نوێ نەکردۆتەوە کە دەیان ساڵە دەستاودەستیان پێ دەکەن. وەک ئەوەی لە پەیوەندییان لەگەڵ وشەکانی عەلمانیەت و ئەقڵانیەت و دیموکراسی و هەروەها پێشکەوتن و مارکسیزم و سۆشیالیزمدا دەبینرێت... لەکاتێکدا ئاشکرایە ناونیشانەکان، کە لە کۆمەڵگە خۆرئاوییەکاندا سەریانهەڵداوە، هەمیشە و لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانکارییەکاندا دەکەونە بەر پێداچوونەوە و بنیاتنانەوە، بەمەبەستی نوێکردنەوە و گەشەپێدان، یان فراوانکردن و دەوڵەمەندکردن، بەشێوەیەک کە پەی بە چەمکەکان، چوارچێوەکان، ڕێساکان و کایەکانی پراکتیزەکردن ببرێت.

ئەگەر بۆ نموونە لەئاست مەسەلەی دیموکراسیدا هەڵوەستە بکەین، ئەوا دەبینین لەبەر ڕۆشنایی قەیران و تێکشکان و گۆڕانکارییەکان دەکەوێتە بەر پێداچوونەوەی بەردەوام،

لەبارەی شێوان، میکانیزمەکانی گوزارشتکردن، چاودێریکردن و بەشداریکردنەوە، بۆ پێکهێنانەوەی چەمکەکە بەمەبەستی فراوانکردن و دەوڵەمەندکردن. ئەوەش لە ڕێگەی سەرلەنوێ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان چەمکی دیموکراسی و تۆڕی ئەو چەمکانەی پەیوەندییان پێوەی هەیە، وەک ڕەوایەتی، گشتیبوون، هاوڵاتیبوون و گەردوونیبوون، وێڕای گرتبوونەوە و ڕێکخراوە ئەهلی و مەدەنی یان شارییەکان. ئەمەش بۆ نموونە ئەوەیە کە (پیار روزانفالون) لە فەڕەنسا دەیکات، بەڵام لە ئەڵمانیا (هابرماس)ی فەیلەسووف سەرلەنوێ چەمکەکە بنیاتدەنێتەوە، لە ڕێگەی گرێدانەوەی بە زمانەوە، کە نێوانکاری دیالۆگ و تاوتوێکردنێکە دیموکراسی یان کاری هاوبەش پێویستی پێیانە.

## دیناسۆرە مۆدێرنیستەکان:

٤- بەڵام بارەکە لای ئێمە جیاوازە، چونکە لەکاتێکدا پێویستە ڕەخنە پیادەبکەن بۆ دەستنیشانکردنی هۆکە و هەڵوەشاندنەوەی قەیرانەکە، دەبینین پاش دەیان ساڵ بانگەواز بڵاوکردنەوە بۆ نوێکردنەوە، کەچی لەو ئەرکە هەڵدێن و سەرقاڵی پاسەوانیکردنی بیرۆکەکان خۆیان و جوینەوەی ئەو دروشمانەن، کە گۆڕاون بۆ چەند بتێکی تیۆری و ڕقهەڵاتوە فیکرییەکان. وەک ئەوەی لە گوتارەکانی ڕووناکبیران و ئەو بانگەشەکارانەدا بەرجەستەدەبێت، کە وەک دیناسۆرەکانی مۆدێرنستیان لێهاتووە. بۆیە دەبینین داهاتوی عەرەب وەک ڕابردووی ئەورووپای سەدەی حەڤدەهەم یان هەژدەهەم بەخەیاڵیاندا دێت. ئەوانە بەمەبەستی خوڵقاندن یان داهێنان لەپێناو نوێکردنەوەی ناونیشان و چەمکەکاندا بیرناکەنەوە، چونکە مەراق و مەبەست لای ئەوان، تێگەیشتنی پێشهاتەکان و بەرهەمهێنانی چەند زانینێکی بەنرخ یان تۆڕەکانی چەمکە کاراکان دەربارەی واقیع و جیهان نییە، بەڵکو تێکۆشانە بۆ بەرگریکردن و گەورەکردن، یان هێرشکردن و بێبایەخکردن. ئاکامەکەش پاشەکشەکردن بوو نەک پێشکەوتن، پەکخستنی وزە بوو نەک خستنەگەڕی هێزە زیندووەکان، دەرفەت بەفیڕۆدان بوو نەک کردنەوەی دەستدان و ئاسۆکان.

لێرەوە چیتر مەسەلەکە ئەوە نییە داکۆکی لە مۆدێرنیتە، عەلمانیەت، ئەقڵانیەت و ئازادی بکەین، بەڵکو ئەوەیە بۆچی ئەو ناونیشانانە لەچاو ئەوەی پێش دەیان ساڵدا پاشەکشەدەکەن، هەتاکو ناوەکان وەک ناولێنانەکان نەبن. ئەمە ئەو کێشەیەیە کە مامەڵەکردن لەگەڵ دروشمەکانی مۆدێرنیتە، بە ئەقڵێکی تەقلیدی، لاهوتی، فەندەمەنتالیست و تاکڕەهەندانە، دروستیدەکات.

بێگومان زیادەڕۆیی ناکەم، چونکە پرسیارەکانی واقیع دڕەوشاوە و ئابڕووبەرن: کێ لە بەهاکانی پێشکەوتن و نوێکردنەوە و پەرەپێدانەوە نزیکترە، دیناسۆرێکی فیکری کە ناتوانێت چەمکەکانی خۆی نوێبکاتەوە، یان دیزاینەرێکی داهێنەری جلوبەرگ، یان خاوەن بانقێکی پێشکەوتوو، یاخود بزنزمانێکی سەرکەوتوو؟ با دان بە واقیعدا بنێین، هەتاکو بزانین چۆن دەروازەکان دەدۆزینەوە یان دەستدانەکان بۆ پێکهێنانی چارەسەرەکان دەکەینەوە: ئێمە لە ڕووی پەیوەندیمانەوە بە بەهاکان ڕاستبێژیمان لەدەستداوە، چونکە کۆمەڵگەی ڕووناکبیریمان مەملەکەتی چاکەکاری نییە، بەڵکو لەوانەیە لە ڕووی پەیوەندیی نێوانمانەوە لە کەرتەکانی تر خراپترین، بەوپێیەی تەنیا ئەوەمان لەدەست دێت کە دروشمەکانی خۆمان دەربارەی ئازادی و دادپەروەری و سەرڕاستی پێشێل بکەین. وەک ئەوەی شەڕە سمبولییە توندوتیژەکانمان دەیانخەنەڕوو، ئەوانەی ستراتیژی ڕەتکردنەوە و سڕینەوە، یان ویستی ڕووخاندن و وردوخاشکردن بەرجەستەدەکەن.

بەڵام لە ڕووی کاریگەرێتییەوە، ئەوا هەرەسهێنانی پرۆژەکانمان وای لێ کردووین لەچاو بلۆکی فەندەمەنتالیستانەدا لە پەراوێزدابین، هەشمانە دروشمەکانی ئەوان پیادەدەکات و لایەنگیری سیاسەتەکانی سەرۆک و ڕێبەرەکانیانە لەناو پیاوانی ئاییندا. ئەمەش ئابڕووچوونی ڕووناکبیری مۆدێرنیستە، ئەوانەی ئەو ڕووناکبیرانە بە پاشکەوتوو تۆمەتباردەکەن، کە وزە فیکرییەکانی خۆیان بەشێوەیەکی داهێنەرانە و بنیاتنەرانە لە بوارەکانی کارکردنی خۆیاندا وەبەردێنن، بۆ چاککردنی بارودۆخ یان گۆڕینی پێگەی خۆیان، لەکاتێکدا ڕووناکبیری مۆدێرنیست لەوەدا سەرکەوتوونەبووە کە داوای لێ کراوە، واتە گۆڕینی کەرەستەی فیکریی خۆی، بەڵکو بەشێوەیەکی تەقلیدی، یان نەرزۆک، یاخود هەڵگەڕاوە بیردەکاتەوە. ئەمەش لێکیدەداتەوە بۆچی جیهان بەپێچەوانەی ویستی ڕووناکبیران دەگۆڕێت.

ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو فەندەمەنتالیزمەی ئیمڕۆ گۆڕەپان و زانکۆ و تەلەفزیۆنەکانی داگیرکردوە، سەرکەوتوویوە لەوەدا کە بانگەشەی بۆ کردووە یان دەربڕیوە. بەپێچەوانەوە ئەوەی ئەو کردوویەتی، دژی ئەوە بووە کە داوایکردووە یان بەگژاچوونەوەی ڕاگەیاندووە، چونکە فەندەمەنتالیزم سەرکەوتوونەبووە لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکان یان دوورخستنەوەی مەترسی و گەندەڵییەکاندا، بەڵکو خەریکە ئەو دەستکەوتانەش لەناودەبات کە کۆمەڵگە عەرەبییە نوێکان لە کۆششی بێوچانیاندا بۆ پێشکەوتن و بنیاتنان بەدەستیانهێناوە. ئەمەش سەیرنییە، چونکە فەندەمەنتالیزم لە بنچینەدا بۆ تۆڵەسەندنەوە لە ڕووداو و دەستکەوتەکانی

جیهانی هاوچەرخ هاتۆتەئاراوە، بۆیە بێداربوونەوەیەکی رۆشنگەرانە یان شەپۆلێکی ژیواری نییە، بەڵکو بزووتنەوەیەکی گەرانەوەخوازە بۆ دواوە. ئەمەش وای لێ دەکات بەشێوەیەکی وێرانکەر یان بەربەریانە رۆژگارەکەی خۆی بەسەربەرێت و شوناسەکەی خۆی پیادەبکات، ئەوەش ئابرووچوون و کارەساتەکەیە.

بەوجۆرە رووناکبیری مۆدێرنیست یان بانگەشەکاری کەلەپوور پێکەوە لە کارەکەی خۆیاندا شکستیانهێنا، چونکە هەردووکیان دەق، بروا، تایەفە، دروشم، حیزب و سەرۆکیان زاڵکرد بەسەر نەتەوە، کۆمەڵگە، دەوڵەت، کۆمار و بەرژەوەندیی گشتیدا. ئەوەش سەرەنجامی رووناکبیریی ئایدیۆلۆژییانە، تاکرەهەند، هەڵبژاردەخواز، داخراو و دوژمنکارانەیە، کە پشتبەستووە بە پەرستنی ناوەکان و خۆهەڵواسین بەشتەکاندا، تەنانەت دژەکانیشیان. ئەمەش سەیرنییە، چونکە ئەوەی شتێک دەپەرستێ، بەئەندازەی پێکهاتن لەگەڵ دژەکەیدا پێشێلیدەکات، یان بەئەندازەی ستەملێکردنی دەبێتە نێچیری. لەوانەیە ئەمەش پێککەیشتنی فەندەمەنتالیست و عەلمانی لێکبداتەوە.

### ماسولکە و مەعریفە:

٥- دوا وانە: دەروازەی دەرچوون لە تونێلەکە ئەوەیە، کە بیریارە پیشەکارەکان بەرووی کەرەتەکانی تردا بکرێنەوە، چونکە لەبەرئەوەی بیرکردنەوە خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە، هیچ کەسێک ناتوانێت نوێنەری یەکێکی تر بێت، یان لەبری ئەو بیریکاتەوە. ئەوەشی لەبریی بیردەکەینەوە، یان چەکی بیرکردنەوەی زیندوو فڕێدەدات، سەرەتا مرۆڤ بوونی خۆی، واتە خەسڵەت و لێهاتوویی خۆی، لەدەستدەدات و دەگۆرێت بۆ ئامێر، یان مادە، یاخود کۆیلە و وابەستە. هەروەها کاریگەرێتی خۆی لەدەستدەدات و زیندوێتیی فیکریی خۆی پیادەناکات و ناتوانێت وەزی ئەقڵیی خۆی بخاتەکار، بەتایبەتی ئیمرۆ کە کاری بەرهەمهێن زیاتر پشت بە مەعریفە دەبەستێت، نەک بە ماسولکە. چونکە ماقوڵ نییە ئەو کۆمەڵگەیە باش بێت کە دەستەیەک رووناکبیر لەبری ئەو بیردەکەنەوە، کەچی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکەی گوێ بە بیرۆکە و گفتوگۆ و مشتومڕەکانیان نەدەن.

ئەمە مانای ئەوە نییە دەردەکە لەو بیرۆکە و چارەسەرانەدایە کە بیریارەکان بەرهەمیاندێنن یان دایاندەهێنن و ناگەنە زۆربەی خەڵک، بەڵکو لەوەدایە ئێمە بایەخ بەوە نادەین کە کارکەرانی کەرتەکانی تر بیری لێ دەکەنەوە و رۆڵیان لە دەستنیشانکردنی کێشەکان و داهێنانی چارەسەرەکاندا رەچاوناکەین، بەئەندازەی

ئەوەی وەک جەماوەرێکی بێئەقڵ یان ڕەویەکی بیرنەکەرەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین. کەواتە ئەوەی هەستانەوە و چاکسازی و نوێکردنەوە پێویستی پێیەتی ئەوەیە، هەر تاکێک وەک بەرهەمێن، بکەر، بەشدار و بەرپرسیار مامەڵە لەگەڵ خۆی بکات. واتە وەک ئەوەی دەتوانێت بەشدارییبکات لە دەستنیشانکردن و چارەسەرکردندا، تەنانەت ئەگەر لانی کەمیش بێت، کە ئاستی کایە و کەرتەکەی خۆیەتی، چونکە هەموان بەئەندازەی بەرپرسیاربوون و بەشداربوون شارەزا و بکەرن.

## کارێکی هاوبەش:

٦ -چیتر سوودبەخش نییە هەریەکێکمان، پێش هەرکەسێک مەبەستم خۆمە، خۆی لە هەڵەکردن بەدووربگرێت و لۆمەکە بخاتە ئەستۆی ئەوانیتر، یان وەک تەنێکی هاوچەشن باسی عەرەب بکەین. لە جیهانی عەرەبدا دەستەبژێرانی شکستخواردوو و جەماوەری پەککەوتە و سیاسەتمەدارانی ستەمکار هەن، بەڵام لەبەرامبەردا خەڵکانێک هەن کە زیندوێتی و لێهاتوویی و جیهانیبوونی خۆیان پیادەدەکەن، بەمەبەستی خوڵقاندن و داهێنان لە کایەکانی پیشە و بوارەکانی کارکردنی خۆیاندا.

ئەوەی ڕووناکبیران پێویستیانە، دەرچوونە لە قۆزاخەی نەرجسیانە، بەجۆرێک بەشێوەی ئەو خاوەن کارانە ڕەفتاربکەن، کە وەک کارکەرانی کایە جۆربەجۆرەکانی تر تایبەتمەندیی خۆیان کارپێدەکەن و بەئەندازەی شارەزابوون لە کارەکەیاندا کاریگەری دەخەنە سەر کۆمەڵگە و جیهانەکەیان. وەک ئەوەی هەر بکەرێک دەیکات، جا فەیلەسووف بێت یان بازرگان، یاریکەری تۆپی پێ بێت یان شۆفێری تاکسی. ئێمە هیچ کەسێک کەمبایەخ ناکەین، چونکە دەشێت پێشبڕکێکارێکی دارایی ڕێڕەوی سورێکی ئابووری بگۆڕێت، یان زیانێکی ئابووری بخاتەوە، کتومت وەک ئەوەی شۆفێری تاکسییەک دەتوانێت ڕێڕەوی هاتوچۆ تێکبدات و هاتوچۆ لە شارێکی هاوچەرخدا بکاتە دۆزەخ. بەپێچەوانەوە شۆفێرێکی تاکسی کە ڕێزی ڕێساکان دەگرێت و خاوەن زەوقێکی دروستە، بکەرێکی پۆزەتیڤە. بەپێچەوانەی ڕووناکبیرێکەوە کە قسەی بێمانای ئایدیۆلۆژییانە هەڵدەبەستێت، یان بانگەشەکارێک کە جادووگەریی فیکری پیادەدەکات.

با دان بەشتەکاندا بنێین، هەتاکو بتوانین بەشدارییبکەین لە چارەسەرکردنی کێشە سەخت و ئاڵۆزکاوەکاندا، چونکە چارەسەر لای تاکێک، یان کەمایەتییەک، یاخود دەستەبژێرێک نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی بەردەوام و پەرەسەندووە، بەئەندازەی ئەوەی کارێکی هاوبەشە، گشت بکەرەکان بەشداریی تێدا دەکەن، هەریەکە و لە کایەی

کارەکـەی و بازنـەی شەرەزایی خۆیدا. جا ئەگەر کارکەرانی بواری بەرهەمهێنانی فیکری و سمبولی، لە بواری زانین، تیۆر، میتۆد، بەها و ڕێساکاندا، بەشداریی لە ڕۆشنکردنەوەی خەڵک و پێکهێنانی هوشیاریاندا بکەن، ئەوا ئەوەی فەیلەسووف و زاناکان دایدەهێنن، بەری کرانەوەیانە بەڕووی بوارەکانی کارپێکردن و کایەکانی بەرهەمهێنان لە کەرت و بوارە جۆربەجۆرەکاندا، واتە ئەوەی خەڵک لە بازنەیەکی کارکردنی خۆیاندا بیری لێ دەکەنەوە یان پێشنیاریدەکەن. ئەوەی ئێمە لوتبەرزی لەئاستیاندا دەنوێنین، یان بەکۆیلەیاندەکەین، یاخود ناتوانین تاوتوێیان لەگەڵ بکەین، لەسەر شێوەی خۆیان دروستماندەکەن، چونکە ئەوانە لە دروستکردنی چارەنووسەکاندا شەریکمانن، بەئەندازەی ئەوەی کۆسپ دروستکەرن بۆ پرۆژەکان و پەکخەری ڕێڕەوی پەرەسەندن و بنیاتنانن.

بەم مانایە، کۆمەڵگەی دینامیکی و دەوڵەمەند و پێشکەوتوو بەهۆی هێـز و لێهاتوویی خۆیەوە ئەوەیە، کە وەک ۆرکشۆپێکی بەردەوامی بیرکردنەوەی بەپیت و کاری بەرهەمهێن لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا کاردەکات، بەئەندازەی ئەوەی دەگۆڕێت بۆ فەزایەکی تاوتوێکردن و تۆڕێکی کارلێککردن لەسـەر گشت ئاسـت و کایەکان. لەمجۆرە کۆمەڵگەیەدا تاکەکان و کۆمەڵەکان کار بە وشەکانی دانپیانان و فرەیی و نێوانکاری دەکەن، بەئەندازەی ئەوەی بە زمانی خوڵقاندن و گۆڕانکاری، یان بە ئەقڵییەتی پێکهێنان و تێپەڕاندن کاردەکەن. پێدەچێت ئەمە ئەوە بێت دروستکردنی بنیاتنان و گەشانەوە و پێشکەوتنە پێویستی پێی هەبێت کە بەڕووی فرەیی و هەمەڕەنگی فۆرم و نموونەکاندا کراوەیە، بەئەندازەی ئەوەی لە ڕەسەنایەتیی چارەسەرەکان و دەوڵەمەندیی ئەزموونەکانەوە سەرچاوەدەگرێت و توانای داهێنان و نوێکردنەوە لە ناونیشان و چەمکەکان، یان میتۆد و شێوازەکان، یاخود تەوەرە و کایەکاندا بەرجەستەدەکات.

ئەقڵی ڕۆشنگەری تەنیا ئەو شتە پارێزراوانەی سەردەمی ڕۆشنگەری نییە کە وتار دوای وتار دووبارەیان دەکەینەوە، هەروەها ئەو ناونیشانانە نین کە بەئەقڵییەتی دروشمی ڕێزلێنراو مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین، بەڵکو توانای یەکێکە بۆ خوڵقاندن و تیخکردن و نوێکردنەوە، هەتاکو بگۆڕێت و گۆڕان بەسەر پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ تاکەکانی بووندا بهێنێت و سەرلەنوێ جیهانەکەی پێکبهێنێتەوە، ئەوەش لە ڕێگەی چوونە ناو ئەو ناوچانەی بیرکردنەوەوە کە دوورخراوە، یان نەناسراو، یاخود نوێن...

لێرەدا پێویستە پرسیارێک دەربڕم: نوێکەرەوە و گەشەپێدەر و پێشکەوتنخوازەکان کامانەن.. ئایا ئەو تیۆریستانەی مۆدێرنیتە و ئەقڵانیەت و ئازادین کە دروشمەکانیان

گۆڕیوە بۆ قفڵدان لە ئەقڵ و فیکر زیندانیدەکەن و قەیرانەکان بەرهەمدێنن، یان کارکەرانی کەرتەکانی ترن، وەک دیزاینەری داهێنەری جلوبەرگ، خاوەن بانقی گەشاوە، بەڕیوەبەرێکی سەرکەوتووی وەرزش، ڕۆژنامەیەکی جیاکارە کە خەڵاتێکی جیهانی بەدەستدێنێت، دامەزرێنەری کەناڵێکی تەلەفزیۆنیی گەردوونی، ئەندازیاری تەلارسازیی ئەودیو نەتەوەیی، یان تیمەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە تاکەکانی بایەخ بە پاککردنەوەی ژینگە و ئاژەڵان دەدەن، ئەمە وێڕای ئەو ڕۆماننووس، یان شاعیر، یاخود هونەرمەندەی بەبێ بانگەشەکردن یان تیۆریزەکردن لە ڕێگەی داهێنانی خۆیەوە، لێهاتوویی و جیهانیبوونی خۆی پیادەدەکات؟ ئەم پرسیارە پاڵم پێوە دەنێت بڵێم: ئێمە چیتر بانگەشەکار و ڕووناکبیر نین، ئەوانەی چاودێر و وەکیل و پارێزەری ئەو بەها و ماف و بەرژەوەندیيانەن کە تایبەتن بە هەموو خەڵک. ماوەیەکە ڕاستبێژیمان لەدەستداوە. هەروەها بانگەشەکاری کەلەپوور وای لێهاتووە کەمتر دیندار یان خۆپارێز بێت و ڕووناکبیری مۆدێرنیستیش کەمتر مۆدێرنیست و ئەقڵانی و ڕۆشنگەر بێت. ئەگەرنا، چۆن ماڵوێرانیی مانا و بەفیڕۆچوونی مەسەلە و هەرەسهێنانی پرۆژەکان، پاش ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی دەیان ساڵ، لێکبدەینەوە!

لەبەر ڕۆشنایی ئەم تێگەیشتنەدا، چیتر کێشەکە پەیوەندیی بە لەناوچوونی عەرەبەوە نییە، بەڵکو لە تەنگژەی دەستەبژێرە ڕووناکبیری و ڕژێمە سیاسییەکاندایە، بەهۆی ئەو بیرۆکە سواو و ئامرازە نەزۆکانەی واقعێک ناگۆڕن، پێشکەوتنێک ناهێننەدی، یان پەرەسەندنێک دروست ناکەن، بەڵام خۆ کۆمەڵگە تەنیا سیاسەتمەدار و ڕووناکبیرەکان، یان بانگەشەکار و تیۆریستەکانی نییە، چونکە بکەرانێکی وەها لە کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا هەن، کە گەشاوەبوونی خۆیان لە بوارەکانی کارکردندا پیادەدەکەن، بەمەبەستی نوێزینەوە و داهێنان، بە بەرهەمهێنانی ئەو کار و دەق و بیرۆکانەی بێوینەن و بەهۆیانەوە بەشداریدەکەن لە دروستکردنی ژیانی عەرەبی و ژیواری دامەزراودا، کە ژیوارێکی جیهانیی بەجیهانیکراوە، بەئەندازەی ئەوەی لەسەردەمی زانیاری و کەرەستە بێهاوتاکاندا گەردوونییە.

هەروەها بە ئەندازەی زۆربوونی ئەوانە و زۆربوونی لێهاتوویی و فراوانبوونی ڕووبەرەکانی کاریگەرییان لە دوو ڕووەوە بەشداریدەکەن لە گۆڕینی کۆمەڵگەکانیاندا: یەکەم خوڵقاندنی تواناکانی گۆڕینی واقعی سیاسی و فراوانبوونی ڕووبەری ئازادییەکان، لە ڕێگەی ئیفلیجکردنی هێزەکانی هەژموون و ستەمکاری و قۆرخکردن دەسەڵاتەوە. دووەم گۆڕینی ئەقڵی ڕووناکبیران، چونکە ئەوانە بەهۆی ئەقڵییەتە نەرجسی و بڕوا مەهدەوییەکانیانەوە خەویان بە گۆڕینی کۆمەڵگەکانەوە دەبینی،

ئاکامەکەش ئەوە بوو جیهان بەپێچەوانەی ویستی ئەوان گۆڕا و ئەوانیش ڕاستبێژییان لەدەستدا، هەتاکو بکەونە پەراوێزی ڕووداو و گۆڕانکارییەکانەوە. ئەمەش نیشانەی نەزانیی ئاوێتەی ئەوانە سەبارەت بە خود و ئەویتر و واقیع. بۆیە چاوەڕوانکراوترە کۆمەڵگەکان بە هێزە زیندوو و داهێنەرەکانیان و لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە لە کارەکانی نۆژینەوە و داهێناندا ئەقڵی ڕووناکبیران بگۆڕن، جا ئەوە لە ڕووی وێناکردنەکانیانەوە بێت بۆ واقیع، یان لە ڕووی وێنەکانیانەوە بێت بۆ خۆیان.

ئەمەش پارادۆکسەکەیە، چونکە قەیرانی نوێکردنەوە و پێشکەوتن مۆدێرنیست و پێشکەوتنخوازەکان دروستیدەکەن، هەروەها قەیرانی ڕۆشنگەری و ئەقڵانییەت سەرچاوەکەی ڕۆشنگەر و ئەقڵانییەکانە، چونکە ئەو ناونیشان و دروشمانەیان پیرۆزکرد کە سوابوون و پەیوەندییان لەگەڵ بزووتنەوەی واقیع و کاری کۆمەڵگەکان و ڕەوتی جیهان لەدەستدابوو.

## پەراوێزەکان:

١ - دان بەوەدا دەنێم کە ئەم قسەیە نوێ نییە، چونکە لە کتێبەکەمدا «ڕەخنەگرتن لە دەق» (١٩٩٣) و دواتر لە کتێبی «وەهمەکانی دەستەبژێردا» (١٩٩٦) باسی ئەوە دەکەم کە کێشەی بیریار بەپلەی یەکەم لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆیدایە، واتە کێشەی شتەکە لە خودی چەمکەکەیدایە، کتومت وەک چۆن کێشەی ئەقڵ لەگەڵ ناماقوڵەکانیدایە. ئەمەش مانای چارەسەرکردنی قەیرانەکان پێویستی بە گۆڕانی تیۆرەکان و میتۆدەکان یان مۆدێلەکانە، نەک بە پاراستنی بەهۆی ڕەتکردنەوەی ڕووداوەکان. ئەمەش ئەوەیە ئێستا هەندێک نووسەری خۆرئاوایی سەبارەت بەو قەیرانە دارایییە دەیڵێن، کە لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٨دا بە چاپە نوێکەی تەقییەوە. بۆ نموونە، هێما بۆ (پۆڵ کروگمان)ی زانای ئەمریکی دەکەم کە ساڵی ٢٠٠٨ خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئابووری وەرگرت. ئەو لە شیکردنەوەی قەیرانەکەدا دەڵێت، چەندین ئاستەنگی بونیادی لەبەردەم پێگەیشتن و بوژانەوەدایە، لەوانە ئەو قوتابخانە فیکرییە توندڕەوانەی ئەقڵەکان ئیفلیجدەکەن. ئەمە لەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە کە گۆڤاری (لونۆفیل ئۆبسێرڤاتۆر) لەگەڵیدا کردویەتی و لە ژمارە ٢ی ٩ی ئەیلولی ٢٠٠٩دا بڵاوکراوەتەوە.

٢- هەروەها لێرەدا دان بەوەدا دەنێم، کە قسەکانم دەربارەی مەسەلەی بێفیزی نوێ نین. ئەمە هەمان ئەو ڕەخنەیەیە کە ماوەیەکە لە زیاتر لە شوێنێکی کتێب و وتارەکانمدا لە کارکەرانی کایەکانی فیکری دەگرم، جا ئەوە بە داواکردنی تێکشکاندنی دیوارەکانی نێوان دەستەبژێرە ڕووناکبیری و فیکرییەکان و کارکەرانی کایەو کەرتەکانی تر بێت، یان بە داواکردنی ڕێکخستنی چەند کۆڕێکی هەمەلایەن بێت دەربارەی تاوتوێکردنی مەسەلە گشتییەکان، یان بە جەختکردنەوە بێت لەسەر کرانەوەی فەیلەسووف و زاناکان بەڕووی کایەکانی پیادەکردندا، یاخود بە بڕواهێنانیان بێت بەوەی

بیرکردنەوەی زیندوو و بەپیت خەسڵەتێکی هەموو خەڵکە. ئەمەش ئەوەیە کە ئێستا کۆمەڵناسە دیارەکان جەغتی لەسەر دەکەنەوە. بۆ نموونە، هێما بۆ کۆمەڵناسی فەڕەنسی (فرنسوا دوبیە) دەکەم، کە داوا لە کۆمەڵناسەکان دەکان بێفیزی پیادەبکەن، جا ئەوە لە ڕووی ناسینی واقیعی کۆمەڵایەتیانەوە بێت، یان لە ڕووی پەیوەندییانەوە بێت بە بکەرە کۆمەڵایەتییەکانی ترەوە، بەجۆرێک کە لەو تێڕوانینەی خۆیان ڕزگاریان بێت کە کۆمەڵناسی حەقیقەت دەخاتەڕوو، هەتاکو بایەخ بە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵک و هاوپەیمانێتی لەگەڵیاندا بدەن، بەمەبەستی یارمەتیدانیان بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەیەکی باشتر دەربارەی ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژین و دروستیدەکەن. بڕوانە ئەو وتارەی (جاک دونزیلو) دەربارەی کتێبەکەی (دوبیە): کاری کۆمەڵگەکان (٢٠٠٩)، لەژێر ناونیشانی: کۆمەڵناسی بەکەڵکی چی دێت؟ لە گۆڤاری ئسپری (Esprit) ژمارەی ئاب/ئەیلولی ٢٠٠٩دا بڵاویکردۆتەوە. منیش لەکاتێکدا بیروڕای خۆم بەپشتبەستن بە چەند بیریارێکی خۆرئاوایی بەهێزدەکەم، دژی بانگەوازەکەم نیم سەبارەت بە پیادەکردنی بێفیزی، بەڵکو لە گۆشەنیگای هەڵهێنجانی پەندو وانەکانەوە ئەوە دەکەم. واتە ئەوەی لە جیهانی عەرەبدا لیمان چاوەڕواندەکرێت، تێکشکاندنی قۆزاخەی ئایدیۆلۆژیانەو تێپەڕاندنی دابەشکردنە ناسیونالیست یان ئایینیەکانە لە لقەکانی مەعریفەدا، بەمەبەستی بایەخدان بە پێشهاتەکان و تێگەیشتنی ڕووداوەکان و دەستنیشانکردنی کێشەکان، بۆ بەشداریکردن لەو ۆرکشۆپە فیکرییەدا کە لەسەر ئاستی جیهان چالاکە و زیاتر لە وڵات و لایەنێک بەشدارە تیایدا.

## ئەقڵانیبوون و شەیتانبوون
## خواناسی و خوانەناسی

قسەکردن دەربارەی ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە ناونیشانە ژیوارییەکان و داخوازییە بوونخوازەکانەوە هەیە، وەک بەختەوەری و حەقیقەت، یان خوا و ئەقڵ، یاخود ئازادی و دادپەروەری و ناونیشانەکانی تر، کە چەند مەسەلەیەکن جێی ناکۆکی و ئیشکالییەت و بەهەڵەتێگەیشتنن، کۆتایی نایەت و بەردەوام چەندین پرسیاری شپرزەکەر و بەگیرهێنەر بەرهەمدێنن، هەتاکو ئەو ناونیشانانە بەردەوام بکەونە بەر پێداچوونەوە و بنیاتنانەوە، بەمەبەستی فراوانکردن و دەوڵەمەندکردن، یان گۆڕین و نوێکردنەوە.

تەنیا هەواڵ و زانیارییەکان بە لۆژیکی هاوجووتبوون و دڵنیایی، ڕاستگۆیی یان درۆ، ڕاست یان هەڵە لێیان دەکۆڵرێتەوە، بەڵام بیرۆکەکان کە چەند ناونیشانێکی بوونخوازن، ئەوا سەلماندنیان گرەوکردنە لەسەر ئەوەی کاریگەن و کاریگەریی بخەنەوە، بەجۆرێک کە لەکاتی خوێندنەوەی ڕووداوەکەدا بەشدارییبکەن لە گۆڕینی دیمەنەکەدا، یان چەند ڕووداوێکی مەعریفیی بێوێنە پێکدێنن، بەئەندازەی ئەوەی چەند کەرەستەیەکی کارامەن بۆ تێگەیشتن و دەستنیشانکردن. بۆیە بە لۆژیکی خوڵقاندن و گۆڕانکاری مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، بەوپێیەی تۆڕەکانی پەیوەندی و کارلێککردنن. مەسەلەکانی وەک ڕۆشنگەری، ئەقڵانیەت، ڕەخنە و هیومانیزمیش بەهەمان شێوەن.

### ١. ڕۆشنگەری:

ڕۆشنگەری، بەتێگەیشتنە نوێکەی، مانای ئەوەیە مرۆڤ بەرپرسیارێتی بەرامبەر بەخۆی بگرێتە ئەستۆ و سەربەخۆیی فیکریی خۆی پیادەبکات، بەهۆی بەکارهێنانی ئەقڵی خۆیەوە بۆ پێکهێنانی بوونی خۆی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆی، بەبێ زەوتکردن یان چاودێریکردن لەلایەن مەرجەعییەتی لاهوتی یان دەسەڵاتێکی پیرۆزەوە. هەروەها مانای دەرچوونی مرۆڤە لە ساوابوون و گەیشتنە بە پێگەیینی ئەقڵی، وەک ئەوەی (کانت)ی فەیلەسووف پێناسەیدەکات، کە یەکەمین کەسی

سەردەمە نوێکان بوو دەرگای بەڕووی سەردەمی ڕەخنەدا کردەوە، کە بەپلەی یەکەم ڕەخنەگرتن بوو لە خودی ئەقڵ.

بەڵام ئایین دانانە بە کۆیلایەتی و پاشکۆیەتیدا بۆ دەسەڵاتێکی خواوەندانەی دەرەکی. ئەمەش ئەوەیە کە خودی داستانی ئایین دەیخاتەڕوو و باسی ئەوە دەکات شەیتان لەناو فریشتەکان دەکرێتە دەرەوە، چونکە بەپێوانەی ئەقڵ سەرپێچیی فەرمانی خواوەندانەی کردوە، وەک ئەوەی لەسەرەتای کتێبی «الملل و النحل» (شەهرستانی)دا دەخوێنرێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە، کێشەکەی شەیتان لەگەڵ خوای خۆی ئەوە بووە، کە ئەقڵی خۆی لە بواری لێپێچینەوە و ناڕەزاییدەربڕین و بەڵگەهێناوەدا خستۆتەکار، لەکاتێکدا ئایین ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانە. بێگومان ڕوویەکی تر کێشەکە ئەوەیە کە شەیتان سەرچاوەی گومان و دەسەڵاتی گومڕاییە بەسەر ئادەمیزادەوە، وەک ئەوەی لە گوتاری سرووشی خواییدا هاتووە. شرۆڤەکردنی داستانەکە بەهەردوو ڕووەکەیدا ئەوەیە، کە جیهان بەبێ لێپێچینەوە یان ناڕەزاییدەربڕینێکی ئەقڵانی ناچێتەڕێوە، هەوەس و گومڕایی و فیتنەش بنەڕەت و بزوێنەرن، نەک ئەقڵ.

بەم مانایە، ڕۆشنگەری ناکۆکە لەگەڵ ئایین، بەڵکو لەوانەیە لە بنچینەوە هەڵوێستی ئایینی هەڵتەکێنێت، کە تیایدا داندەنرێت بە کۆیلەیەتی و پاشکۆیەتیدا بۆ دەسەڵاتی خواوەندانە، گوێڕایەڵی و خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەوەی مرۆڤانە نییە، بەڵکو باڵاڕەو یان ئەودیوسروشتییە. (ئەبوعەلا) پێش سەردەمی نوێ و ڕۆژگاری ڕۆشنگەریی عەرەبی وتویەتی «دوان خەڵکی سەر زەوین: ئەقڵدارێکی بێدین، ئەویتر ئایندارێکی بێئەقڵ.»

## II. شەیتانبوون:

ئەمەش مانای ئەوە نییە خەڵک ئەقڵی خۆی بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانیان بەکارناهێنن، چونکە ئەقڵ ئەو شتەیە کە دادپەروەرانە لەنێوان خەڵکدا دابەشکراوە، وەک ئەوەی لە هەندێک لێکۆڵراوە ئیسلامییەکانی (ڕازی) و دواتر لەسەر زاری (دیکارت) باسکراوە. هەندێک تاک هەن لەمبارەیەوە لە خودی شەیتان شەیتانترن. وەک باری هەندێک پیاوی ئایینی، کە بە بەڵگەکانی ئەقڵ داکۆکی لە بڕواکانیان دەکەن، یان کار بۆ بەدەستهێنانی موچەکەیان دەکەن، یاخود بڕوا بە دەستوپێوەندەکانیان دەهێنن واز لە ئەقڵی خۆیان بهێنن، هەتاکو ملکەچی ئەوان بن یان ببنە دیلی دەسەڵات و ئارەزووی کاتی و بەتارماییکردنەکانی ئەوان. وەک ئەو گەمژە ڕووناکبیرە یان تیرۆریستە

بەکافرکەرە کردی کە چەقۆی لە (نەجیب مەحفوز) دا، بۆ جێبەجێکردنی فەتوای شێخەکەی و بەدەستهێنانی ڕازیبوونی خوای خۆی.

ئەمەش سەیرنییە، چونکە ئەقڵ توانینی مرۆڤە. تەنانەت کاتێک یەکێک هەوڵدەدات ئەقڵی خۆی بخاتە ژێر دەسەلاتی هێزێکی بالاوە، ئەوە لە ئەقڵەوە سەرچاوەدەگرێت و ئەو کەرەستەکانی ئەقڵ بەکاردێنێت. وەک ئەوەی لەو بەڵگەهێنانەوە ئاخاوتننامێز یان لاهوتیەتەدا بەدیدەکەین کە خاوەنەکانیان بە بەڵگەی ئەقڵی بەرگری لە هەڵوێستگەلی بڕوامەندی خۆبەدەستەوەدەر دەکەن. ئاشکرایە هەندێک لاهوتیی داهێنەری وەها هەن، کە لە بواری کارەکەی خۆیاندا- لە ڕووی پرسیار و کەرەستەوە- داهێنەرن و لەو فەیلەسووفانە نوێگەرترن کە بەشێوەی تەقلیدی یان فەندەمەنتالیستانە مامەڵە لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆیان دەکەن، بەڵکو کەسانی گومڕا لەناو خودی کایەی فەلسەفەدا هەن، وەک ئەو نموونانەی بەدیاندەکەین، لە (نیتشە)وە بیگرە تاکو دەگاتە (میشال ئونفرای)، ئەمە ئەگەر تەنیا ڕۆژگارە نوێکانمان وەرگرت. بەم مانایە، فەلسەفە هەمیشە کۆششدەکات بۆ ڕزگاربوون لە میراتی فەندەمەنتالیسانەی خۆی، بە قاڵبە ڕەقهەڵاتوو و شێوازە مۆمیاکراو و میتۆدە نەزۆکەکانییەوە...

بەهەرحاڵ، داهێنانی چارەسەری ئایینی بۆ کێشەی مرۆڤانە، کە تیایدا مرۆڤ ملکەچی بوونەوەرێکی باڵا خوڵقێنەر و یاسادانەر یان تەگبیرکار بێت، بەئەندازەی ئەوەی دەسەڵاتدارێک بێت کە چاودێریدەکات و سزادەدات، لای ئەو پێغەمبەر و پەیامبەرانەی بیریان لێ کردۆتەوە لوتکەی شەیتانییە، بەمانا پۆزەتیڤ و ئەقڵانییەکەی: زیرەکیی لەڕادەبەدەر و خەیاڵکردنەوەی خوڵقێنەرانە بۆ بەدەستهێنانی دەستدان و داهێنانی ئامرازەکان یان دەروازەکان. ئەمەش سەیرنییە: چونکە مرۆڤ هەندێک جار نکۆڵی لەوە دەکات کە خود پیادەیدەکات، ئەوەش بە تۆمەتبارکردنی ئەویتر، بۆ پەردەپۆشکردنی ئەوەی خۆی دەیکات، کتومت وەک چۆن گوتار ئەوە دەشارێتەوە کە لەسەری دادەمەزرێت. ئەمەش پارادۆکسەکەیە.

بێگومان فۆڕمی ئایینی، وەک پێکهاتەیەکی بوونخواز، کە وەهم و هەڵخەڵەتاندن تێکەڵدەبێت لەگەڵ ترس و خواناسی، شێوازێکی کاریگەر و سەرکەوتوو بووە بۆ کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی مرۆڤ. ئەوەش بە ئەندازەی ئەوەی چوارچێوەیەکی ئایینی بوو، بە بەها و شەریعەتەکانییەوە، کە سنووری لەنێوان هاوڕا و نەیارەکاندا داناوە، بۆ ئەوەی ڕێزی ماف و شکۆمەندیی یەکتر بگرن. کەچی ئەو فۆڕمە ئایینیە، کە بەدرێژایی سەدەکان کاری خۆی کردوە، خەریکە ڕاستبێژیی خۆی لەدەستدەدات، چونکە ئایین لەسەر دەستی پارێزەرانی زیاتر لە هەر ڕۆژێکی تر گۆڕاوە بۆ ئامێری

خوێنڕشتن و هێنانەئارای وێرانکاری. بۆیە چیتر وەک (مارکس) دەڵێت ئایین ئەفیونی میللەتان نییە، وەک (ڕێجیس دۆبرییە)ش تێیدەگات ڤیتامینی بێهێزەکان نییە، بەڵکو لەسەر دەستی پارێزەرانی بۆتە ڤایرۆسێکی کوشندە.

ئەمەش سەیرنییە، چونکە شتەکان، بەبێ گۆڕانکاریی خوڵقێنەرانە، یان هێنانەئارایەکی بنیاتنەرانە، کە پەیوەندیی لەگەڵ مانا پێ نوێدەبێتەوە، بەشێوەیەکی کاریکاتۆرانە یان ترسناک نەبێت وەک خۆیان لێ نایەتەوە. وەک ئەوەی ئێستا ئایین لە ڕێگەی فەتوای بارۆکە و شێرپێدان، یان دەستبردن بۆ مێیینە -تەنانەت ئەگەر منداڵێکی ساواش بێت- بەمەبەستی چێژوەرگرتن، یاخود کوشتنی نەیارانی ئایین و مەزهەب دەگەڕێتەوە. ئەمە وێڕای فەتوای یەکچاو، کە دەیسەپێنێت بەسەر پەچەدارەکاندا لە چاوێک زیاتر دەرنەخەن، هەتاکو نەبنە مایەی هەڵفریوان و وروژاندن. هەموو ئەوانەش فەتاوگەلی بێدەرەتان، یان مایەی پێکەنین، یاخود کوشندەن ناوی عەرەب لە جیهاندا دەزڕێنن.

## III. ڕۆحانیەت:

بەهەرحال، پیرۆز و ڕەها و نەگۆڕەکان تەنیا بەشێوەیەک وەردەگێڕرێن کە دەبێتە مایەی پێشێلکاری لەسەر زەمینەی واقیعی زیندوو، بەوپێیەی لە جیهانی گەردوونی و گەندەڵیدا تەنیا کەموکوڕ، یان ڕێژەیی، یان گۆڕاو، یاخود کاتی هەیە... بۆیە باشترە وەک سەرەنجامی چەند ئەزموونێکی بوونخواز و چەند تاقیکردنەوەیەکی بێوێنە مامەڵە لەگەڵ ئەو کتێب و دەقە ئایینیانەدا بکەین، کە پێشینە جێیانهێشتوون و شایستەی خوێندنەوەیەکی نوێی گۆڕانکاریخواز و پێکهێنانەوەن، بەمەبەستی وەبەرهێنانەوەیان بۆ بنیاتنانی خود و دروستکردنی ژیان، ئەمە وێڕای چاودێریکردنی زەوی و بوونەوەرەکانی. بەوپێیەی خوێندنەوەی بەپیت و بێوێنە ئەوەیە، کە وەک چەند ڕووبەرێکی شرۆڤەکردن مامەڵە لەگەڵ دەقەکاندا دەکات، ئەوەیان تیادا دەخوێنینەوە کە لەوەبەر نەخوێنراوەتەوە، لەپێناو نوێکردنەوەی مانا و بنیاتنانەوەی خوددا بەشێوەیەکی دەوڵەمەندتر و بەهێزتر، ئەگەرنا دەگۆڕێن بۆ چەند مەتەرێزەیەکی بڕواخواز و چەند سەنگەرێکی سمبولی.

باشترە مرۆڤەکان دەست لەوە هەڵبگرن کارەکان و دەستکردەکان و جەنگەکانی خۆیان بگێڕنەوە بۆ خوا، چونکە ئەوە تانەدانە لە خودی باڵا و پێشێلکردنی ناوە باشەکانیەتی. ئینجا زاڵمانە و هەڵخەڵەتێنەرانەیە عەرەب تاقە دەستکەوتی مێژوویی و ژیواری بەدەستهاتوو لەگەڵ ڕووداوی قورئانیدا، بەمەبەستی نۆزینەوە و داهێنان

وەژێرەوەنێن، بە مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەک جێبەجێکردنی ویستی خواوەندانە، یان بەرجەستەکاری سرووشی خوایی. هەروەها زاڵمانەو هەڵخەڵەتێنەرانەیە بۆ ئەوانیتر عەرەب خۆیان بە پەیامبەری ڕووتی ئاسمان بخەنەڕوو، لەکاتێکدا ئەوان بە زمان و شەریعەت و شمشێرەکانیان دنیایان داگیرکرد، بۆ ئەوەی ئیمپراتۆریەتێکی فراوان و دەوڵەمەند لە ڕووی سامان، بازاڕ، داهات، کەنیزە و چێژەکانیەوە دامەزرێنن.

مرۆڤ سەلماندویەتی پلە و پایەی، لەڕووی پەیوەندییەوە بە ئاست و جیهان و حەقیقەتە خواوەندەکان یان پیرۆز و باڵاڕەوەکانەوە، لەوە نزمترە کە حسابی بۆ دەکات یان بانگەشەی بۆ دەکات. مرۆڤ لەمبارەیەوە لە بەرەیەک زیاتردا تێکشکاوە، بەتایبەتی لە بەرەی ئایینیدا، کە وێرانکاری و سووتاندن و خراپەکارییەکان بەخۆوە دەبینێت. لە شەڕی (صفین)ەوە بیگرە هەتاکو شەڕە ئایینیەکان لە ئەورووپا، لە جەنگە جیهانییەکانەوە بیگـرە هەتاکو قەتڵوعامەکان لە عیـراق. لێرەوە بێسوودە جیاوازیی لەنێوان دەقی پیـرۆز و لێکدانەوەکانیدا بکەیـن. ئەم گەمەیـە کۆتوبەندی زیاتر بەرهەمدێنێت، بەئەندازەی ئەوەی ڕاستبێژیی دەداتە فەتواکانی هەڵگەڕانەوە و خراپەکاری. سووبەخشتر و سەلامەتتر و کەم مەترسیترە وەک بوونەوەرانی زەمینی دنیایی خوپێوەگرتوو مامەڵە لەگەڵ خۆمان بکەین، کە لە قوڕی سوور بە وزە و ئەتۆم و کوارکەکانییەوە خولقاوین، لەکاتێکدا خوا بەپێی لۆژیکی خولقاندن، بەڵکو بەپێی یاساکەی، تەنیا توانیی مادەکان بەشێوە و ڕەنگ و شەپۆل و ڕووناکییەکانی خۆیانـەوە بخولقێنێ، کەچی ئێمـە لەهەمان کاتدا خولقێنـەر، دەستبەسەراگر، سەنعەتکار، ئەندازیار و بنیاتنەرین... بێگومان ئەوەشمان لەبیرناچێت کە ئێمە شـەڕانگێـز و خوێنرێـژ، یان گەنـدەڵ و وێرانکاریشـین... لەوانەیـە ئێمە بەهۆی دڕندەبوونی دووقاتەوە دڕندەترینی ئامۆزا ئاژەڵەکانمان بین، چونکە توندوتیژییەکی دووجەمسەرە: سروشتی و کولتووری، پیادەدەکەین.

با دان بەوەدا بنێین، هەتاکو بزانین چۆن دەروونی خۆمان جڵەودەکەین و مەکینەی ئارەزووەکانمان لێدەخورین. چونکە بەشـەیتانکردنی دنیـا و جەسـتە ئاکامەکەی ئەوەیە، کە بەبێ ئەوەی حسابی بۆ بکەین هەوەسە تەڵەکەبازەکانمان داگیرماندەکەن، هەتاکو بەتارماییکردن و وەهم دروستکردن و هەڵخەڵەتاندن پیادەبکەین و زەبر لەوە بوەشێنین کە دەیپەرستین یان پلەی بەرزیی پێدەبەخشین. بەوتەیەکی تر، با دان بە سنوورەکان و نەمرنەبوونماندا بنێین، چونکە دەشێت بەوە ئاسۆیەک بۆ بنیاتنانی پەیوەندیی مرۆڤانەی وەها بکەینەوە، کە کەمتر توندوتیژ و شەڕانگێز، یان سەرکوتکەر و زاڵمانە بن و زیاتر ئەقڵانی یان پێکگەیشتنکار و هاوکاریخواز بن و لەوانەیە زیاتریش

ڕۆحانی بن. ئەمەش سەیرنییە، چونکە کەمتر ڕۆحانی و زیاتر دنیایی ئەوانەن کە خاوەن بڕوای ڕەها و خۆبەدەستەوەدانی کوێرانە و دڵنیایی یەکلاکەرەوە و فیکری تاقانە و تاکڕەهەندن، ئەوانەی دەیانەوێت خەڵک کۆیلە، یان ئامێری ڕەچەڵەکێکی پیرۆز، یاخود دەسەڵاتێکی ڕەها بن. ئەوانە ڕۆحانییەت لەناودەبەن، چونکە ڕوو لە دنیا دەکەن و لەسەر وێرانەکانی ململانێدەکەن، بەئەندازەی ئەوەی بانگەشەی ڕەتکردنەوە و بێبایەخکردنی دەکەن.

لێرەوە ڕەتکردنەوەی دنیا، خراپترین جۆرەکانی ڕۆحانییەت بەرهەمدێنێت. مەبەستم لە ڕۆحانییەت، بەوشێوەی شرۆڤەیدەکەم، پەیوەندیی مرۆڤە بە مانا و بەها یان ئازادی و شکۆوە، بەئەندازەی ئەوەی پەیوەندیی مرۆڤە بە خود و جەستەی خۆی، یان بەویتر، یاخود بە سروشت و جیهانەوە. بەم مانایە ڕۆحانییەت بەرجەستەکاری سەریەخۆیی فیکری و زیندوێتیی بوونخوازی مرۆڤە، بەئەندازەی ئەوەی گوزارشتە لە هەبوونی جوت جەمسەریی خۆی، کە سەرچاوەی خوڵقاندن و داهێنان و گۆڕانکارییە، بە بۆشایی و شڵەژان و ئاڵۆزییەکانیەوە، هەروەها بە گومان و ناکۆکی و پارادۆکس و قڵیشەکانییەوە...

## IV. پاشەکشەکردن:

ئەگەر ڕۆشنگەری بووبێتە چەمکێکی ناوەندی لە سەردەمی نوێدا و یەکێک لە دروشمەکانی مۆدێرنیتە، ئەوە مانای ئەوە نییە پێش (کانت) ڕۆشنگەری نەبووە، چونکە ستەمە بڕوای وامان هەبێت، لەبەرئەوەی هەریەکێک سەریەخۆیی فیکریی خۆی پیادەبکات و ئەقڵی خۆی بخاتەکار، ئەوە لە هەڵوێستێکی ڕۆشنگرییەوە سەرچاوەدەگرێت، جا کەسەکە فەیلەسووف بێت یان نا، فەلسەفاندنیش مەیلێکی ئەقڵیی خۆڕسکی مرۆڤە.

ئەمە لەسەر ئاستی تاک، بەڵام لەسەر ئاستی بەرهەمە ئەقڵییەکان، ئەوا ئێستا دەبینین هەر ڕووناکبیرییەکی زیندوو و خوڵقێنەر ڕۆشنگەرییەکانی خۆی هەیە، وەک چۆن پەردەپۆشکردن و تەمومژییەکانی خۆی هەیە. بەسە ئەوە وەبیربهێنینەوە کە (فارابی) ئەقڵی بە پرنسیپی گەردوون داناوە، بەئەندازەی ئەوەی خوای بەئەقڵانیکردوە. جارێکی تر (ئەبوعەلا) بەهێزەوە لەمبارەیەوە ئامادەدەبێت، ئەوەش لە ڕێگەی وتەکەیەوە کە پێش ڕۆشنگەریی (کانت) دەکەوێت: «ئەی ناشی ئەقڵت پێ بەخشراوە، ڕاوێژی پێ بکە، چونکە هەر ئەقڵێک پەیامبەرێکە». لەگەڵ ئەوەشدا (ئەبوعەلا) لە ڕووی پەیوەندیی بە ئەقڵی خۆیەوە، خۆپارێزیی مەعریفیانەی

پیادەکرد، چونکە بانگەشەی ئەوەی نەکرد لە رووی زانینەوە دەگاتە یەقین. بۆیە دەڵێت: «سەبارەت بە یەقین ئەوا یەقین بوونی نییە، بەڵکو ئەوپەڕی کۆششکردنم ئەوەیە مەزەندە و گومان بکەم». ڕاستە ئەو نکۆڵیی لە پێغەمبەرایەتیی کرد «پێتوانەبێت وتەی پێغەمبەرەکان ڕاستە، بەڵکو قسەی هەڵبەستراوی ئەوانن»، ڕاستیشە ئەو بەگوێی خوای خۆی نەکرد و بە گومڕایی فەرمانی خوای ڕەتکردەوە «ئەی خوای ئاسمان ئەو مرۆڤە بێگوناهە شتانێکی لەتۆ بینی کە حەزیان پێ ناکات، بۆیە گومڕابوو». ئەگەرچی (ئەبو عەلا) بەواتای ئایینی و غەیبی گومڕابوو، بەڵام لەسەر ئاستی فیکری و بوونخوازی خواناس بوو، بەراورد بەو پیاوانەی ئایین کە بانگەشەی بەدەستەوەگرتنی حەقیقەت و قۆرخکردنی دڵنیایی دەکەن، بۆ بەهێزکردنی هۆکارەکانی ململانێی نێوان خەڵک و چاندنی تۆوەکانی فیتنە لەنێوان کۆمەڵەکاندا، کە دەبێتە مایەی گەڕانەوەی ئەوەی پێش سەردەمی ڕێنسانس و ڕۆشنگەری: سەردەمی محەمەد عەبدە و شبلی شەمیل.

شێخ (محەمەد عەبدە) دەیوت: «پاش مردنی پێغەمبەر هیچ چاودێرییەک بەسەر ئەقڵەوە نەماوە». ئەمەش هەڵوێستی ڕۆشنگەرانەی شێخە، لەکاتێکدا ئیمڕۆ نەفامی و پاشەکشەکردن لەئارادایە، چونکە هەر بانگەشەکارێکی پلە هەرە نزم یان دەرچووی قوتابخانەیەکی ئایینی، کە لە شێخەکانییەوە هەندێک حەدیسی لەبەرکردبێت، بەبێ ئەوەی باش بیانخوێنێتەوە، دەتوانێت خۆی وەک سەرچاوەیەکی فەتوا یان چاودێرێک بەسەر موسڵمانەکانەوە دابنێت. سەرەنجامیش ئەوانە بەکافربکات کە جیاوازیی بیروڕایان لەگەڵیدا هەیە، یان بیر لە دامەزراندنی میرنشینێکی ئیسلامی بکاتەوە، هەتاکو شەڕێکی جیهادکارانە بەرپابکات و وڵات و خەڵک لە شەڕێکەوە بگلێنێ کە بەرەو لەناوچوون و وێرانکاریان دەبات.

لێرەوە ئێمە کەمتر پێویستمان بە بانگەشەکاری کۆن و نوێ هەیە، ئەوانەی کاریان لەسەر دامەزراندن و یاسادانان بۆ فیتنەکان کردوە و دەکەن، یان کاریان بۆ بەرهەمهێنان و هەناردەکردنیان کردوە، وەک ئیبن بابویە و ئیبن تیمیە یان نموونە هاوچەرخەکانیان، هەروەها بەشێوەی ئەوەی لە شەڕە سمبولییەکانی نێوان قەرزاوی و تەسخیری دا دەردەکەوێت.

زیادە بانگەشەمان هەیە، بەڵام ئەو بیرۆکانە کەمن کە خوڵقێنەر و بەپیتن و دەکرێت بگۆڕێن بۆ چەند فۆرمێکی ژیواری و چەند هاوکێشەیەکی بوونخوازانەی وەها کە بەشێوەیەکی بنیاتنەرانە و بەرهەمدار دەرفەت بۆ بەدەستهێنانەوەی دەستپێشکەریی مێژوویی و پیادەکردنی ئامادەگی و کارابوون لەسەر گۆڕەپانی جیهان دەڕەخسێنن.

ئەوەی لەمبارەیەشەوە دەشێت بکرێت، بەرهەمهێنانی زانینەکانە دەربارەی ئایین و کەلەپوور و شوناس، بەشێوەیەک کە چەندین گۆڕانکاریی بونیادی لە کولتوور و سیاسەتدا بهێنێتەدی. بۆیە ئەوەی لە کەلەپوورەکەماندا زیاتر پێویستمانە، لانی کەم بۆ بنیاتنانی چەند فۆرمێکی ژیواری و ئاشتیی ئەهلی، خودی ئەو ئەدیب و بیریارە خاوەن ئەقڵە کراوە و تێڕوانینە ڕێژەیی و میتۆدە فرەلایەن و شوناسە ئاوێتانەی هاوشێوەی ئەبوعەلا و فارابی، یان ئیبن ڕوشد و ئیبن عەرەبین.

## ٧. گەڕانەوەی ئەقڵ:

ئەو مشتومڕەی دەربارەی ئەقڵ و ڕەخنە لەئارادایە، ڕووەکەی تری مشتومڕێکی گشتیترە، کە لەنێوان پێڕەوکارانی کەلەپوور و لایەنگرانی مۆدێرنیتەدا لەئارادابووە، ئەوەش لە ساتی دەستپێکردنی ڕۆژگاری نوێی عەرەبەوە و بەهۆی بەریەککەوتنی لەگەڵ کولتووری خۆرئاواییدا.

گومانی تێدا نییە، پیاوانی ئایینی نوێکەرەوە بەم شێوەیە یان بەشێوەیەکی تر کەوتونەتە ژێر کاریگەریی مۆدێرنیتەی فیکرییەوە، بە نەریتە ڕۆشنگەری و دروشمە جیاوازەکانیەوە، وەک ئەقڵانیەت، ئازادی، پێشکەوتن، عەلمانیەت و مەیلی مرۆڤدۆستانە. بۆیە ئەوانە هوشیارانە یان ناهوشیارانە، دانی پیادا بنێن یان نا، بەیەکێک لە ماناکان بەرهەمی مۆدێرنیتەن. ئەمەش سەیرنییە، چونکە دەشێت ئەوەی نەیارین یان مشتومڕی لەگەڵ دەکەین، بێ ئەوەی چاوەڕانبین تیخمان بکات، بەتایبەتی ئەگەر خاوەن بیرۆکەی نوێ، خوڵقێنەر و بەپیت، دەوڵەمەند و بێوێنە بێت. گرنگ لەوەدا جۆری بەرهەمەکەیە: چۆن مۆدێرنیتە لە بانگەوازەکان و پرۆژە و گوتارەکانیاندا دەخرێتەگەڕ؟

بێگومان هەڵوێستەکان لەناو ئەوانەدا جیاوازن، هەیانە بەڕووی فیکری نوێدا، بە ئاقار و قوتابخانە جیاوازەکانیەوە، کراوەبوون و پێیانوابوە فیکری ئایینی، ئەگەر زیندوێتی و نوێبوونەوەی بوێت، ناچارە سوود لەوانە وەربگرێت، کە ڕووناکبیریی خۆرئاوا، بە لقە مەعریفی و ڕەوتە بەهاخوازییە جۆربەجۆرەکانەوە، بەرهەمیهێناوە.

بەڵام ئەمە هەڵوێستی کەمایەتییەکی دەگمەن بووە، چونکە زۆرینە ڕێڕەوی جیاوازی تریان گرتۆتەبەر. هەیانە بێشەرمانە و خوانەناسانە زانینە زانستییەکان بەتاڵاندەبەن و ڕەچەڵەکیان دەگێڕنەوە بۆ قورئان. هەیانە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەقڵی نوێ دەڵێت ئیسلام ئایینی ئەقڵە، هەتاکو شایەتی لەسەر نەزانیی ئاوێتەی خۆی سەبارەت بە ئایین و ئەقڵ بدات، واتە دەریبخات مانای ئەوە نازانێت کە دەیڵێت. ئەم میکانیزمە

فیکرییە، واتـە میکانیزمی ئاوەژووکردنـەوەی حەقیقـەت، تەنانەت (شێخ محەمەد عەبدە)ش لەدەستی ڕزگاری نەبوو، کە شارستانیەتی نوێی خۆرئاوا سەرسامیکردبوو، بۆیە هەوڵیدا گرنگترین دەستکەوتەکانی بگێڕێتەوە بۆ ئیسلام.

گرووپی سێیەم چەندین دروشمی نوێ بەرزدەکاتەوە، بەڵام بەبێ بڕوابوون و تەنیا بۆ سواربوونی شەپۆلەکە و ڕازاندنەوەی وێنەکە، وەک ئەو مۆدێرنیستانەی بەشێوەیەکی بۆش دروشمەکانی ئەقڵانیەت و ڕۆشنگەری و دیموکراسی دووبارەدەکەنەوە.

هەروەها ئەوانە هـەن کـە ئێستا داوای بەکارهێنانی ئەقڵی ڕەخنەگرانە لە گشت مەسەلەکاندا دەکەن، پاش ئەوەی بەشی هەرە زۆری ژیانی خۆیان سەرقاڵی کارکردن بوون بە زمانی غەیـب، گوێزانـەوە، فەتوا و تیۆریزەکردنەوە بـۆ حکومەتی ئیسلامی. ئاکامەکەش ئەو فیتنە مەزهەبیانە بوو کە جەستەی نەتەوەی هەنجن هەنجن دەکرد و ئەو پەیوەندییانەی هەڵدەوەشاندەوە کـە لە بنچینەدا ڕزیبوون، وەک ئەوەی شەڕەکانی مزگەوت و مەرقـەدەکان دەیخەنەڕوو. سـەیریش نییـە ئاکامەکە بەو شێوەیە بێت، چونکە دەربڕینی دروشـمی ئیسلام چارەسـەر و ئەڵتەرناتیڤـە بەکەڵک نایەت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەحەددا ژیوارییەکان و ئەو هەقدارییە بوونخوازانەی پێویستیان بە نوێکردنەوەی ناونیشان و چەمکەکان هەیە.

لەکۆتاییشدا لەناو پیاوانی ئاییندا ئەوانە هەن، کە لە پاش کار لە کار ترازان، داوای پیادەکردنی عەلمانییەت دەکەن، بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسیی تایەفەگەرانەی هێرشبەر. وەک باری زۆربەی ڕووناکبیرانی عەرەب کە دروشمەکان ڕەتدەکەنەوە و ئینجا پاش بێکەڵکبوونیان بۆیان دەگەڕێنەوە. ئەمەش باری بانگەشەکارانی عەلمانیەتە، لەکاتێکدا ئێمە ئێستا، پاش قەیرانی مۆدێرنیتە و ڕۆشنگەری، عەلمانییەت بۆ ئەودیو عەلمانییەت تێدەپەڕێنین، بەجۆرێک کە دوانـەی عەلمانییەت و ئایین تێکبشکێت، بەهۆی دانانی هەردوو تۆردووگاکە لەبەردەم ڕەخنە و شیکردنەوە و هەڵوەشاندنەوەدا.

ئەمەش ئەوەیە کە ئەزموونی تورکی دەیخاتەڕوو و مەسەلەکە کۆکردنەوەی ڕووتی عەلمانیـەت و ئاییـن تێدەپەڕێنێ. هەروەهـا لۆژیکی پێوانەکردنی نەزۆک، بەمەبەستی تەماهیکـردن و هاوجوتبـوون، تێدەدەپەڕێنێت. چونکە مەسـەلەکە پەیوەندیی بە فیکرێکی ئاوێتەخـوازەوە هەیە، کـە واقیـع بە فـرە ڕوو و ئاست، یان فـرە شـێوە و شـێواز دەبینێت. ئەمە ئەو شتـەیە سـەرۆکی تورکیـا (عەبدوڵڵا گول) لەو وتارەدا دەریبڕیوە، کە پاش سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا دەریبڕی. ڕووەکەی تری فیکری ئاوێتەخواز، کارکردنە بە لۆژیکی گۆڕانکاریی خوڵقێنەرانە، بەمەبەستی گۆڕین و بنیاتنانەوە، بەشێوەیەک کە لۆژیکی چییەتییە

نەگۆڕەکان تێپەڕێنرێت و ڕووبکرێتە تۆڕی پەیوەندییەکان و کارلێککردنەکان.

## VI. تونێکاریی ڕەچەڵەکەکان:

لەگەڵ ئەوەشدا ناچارین بڵێین: شتێکی باشە هەندێک بانگەشەکار هۆشیان بەخۆیاندا بێتەوە و بگەڕێنەوە بۆ ئەقڵی ڕەخنەگرانە، ئەوەش لەبەر ڕۆشنایی چارەنووسە بێدەرەتان و وێرانکارەکانی پرۆژەی ئایینی، بەکۆپی و نموونە جیاوازەکانیەوە، ئەوەی کاریگەرییەکانی لەسەر زەمینەی واقیع دەبینین، کاتێک فەتوا خواناسی وێراندەکات و ناوی خوا دەکاتە شتێکی ترسناک و جەلاد، یان لۆژیکی فیقهە شێوازەکانی پێکەوەژیانی موسڵمانەکان و ئەوان و پێڕەوکارانی ئایینەکانی تر ژەهراویدەکات. ئەمەش بەرهەمی خراپی پشتبەستنە بە مەرجەعە ئایینیەکان، بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان تایەفە و مەزهەبەکان: هەڵوەشاندنی چەمکی هاوڵاتیبوونی کۆکەرەوە، یان وێرانکردنی ئاشتیی ئەهلی، نەک تەنیا لەسەر ئاستی پەیوەندییەکانی نێوان مەزهەبەکان، بەڵکو لەناو تاقە مەزهەبێکیشدا.

جارێکی تر، شتێکی باشە ئەوانە بگەڕێنەوە بۆ زمانی ئەقڵ و ڕەخنە، واتە بۆ ئەوەی لای ئەوانیتر ڕەتیاندەکردەوە و دواتر هاتوونەتەوە بۆ ئەوەی پیادەیبکەن و ڕەچەڵەکی بگێڕنەوە بۆ خۆیان، بەڵام ئەقڵانیەتی ڕەخنەگرانە بەپلەی یەکەم ڕەخنە لەخۆ گرتنە.

ئێستا ئەمە کاری ئەو بانگەشەکار و ڕێبەرانەیە کە تەلەفزیۆنەکان و ڕووبەرەکان و زانکۆکانیان داگیرکردوە: بەهۆی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەوە لە ڕەچەڵەک و بانگەواز و بەرنامەکانی خۆیان هەڵدەگەڕێنەوە و کار بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو نموونانە دەکەن کە پرۆژەی ئایینی دروستیکردون و بۆ جیهانی هەناردەکردوون: (١) ئەو بانگەشەکارەی ئەو فەتوایانە دەردەکات کە وامان لێ دەکات ببینە گەڵتەچیی جیهان. (٢) ئەو جیهادکەرە تیرۆریستەی دەیەوێت بەهۆی بەرپاکردنی شەڕ دژی جیهان، لە ڕێگەی پشتبەستن بە مۆدێل و داوەری و نەریتی سواو و بەسەرچووەوە، نەتەوە ڕزگاربکات. (٣) ئەو لێکدەرەوە جادووگەرەی لەبری بەرهەمهێنانی مەعریفەیەکی نوێ دەربارەی ئایین و جیهان، زانینەکانی ئەوانیتر تاڵاندەکات. (٤) ئەو گەمژەیەی ڕووناکبیری کە پەردەدەدات بەسەر ئەقڵی خۆیدا، بۆ ئەوەی ببێتە داردەستی شێخەکەی و فەرمانەکانی جێبەجێبکات، هەتاکو ڕەزامەندیی خوا لە بەهەشتدا بەدەستبێنێت، لەکاتێکدا شێخەکەی لێرە بەهەشت، بە خۆشی و سامان و دەسەڵاتەکانیەوە، بەدەستدێنێت.

ئەمانە ئەو نموونانەن کە بەهۆیانەوە بەشێوەیەکی بێدەرەتان، هەژار، دوژمنکار و

کاریکاتۆری خۆمان بە جیهـان و ئەویتـر دەناسێنین... بەرهەمەکەش ئەوەیە ئەوانیتر بەوە تاوانباریکەین کە ناومان دەزڕێنن، لەکاتێکدا خۆمان جگە لەوە شتێکی تر ناکەین.

## VII . دانپیانان و پۆزشهێنانەوە:

لێرەوە بنچینەی هەڵوێستی ڕۆشنگەری و ڕەخنەی ئەقڵی، سـەرەتا بـە دانـنان بە قەیرانەکە و دەستنیشانکردنی هۆکە دەستپێدەکات، ئینجا پۆزشهێنانەوە لەبەر ئەو هەڵە و خراپەکاری و کارەساتانەی ئەنجامی بانگەشە و پرۆژەکان هێناویانەتەئاراوە. ئەوەبوو بانگەشەکاران، پاش هەرەسهێنانی پرۆژەی ناسیونالیزم و شکستخواردنی مۆدێلی سۆشیالیستی کە لە بنەڕەتدا مردووبوو، دروشمی «ئیسلام چارەسەر و ئەڵتەرناتیڤە»یان بەرزکردەوە. ئاکامەکەش کۆکردنەوەی خراپەکانی پرۆژەکانی پێشوو بوو، وەک ئەوەی هاوپەیمانێتی ناسیونالیستی و چەپڕەو و ئایینی لە ژێر ئاڵای ڕابەری ئایینی یان موجاهیدی خواوەندیدا پیشانیدەدات، بۆ ئەوەی کۆمەڵگەکان هەژارتر و پاشکەوتووتر و ستەمکارتر بن، یان هەتاکو تیرۆر بۆ جیهان هەناردەبکرێت. لێرەوە کەمترین شتێک، کە پێویستمان پێی هەبێت، بانگەشەکردن و ئامۆژگاریکردن و مژدەبەخشینە، ئەوەی زۆرتریش پێویستمان پێیەتی، دامەزراندنی چەندین ناوەندی توێژینەوەی زانستی و پشکنینی ئەقڵی و لێکۆڵینەوەی مەعریفییە، بۆ توێکارییی نەخۆشییە کولتووری و ئایینیەکانمان، بەمەبەستی تێگەیشتن و دەستنیشانکردن. بەم مانایە، ئـەو بێئایینەی کـار لەسـەر دەق و پیادەکردنـە ئایینیەکان دەکات، بۆ نوێکردەمنەوەی بیرۆکە و چەمک و بەهاکان، ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ و بنیاتنەرانەی لە کۆمەڵگەکەی و جیهاندا دەبێت، ئەمەش زۆرتر لەو ئیماندارە دەمارگیرەی دیوار و خەندەقەکان لەنێوان مەزهەب و تایەفەکاندا هەڵدەچنێت.

## VIII . قەیرانی ئەقڵی گەردوونی:

ڕەخنەلەخۆگرتن، کە کارێکی ڕۆشنگەرانەیە، لە «بێفیزییەکی بوونخوازانە»، «خۆپارێزییەکی فیکری»یەوە سەرچاوەدەگرێت، بەشێوەیەک کە یەکێک وا لێ دەکـات دان بـە کۆتاییهاتن و سـنوورەکان و ڕێژەییبوونی بیـروڕا و کردارەکانی خۆیدا بنێت.

ئەم ڕەخنەیە تەنیا کایـەی ئایین و کارکەرەکانی (پاسەوانەکانی دەقەکان و کۆیلەکانی ڕەچەڵەکەکان و پۆلیسی فەتواکان) ناگرێتەوە، بەڵکو چالاکییەکی زەینیی ئاوێتە و فرەلایەنە، کار لەسەر دوو تەوەرە دەکات: بەرەی کەلەپوور بە

دایناسورو رەقهەڵاتنە بڕواخوازییەکانیەوە، بەرەی مۆدێرنیتە بە ساڵاچوو و چەمکە سواوەکانییەوە.

چونکە یەکێک لە نەخۆشییەکانی مۆدێرنیتە، کە بەدەست قەیرانی خۆیەوە دەناڵێنێت، بەخواکردنی ئەقڵ و دانانی مرۆڤە لە جێگەی خوا. هەروەها مامەڵەکردنە لەگەڵ دروشم و ناونیشانەکان وەک حەقیقەتی رەها و زاتی پیرۆز، وەک ئەوەی لاهوتیەکانی مۆدێرنیتە و رۆشنگەری مامەڵەیان لەگەڵ کرد. ئەمە یەکێکە لە نەخۆشییەکانی ئەو مۆدێرنیتەیەی بەهەمان لۆژیکی ئایینی باو کاریکردوە بۆ بەخواکردن و پیرۆزکردن و بەخشینی سیفەتە رەها و باڵارەوەکان بە رووداو و کەسەکان، واتە بەشێوەی ئەوەی پێچەوانەی خۆیەتی.

لێرەوە قەیرانەکە بونخواز و هەمەلایەنە، واتا پەی بە ئەقڵی گەردوونی دەبات، بە مۆدێل و شێوازە کۆن و نوێکان، ئایینی و عەلمانییەکان، لاهوتی و فەلسەفییەکانیەوە. ڕزگاربوون لە قەیرانەکە ناچارماندەکات بانگەشەکانی دڵنیابوون و بەدەستەوەگرتن و کۆنترۆڵکردن خاوبکرێنەوە، جا ئەوە لەلایەن ئەو فەیلەسووفانەوە بێت کە بانگەشەی ئەوە دەکەن بەدەستەوەگرو شایەتەکانی حەقیقەت و هەڵگرانی کلیلەکانی حەقیقەتن، یان لەلایەن ئەو لاهوتیانەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوان خەلیفەکانی خوا و نوێنەری ئەو و ئایەتەکانی و هەڵگری مۆرەکانی ئەون.

ئەمە ئەو نەخۆشییەیە کە کۆمەڵگە و کولتوورەکان لەناودەبات: (١) ناوەندیبوونی مرۆڤ کە ژینگە و سروشت وێراندەکات. (٢) نەجسییەتی بڕواخواز کە فۆرمەکانی ژیانی نێوان خەڵک مینرێژدەکات. (٣) تێڕوانینی تاکرەهەند کە واقعی ئاڵۆز لە تاقە رەهەندێکدا کورتدەکاتەوە. (٤) پەرستنی رەچەڵەکەکان و سەنگەرلێدان لەپشت دەقەکانەوە، بەمەبەستی هەڵگەڕانەوە لە مەسەلەکان و خۆهەڵواسین بەشتەکاندا، تەنانەت دژەکانیشیان. (٥) پاسەوانیکردنی چەمکەکان بەگۆڕینیان بۆ چەند قاڵبێکی رەقهەڵاتوو و نموونەیەکی سواو کە وزەی زیندووی خولقاندن و داهێنان ئیفلیجدەکەن. (٦) هەموو ئەوانەش لە نەخۆشییە هەر گەورەکەوە سەرچاوەدەگرێت، کە دیاردەی خواوەندبوونە و بە هەردوو رووەکەی دەردەکەوێت: ویستی بەخوابوون، ئەوەی حەشامات و جەماوەرێک بەشداریی تێدا دەکەن، کە سرووتەکانی پەرستن و پیرۆزکردنی سەرۆک و سەرکردە و پاڵەوان و ئیمامەکانیان پیادەدەکەن، بەڵام بۆ ئەوەی ئەوانیش ببنە کۆیلەی ئارەزووە کاتیەکان و ناوبانگ و دەسەڵات و ئەفسانەکانی خۆیان. بەمجۆرە خواوەندبوون لەسەر دەستی پێغەمبەرە نوێکان پیادەدەکرێت، هەتاکو ئەو هەموو خراپەکاری و کارەساتە بچنینەوە.

یەکێک لە پارادۆکسەکان لەمبارەیەوە ئەوەیە، بانگەشەکارە کۆن و نوێکان، کە

شمشێری حەرامکردن و پیرۆزکردنیان بەرزکردۆتەوە و بە لۆژیکی بەکافرکردن دژی ئەوانیتر کاریانکردوە، چەکەکەیان لە دژی خۆیان هەڵگەڕاوەتەوە و وایان لێهاتووە یەکتری ڕەتدەکەنەوە، ئەوەش لە ڕێگەی بەکافرکردن و پشتگوێخستن و کێشمەکێش و فیتنە مەزهەبییەکانەوە، کە لە گۆڕەپانێکی عەرەب زیاتر هەڵدەگیرسێن. هەروەها یەکێک لە پارادۆکسەکان ئەوەیە، ئەوانەی لە چوارچێوەکانی ئایین دەچنە دەرەوە و ئیماندارەکان بە کافر یان بێئایین دادەنێن، هەموویان قبوڵدەکەن، جا ئەوانە ئیمانداری (مەسیحی و موسڵمان) بن، یان موسڵمانی (شیعە و سوننە) بن، ئەوەش بەهۆی تێڕوانینی ئاوێتەیانەوە و لەوانەیە بەهۆی ئیمانی فراوانیانەوە بێت، کەچی خەڵکی ئیمانی ئایینی جگە لە بەکافرکردنی یەکتر شتێکی تر نازانن.

پێدەچێت ئەمە پاڵی بە پیاوانی ئایینیەوە نابێت عەلمانیەت وەک چارەسەری کارەساتەکە بخەنەڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ناڵێین خوا تۆباڵی خراپەکاریی پیاوانی ئایینی، کە یەکتری دەکوژن، دەدات بەسەر سەربەخۆکان و بێدینەکاندا، بۆ ئەوەی لەسەر دەستی پێغەمبەرە نوێکان ئەو وێرانکارییە بچنینەوە.

بەهەرحاڵ چیتر کێشەکە بەرەنگاربوونەوەی لاهوتیەت نییە، وەک ئەو عەلمانیانە دەریدەبڕن کە بەدرێژایی دەیان ساڵ بەرەنگاربوونەوەی هەوادارانی لاهوت شکستیانخواردوە. بەپێچەوانەشەوە، چیتر کێشەکە لە ئاڕاستەکردنی بەکافرکردن و بەخراپکردن لەلایەن هەوادارانی فەتواوە قەتیس ناکرێت، بەڵکو دوانەی عەلمانیەت و لاهوت تێدەپەڕێنێت، لەکاتێکدا هەندێک وڵاتی عەرەبی لە تەنوری شەڕی ناوخۆدا نقومبوون، کە ئیمانداران و میرەکانی جیهاد لەنێوان خۆیاندا هەڵیانگیرساندوە. با مۆدێرنیست و کەلەپوورخوازان لە سڕبوونی خۆیان بێداربنەوە، چونکە پاش شکستخواردنی پرۆژەکانی ناسیونالیزم و چەپڕەو و ئیسلامییەکان، کە خراپەکارییەکانی یەکتریان کۆکردۆتەوە، گرەوەکە ئێستا هەنگاونانە بۆ کردنەوەی چەند ئاسۆیەکی نوێ بەمەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵە مرۆڤایەتییەکان، کە کۆڵەکەکەیان فرەڕەهەندیی هێز، فراکسیۆن، تایەفە، ئاقار، حیزب، شێواز و شێوەکانە...

## IX. کەرەستەیەکی فیکریی نوێ:

ڕەخنە، بەوپێیەی هەستکردنە بە بێفێزیی بوونخواز و پیادەکردنی خۆپارێزییە، ئەرکێکی هەمیشەییە کە ڕاناوەستێ، چونکە بنەڕەت لای مرۆڤ ئەقڵ یان ژیری نییە، بەڵکو مەیل و هەوەس، یان لوتبەرزی و دەستەگەرییە، لەبەرئەوەی مرۆڤ

خاوەن پێداویستی و ئارەزووی کاتی، مەراق، خورافەکاری، دوودڵی، شڵەژان، ئاڵۆزی و پارادۆکسەکانی خۆیەتی. واتە خاوەنی شتانێکە کە وای لێدەکەن هەمیشە پێشێلی ئەوە بکات کە بانگەشەی بۆ دەکات، یان پیادەی ئەوە بکات کە دژی دەجەنگێت. لێرەوە بەردەوام پێویستی بە رەخنەلەخۆگرتن هەیە، لە رێگەی پابەندبوون پێوەی و راهاتن لەسەری، بەهۆی مەشقکردن و پراکتیک، یان کۆشش و ئیجتیهادەوە. رەخنەلەخۆگرتن هوشیاریی دژ بە شوناسە، ماوەیەکی رەخنەگرانەیە لەگەڵ خود، کارکردنی بەردەوامە لەسەر بیرۆکە و دامەزراوە و دەسەڵاتەکان، بۆ خاوکردنەوەی مەیلە نەرجسی و هەڵبژاردەخوازی و ناوەندیخوازییەکان، چونکە ئەوانە مەزنترینی ئەو نەخۆشییانەن، وامان لێ دەکەن رووبەرووی ئەو وێرانکاری و لەناوچوونەی مرۆڤ و سروشت ببینەوە، کە چاوەروانیان نەبووین.. ئەوەی من ناویدەنێم «پێکهاتنی دژەکان لەسەر دروستکردنی وێرانە».

ئەو سەردەمەی دەچینە ناوییەوە هیچ شتێک وەک خۆی ناهێڵێتەوە: نە ئایین و نە مۆدێرنیتە، نە کۆمەڵگە و نە دەوڵەت، نە فەندەمەنتالیست و نە عەلمانی، نە ئیسلامی و نە چەپڕەو، نە بانگەشەکار و نە رووناکبیر... بەڵکو هەمووشتێک، جا خود بێت یان کردار، لە رووی چەمک و ماناوە پێویستیان بەوەیە بخرێنە سەر مێزی لێکۆڵینەوەو توێکاری، لەپێناو سەرلەنوێ کۆکردنەوە و پێکهێنان، یان خستنەگەر و خستنەکاردا...

لێرەوە ئەو دروشمانەی ئێستا بانگەشەکاران لەناو پیاوانی ئاییندا بۆی دەگەرێنەوە، پاش ئەوەی مۆدێرنیستەکان بەکاریانبردوون، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە ئەقڵ و رەخنە و رۆشنگەرییەوە هەبێت، یان ئازادی و دیموکراسی و مەیلی مرۆڤخوازی و گەردوونخوازی، هەموو ئەوانە ئەو دروشمانەن کە کارامەیی خۆیان لەدەستداوەو پێویستیان بە نوێکردنەوە و بنیاتنانەوە هەیە، لەبەر رۆشنایی گۆرانکارییەکان و شۆرشە تەکنۆلۆژی و رووناکبیرییەکاندا و لەژێر کاریگەریی تێکشکان و هەرەسهێنانە ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئەخلاقی و ئابوورییەکاندا.

لەکۆتاییدا، ئایا لە رەخنەگرتنەکەمدا دەوێرم دەست بۆ پیرۆزەکان و نەگۆرەکان بەرم؟ بوێریی فیکری بۆ خۆی ئامانجێک نییە، هەروەها مەبەست لێی رەتکردنەوە یان تاوانبارکردن نییە، ئەگینا بۆ دژەکەی وەردەچەرخێت و سوودی نابێت، بەڵکو گرنگیی لەوەوە سەرچاوەدەگرێت کە هاندەرێکە بۆ نوێکردنەوەی چەمک و زانینەکان، جا ئەوە لە بواری ئاییندا بێت، یان لە بوارەکانی تردا، بەشێوەیەک کە بەشداریبکات لە دۆزینەوەی هەڵە و خراپییەکان، یان کردنەوەی دەرگاکان بۆ

دۆزینەوەی ئەو چارەسەرانەی یاریدەدەرن بۆ دەرچوون لە تەنگژەکە. بەهەرحاڵ، ئەوەی یەکێکمان دەوێرێت لە رەخنەگرتن و بیرۆکەکانی خۆیدا بیکات، بەراورد بەوەی قۆرخکارانی کلیلەکانی بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان دەوێرن بیکەن، هیچ نییە. مەبەست کارەکانی کوشتنی بێگوناهەکانە، کە ئیمانداری راهێنراو لەسەر خواناسی دەتۆقێنن، بەئەندازەی ئەوەی ئیمانەکەی رادەچڵەکێنن و بەهاکانی دەلەرزێنن.

بۆیە دەرک بەوە دەکەم کە بڵێم، رەخنەگرتن مانای رەتکردنەوەی ئایین نییە، کە رەهەندێکی شوناس یان مەجەعیەتێکی مانایە، بەڵکو مانای دۆزینەوەی چەندین دەستدانی نوێیە بۆ کارکردن و بنیاتنان. چونکە تۆپەکە ئێستا لە یاریگەی پیاوانی ئاییندایە، بەتایبەتی مەبەستم سەرکردەکانی کاری ئایینی مەیدانییە، ئەوانەی دووقات ئەو پرنسیپ و نەگۆڕانە پێشێلدەکەن کە ئەوانیتر بە پێشێلکردن و دەستکاریکردنیان تاوانباردەکەن، پاش ئەوەی ئایینیان گۆڕیوە بە شتێک کە لە دادگاکانی پشکنین دەچێت و دەقە ئایینیەکان و لێکدانەوەکانیان گۆڕیوە بۆ ئەو سەنگەرانەی لێیانەوە تەقە لە جیاوازی ناوخۆ و ئەویتری دەرەوە دەکرێت. کەواتە باشترە خۆپارێزی پیادەبکەین، کە لە سەرووی هەموو چاکەکارییەکانی ناو قورئانەوەیە، بەجۆرێک کە کارکەرانی بواری ئایین دەستبەرداری هەندێک لە بانگەشە و وەهم دروستکردنەکانی خۆیان بن، واتە بەدەستەوەگرتنی کلیلەکانی حەقیقەت، قۆرخکردنی رەوایەتیی ئیماندارانە، بیرکردنەوە بە لۆژیکی دژ و دوورخستنەوە، هەوڵدان بۆ بەئیسلامیکردنی ژیان بەگشت لایەن و وردەکارییەکانیەوە، لەپێناو دامەزراندنی سیستەمێکی تۆتالیتاریدا، کە کۆمەڵگەکان دەگۆڕێت بۆ سەربازگەکان و ژیان دەکاتە جەهەنەمێک کەس دەرەقەتی نایەت.

پوختەی قسەکە: بانگەشەکانی حەقیقەتی رەها، دەقە پیرۆزەکان، باشترین نەتەوە، تیمی رزگاربوو، بەشەرەفترین بوونەوەر و چەمکەکانی تر سوودیان چییە کە دەبنە مایەی دەستدرێژیکردنی سمبولی بۆ سەر ئەویتر، بەئەندازەی ژەهراویکردنی کەشوهەوای پێکەوەژیان و وێرانکردنی پردەکانی پێکگەیشتنی خەڵک و کۆمەڵەکان؟ چونکە حەقیقەت لە دوائەنجامدا ئەوەیە کە دەتوانین لەواقیعدا بیخوڵقێنین، یان ئەوەیە سەبارەت بە ئەنجامدان و جێبەجێکردنی ئەوەی شایستەی تاوتوێکردنە لەگەڵ ئەویتر هەستیپێدەکەین، بەمەبەستی سوودگەیاندن یان دەوڵەمەندکردنی دوولایەنە، بەشێوەیەک کە پێی بگۆڕێین و بەشداریی لە گۆڕینی ئەویتر و واقیعدا بکەین.

باشترە مەسەلەکان بگێڕینەوە بۆ رەچەڵەکی خۆیان، ئەوەش بە مامەڵەکردن لەگەڵ

بواری ئایینی، وەک ڕەوایەتیەک کە لەگەڵ ڕەوایەتییەکانی تری کایە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بکەوێتە کارلێککردنەوە، بەمەبەستی کردنەوەی چەند ئاسۆیەکی نوێ لەبەردەم پێگەیشتنی مرۆڤایەتیدا. کێشەکە ئێستا ئەوە نییە کێ زیاتر نوێنەری ئیمانی ڕاستە، یان کێ زیاتر مافی خیلافەتکردنی هەیە، هەروەها مژدەبەخشینەوەی هەوادارانی ئەم مەزهەب لەسەر گۆڕەپانی مەزهەبەکەی تر نییە. مەسەلەکە ئەوەیە مرۆڤ ئەو «ئەمانەتییە» بگرێتەکۆڵ کە لە هەڵگرتنی هەڵدێت، بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەحەددا گەورەکان و ئەو مەترسیانەی هەڕەشە لە زەوی ئەوانە دەکات کە لەسەری دەژین. هەروەها ئەوە لە بڵاوبوونەوەی توندوتیژی و پیسبوونی ژینگە و بەهەدەردانی سامانەکان و زۆربوونی هەژاریدا بەرجەستەدەبێت. واتە ئەوەی ئەنجامی ویستی چاوچنۆکی و خراپەکاری و دوژمنایەتی، یان لۆژیکی هەڵبژاردنخوازی و بەریەک کەوتن هەتا دەگاتە وێرانکاری و کەلاوە دروستکردن بارێکی نائاسایی لەسەر گۆڕەپانی جیهانی ڕادەگەیەنێت، چونکە چیتر ناکرێت جیهان بە ئەقڵییەتە باوەکان: فەندەمەنتالیستانە یان ئیمپراتۆریانە، تۆتالیتاریانە یان ستەمکارانە، جیهادکارانە یان ئینجیلخوازانە، کەریەلاییانە یان تەلمودییانە بەڕێوەببرێت...

ئەمەش چەندین ڕێکاری چەمکناسا، بونیادی، خولقێنەر و بێوێنەی پێویستە، بۆ بنیاتنانەوەی ناونیشانەکان، بەشێوەیەک کە پەی بە جوگرافیای مانـا، بە بەڵگەنەویست و پێشوختەکانیەوە، بەرێت. هەروەها پەی بە مەرجەعیەتەکانی فیکر، بە پیرۆزەکان و نەگۆڕەکانییەوە، ببات. بەئەندازەی پەیبردن بە ئەولەویاتەکانی کار و ستراتیژەکانی دەستوەردان و نێوانکاری. لێرەوە بەڕێوەبردنی کاروباری مرۆڤایەتی و گەردوونی پێویستی بە ستراتیژێکی فیکریی نوێ هەیە، بۆ بەڕێوەبردنی شوناسەکان و مەسەلەکان و دەوڵەتەکان و پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکان، کە پێکدێن لە فیکری ئاوێتە، لۆژیکی گۆڕانکاریخواز، ئەقڵی تاوتوێکار، ئەمە وێڕای بێفیزیی بوونخواز و خۆپارێزیی فیکری.

# شوناسە دوورەگەکان و یەکە ئاوێتەکان لەبارەی بەڕێوەبردنی هەمەڕەنگییەوە

ئەمە توخنکەوتنێکی دوو جەمسەرەیە (١): دەستنیشانکردن و چارەسەرکردن، وەک لە ناونیشانەکەیەوە دەردەکەوێت: شوناسە دوورەگەکان و یەکە ئاوێتەکان. ئەگەر زمانێکی چەمکیی وردتریش بەکاربهێنم، ئەوا دەیخەمە ژێر چوار ناونیشانەوە: دانپیانان، نێوانکاری، فرەڕەگکردن و ئاوێتەکردن. ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەم توخنکەوتنی کیشەکەیە، ئەوەش چەند دەکرێت دوور لەو حوکمدانە پێشوەخت یان ئەو زەوتکردنانەی کاری پشکنین و لێکۆڵینەوە پەکدەخەن، جا لاهوتیی کەلەپوورخواز بن، یان مۆدێرنیستی عەلمانی. لێرەدا قسەکانم بە سێ تێبینی دەستپێدەکەم:

**تێبینیی یەکەم سیاسییە**، ئەویش ئەوەیە، کە من وشەی «بەڕێوەبردن»م پێ باشترەو لە زاراوەکانی تری وەک دەوڵەت، حکومەت، کۆمار، ئیمپراتۆریەت، یان خیلافەت بەچاکتری دەزانم، چونکە کەمتر دەسەڵاتخواز و پۆپۆلیستە و زیاتر دیموکراتی یان ڕێکارانەیە. بەوپێیەی حوکمڕانەکان لە دوائەنجامدا بەڕێوەبەر یـان وەکیلن، یان وەک (ئەبوعەلا) دەڵێت کرێگرتەن. بۆیە فرمانیان بەپلەی یەکەم، دۆزینەوەی ئامراز و ڕێکارەکانە، بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و چاککردنی بارودۆخەکان، یان چارەسەرکردنی کێشەکان و بەپیرەوەچوونی کارەسات و نەگبەتیەکان. بەم مانایە حوکمڕانەکان خواکانی بەدەر لە هەڵە یان پاڵەوانەکانی ئەفسانەیی نین و سەرتا پێویستە شێت یان سەرچڵی سەرلێشێواو نەبن و میللەت و وڵاتەکانیان نەکەنە کایەکانی تاقیکردنەوەی ئەفسانە ڕزگاریخواز، ئارەزووە کورتخایەنە ستەمکارەکان، پرۆژە ئیمپریالیستەکان و بانگەوازە مەحاڵەکانی خۆیان...

**تێبینیی دووەم میتۆدییە**، ئەوەیش ئەوەیە کـە زاراوەی «هەمەڕەنگی» نوێ نییـە، یەکەمین جار لەسەر ئاستی بایۆلۆژیای گشتی بەکارهێنراوە، کە زیندەوەرزانیی بەهەمەڕەنگییە بێوێنەکەیەوە لەخۆدەگرێت، بەڵام ئەوەی ئیمڕۆ تاوتوێدەکرێت،

ئەوەیە کە لە مەسەلەی رووناکبیریدا وەک دروشمێک دژی ڕەگەزپەرستی و نێرسالاری بەکاردەهێنرێت، وەک ئەوەی (والتەر بن میکڵن)ی توێژەری ئەمریکی دەریدەخات.

بەڵام چەمکی «فرەیی»، کە لە شەستەکانی سەدەی پێشوودا لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەکانی ناڕەزایی و خۆپیشاندانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داتاشرا، بۆ دانان بە مافەکانی ڕەشپێستەکان، ژنان، کەمایەتی و توێژە پەراوێزخراو یان دوورخراوەکاندا... ئەوا لە کایەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتیدا بەکاردەهێنرا، واتە لەبری زاراوەی «هەمەڕەنگ» کە جێیگرتۆتەوە، بەڵام ئێستا لە بواری پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکاندا بەکاردێت، بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاک جەمسەری، پاش ئەوەی مرۆڤایەتی ڕوویکردۆتە فرە جەمسەر و دەوڵەت و هێزی کاریگەر لەسەر شانۆی جیهان، یان لە بواری سیاسەت لەناو تاقە دەوڵەتێکدا بەکاردێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاقە سەرۆک، حیزب، بیروڕا، یان دەنگێک.

چەند زاراوەیەکی تریش هەن، کە جیاوازیخوازی لەسەر ئاستی ئابووری، لەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەکان یان خاوەنکار و کرێگرتەکاندا چارەسەردەکات، وەک چەمکی «یەکسانی»، کە دروشمێکی کۆنە بەئەندازەی کۆنیی مرۆڤ، یان چەمکی «هاوکاری»، کە داکۆکیدەکات لە یەکسانی لەسەر ئاستی ئەخلاقی.

جا ئەگەر هەر یەکێک لەم چەمکانە لە بوارێکی دیاریکراودا کاربکات، ئەوا پێچەوانەی یەکتر نین، وەک ئەوەی (بن میکڵن) بۆی دەچێت و پێیوایە ئەو هەمەڕەنگییەی لیبرالیستە نوێکان دەریدەبڕن، بۆ لەناوبردنی دروشمی یەکسانییە.

ئێمە لەبەردەم چەند چەمکێکداین، کە بەئەندازەی یەکتر دەوڵەمەندکردن یەکتری دەبڕن و دەکرێت کار لەسەریان بکرێت و بەشێوەی دوولایەنە وەبەربهێنرێن. ئەمەش مانای ئەوەیە، کە چارەسەرکردنی مەسەلەی هەمەڕەنگی تاکلایەنانە نییە، بەڵکو بەپێی دەروازە و نموونەکان گۆڕانی بەسەردا دێت. هەروەها بەپێی فرەیی بوارە سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکانی فەزای کۆمەڵایەتی کە جیهانێکی کراوەیە بەڕووی گۆڕانکاریی ڕووداو و پێشهاتەکاندا، فرەلایەن دەبێت.

بەهەرحاڵ، چەمکی هەمەڕەنگ- وەک هەر چەمکێکی تر- وەک دیموکراسی و کۆمەڵگەی مەدەنی، نەشونماکردنێکە بەمەبەستی گەشەپێدان و دەوڵەمەندکردن، بەپێی ڕەوت و ئەزموون و کولتوورەکان، ئەمەش وای لێ دەکات کراوەبێت بەڕووی فرەڕەنگی و فرەفۆڕمی و فرەڕەهەندیدا.

**تێبینیی سێیەم مرۆڤانەیە**، ئەویش ئەوەیە، بەئاخاوتن دەربارەی بەڕێوەبردنی هەمەڕەنگیی مرۆڤانە، بەرەنگاری کێشەیەکی سەخت دەبینەوەک، کە هەتاکو ئێستا چارەسەری

ماقوڵ یان قبوڵکراوی بۆ نەدۆزراوەتەوە. بەڵگەش ئەوەیە، مرۆڤایەتی لەبارەی داخوازییەکانی ئاشتی، دادپەروەری، یەکسانی و ئازادییەوە هەموو جارێک دەگەڕێتەوە بۆ خاڵی سفر... بەوەش بەڵگەی دەستەوسانی لەئاست چارەسەرکردنی دەردەکانی دەمارگیری و ڕقلێبوونەوە، یان جیاوازیخوازی و پاکتاوکردن، یاخود هەژاری و جیاوازی دەدات بەدەستەوە، ئەو دەردانەش کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئابووریانەن و خۆراک لەکترییەوە وەردەگرن، بۆ ئەوەی خراپەکاری و مەترسی و کارەساتەکانیان زیاتر ببێت.

ئەمە بارەکەیە لە هابیل و قابیلەوە بیگرە، هەتاکو جەنگ لە فەلەستین و ناوچەی عەرەبی و لەنێوان لاهوتی و حاخامەکان، تەلمودی و جیهادکار، یان کەریەلاییەکاندا. ئەوەش لەبیرناکەم من لە لوبنانم، کە مشتومڕی بارگاوی بە توندوتیژی و هەڕەشەکردن پەرەدەستێنێ، بەمەبەستی زەمینەخۆشکردن بۆ جێمێکی نوێی ململانێی خوێناوی، جا لەنێوان تایەفەکاندا بێت، یان لەناو هەر تایەفەیەکدا و لەنێوان حیزب و ڕەوتەکان، یان سەرۆک و میرەکانیاندا.

دەیان ساڵە ئێمە بەمجۆرەین: شەپۆلەکانی توندوتیژیی ئاخاوتن و سیاسی، دواتر جێمەکانی شەڕەکانی ناوخۆ، بەپێچەوانەشەوە: شەڕەکانی ناوخۆ، یان فیتنە مەزهەبییەکان کە ناتوانین پەندیان لێ وەربگرین و لاپەڕەکەیان هەڵبدەینەوە و دەبنە مایەی پاراستنی ئاگر لەژێر خۆڵەمێشدا، بەئەندازەی ئەوەی دەروونەکان بزواو و گۆشکرا و دەبن بۆ جێمێکی نوێی کوشتن و خوێنڕشتن.

لەهەمبەر ئەم مایەپووچییە لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی، ئایا چاوەڕوانی گۆڕانی جینە سروشتییەکان دەکەین، بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤانەی وەها بێتەدی کە لەگەڵیدا بابەتە کولتوورییەکان گۆڕانیان بەسەردابێت، وەک ئەوەی لەو نموونە بەرز و بەهایانە، یان مۆدێل و ڕێسایانەدا بەرجەستەدەبێت، کە پەیوەندییەکانی خۆمانیان پێ دەچنین و جیهانەکانی خۆمانیان پێ بنیاتدەنێین؟

بێگومان بێهیوانابین و چاوەڕوانی ئەو قۆناغە تۆقێنەرە دەکەین کە دەشێت بوونەوەرێکی نوێی لێوە دروست بێت و پێویستی بە ناوێکی نوێیە. پرسیارەکەش: ئێمەی کارکەری کایەکانی مەعریفە دەتوانین چی پێشکەشبکەین، بۆ ئەوەی بەشداربین لە چارەسەرکردنی ئەم گرفتە سەختەدا: بنیاتنانی کۆمەڵگەیەک کە تیایدا مەیلەکانی توندوتیژی، سەرکوتکردن، چەوساندنەوە و دوورخستنەوە خاوبێتەوە؟

ئەوەی هەمانە، ئەو سەرمایە سمبولییەیە، کە بەهۆیەوە تێدەگەین و دەستنیشاندەکەین، یان چارەسەر و تەگبیر دەکەین، هەریەکە و لە بواری شارەزایی

خۆیدا و بە کەرەستەکانی بوارەکەی. کەچی ئێمە زۆرجار ئەقڵی خۆمان بەباشی بەکارناهێنین بۆ خوێندنەوەی پێشهاتەکان یان تێگەیشتنی کێشەکان، بەڵکو وزەی بیرکردنەوەی زیندوو و خوڵقێنەری خۆمان پەکدەخەین، بۆ ئەوەی سادەکاری و پەردەپۆشکردن، یان ساختەکردن و هەڵخەڵەتاندن، یان ڕەتکردنەوە و دوورخستنەوە پیادەبکەین، یاخود ببینە قوربانیی هەموو ئەوانە. ئەمەش بەهۆی کەموکوڕیی میتۆد یان مایەپووچیی کەرەستەوە، یان بەهۆی بەتارماییکردنی ئایدیۆلۆژیانە و بەوەهمکردنە بڕواخوازییەکانەوە، یاخود بەهۆی تەڵەکانی شوناس و مەیلەکانی دەسەڵات و هەڵمەتی سامان کۆکردنەوەوە. بۆیە بەشداریکردنەکەم لەسەر دوو ئاست دەبێت: شیکردنەوەو توێکاری، بنیاتنان و پێکهێنان.

## أ. جیاوازی بنچینەیە:

١. لە بنەڕەتدا تەنیا هەمەڕەنگ و جیاواز بوونیان هەیە، جا برا بێت یان بێگانە، هاوپەیمان بێت یان نەیار، دۆست بێت یان دوژمن، چونکە جیاوازی دەرهاویشتەی مادیی بینراو و هەستپێکراوە. ئەمەش بۆ تاکەکانی جۆری مرۆڤانە ڕاستە، هەروەها بۆ هەر بەشێکی ناو جۆر یان پۆلێک ڕاستە، بەوپێیەی هەر تاکێک حەقیقەت و شوناسی خۆی هەیە، کە بەهۆیەوە لەوانیتر جیادەکرێتەوە. لێرەوە ئەو تاکە پێویستی بە ناوێکی تایبەتی دەبێت، وەک ئەوەی ناوەکانی زانست دەربارەی مرۆڤ یان ئاژەڵ گوزارشتی لێ دەکەن. کەچی چوونیەکی بەهەموو جۆرەکانییەوە تەنیا لە زەینەکان و لەسەر ئاستی فیکر و سمبول بوونی هەیە، بۆیە ئەوە واقعێکی بینراو نییە، بەڵکو شتێکە دەرکی پێ دەکرێت یان بەخەیاڵدا دێت، بەئەندازەی ئەوەی واقعێکە دروستدەکرێت، یان بینایەکە پێکدەهێنرێت، یاخود دەرهاویشتەیەکە دەگۆڕێت.

٢. دەشێت بوترێت هاوبەشی لە ناودا گوزارشت لە واقعێکی ڕاستەقینە دەکات، بەئەندازەی ئەوەی هێمادەکات بۆ شوناسی ڕەگەزێک، ڕەنگێک، توخمێک، ئایینێک، جۆرێک، یان پۆلێک: لوبنانی، عەرەبی، ئەمریکی، ئەورووپی، مەسیحی، قبتی، موسڵمان، ڕەشپێست، هەژار، ژن... ئەم هاوبەشییە لای مرۆڤ هۆکاری پەیوەندی و هەستکردن بەئینتیما بۆ نەتەوەیەک، کۆمەڵێک، توێژێک، یان توێژاڵێک پێکدێنێ... لە بارە نالەبارەکانیشدا، کاتێک کۆمەڵەکان دەبنە نێچیری ترس، یان هەڕەشە لە ئاسایشیان دەکرێت، ئەوا ناوەکە دەبێتە سەرچاوەیەک بۆ هەستکردن بە دەمارگیری و هاوکاری، هەتاکو مرۆڤەکان ببنە گرتبوونەوە یەکگرتووەکان و حەشاماتە نادیدەکان کە دژی دوژمنێکی بەکردەوە یان دروستکراو لە دەرەوە و ناوەوە بارگاویدەکرێن و گۆشدەکرێن.

٣. ئەگەرچی ناوی گشتی یان هاوبەش جیاوازیی پەردەپۆشدەکات یان دەیشارێتەوە، بەڵام لەناوی نابات، چونکە هاوجووتی لەنێوان شتێک و شتێکی تری ئەم جیهانەدا مەحاڵە. تەنانەت ئەو کورسیانەی کارگەکان ژمارەی بێسنووریان لێ دروستدەکەن بەتەواوەتی هاوجووت نین، لەبەرئەوەی هەر کورسییەک شوێنێک پڕدەکاتەوە کە ئەوانیتر پڕیٚ ناکەنەوە، بەوەش لەوانیتر جیادەکرێتەوە. کەواتە مەسەلەکە چۆن دەبێت کاتێک پەیوەندیی بە تاکەکانی کۆمەڵگەوە دەبێت، کە هەرتاکێک جیهانی فیکریی تایبەت بەخۆی هەیە، بە وەهم و مەراقەکانی خۆیەوە، یان بە خەون و ئاواتەکانی خۆیە... یاخود کە هەر کۆمەڵێک خاوەنی کولتووری خۆیەتی، بە کۆد و سمبول و ئیکۆنەکانی خۆیە، بە خەم و داخوازی و مەراقەکانی خۆیەوە... هەروەها چۆن دەبێت کاتێک گرفتەکە پەیوەندیی بە ناوێکەوە دەبێت، کە هێما بۆ جیهانێکی غەیبی وەک زاراوەی خوا دەکات، کاتێک تاقە ناوێک دەبێتە سەرچاوەی لێکدانەوە و خوێندنەوەگەلی بێکۆتاییەکان، کە جیاوازی یان تەنانەت ململانێ و لێکدابڕان بەرهەمدێنن.

ئەمەش ئەوەیە کە جەنگە خواوەندییە کۆن و نوێکان دەیخەنەڕوو، وەک ئەوەی یەکەم لەناو ئایینە یەکتاپەرستییەکاندا دەرکەوت، بە کۆپییە جۆربەجۆرەکانیانەوە، بەشێوەی جەنگەکانی دەقەکان و شرۆڤەکردنەکان و مەزهەبە کۆنەکان، هەتاکو جەنگەکانی کڵێسا و مزگەوت و مەرقەدەکانی سەردەمە نوێکان. دووەم لەناو ئایدیۆلۆژیا شۆڕشگێڕییەکان و بە چاپە جیاوازییەکانەوە دەرکەوت، بەشێوەی جەنگی ڕژێمەکان و دەوڵەتەکان و ئۆردووگاکان، هەتاکو جەنگەکانی حیزب و ڕەوت و ڕێکخراوەکان. ئەمە وێڕای ململانێ ناسیونالیستەکان، کە لە ئەنجامە خراپ و وێرانکارییەکانیان، چەند جەنگێکی جیهانیی کاولکار و چەندین پرۆژەی ئیمپریالیستانەی کۆلۆنیالیستانە بـــووە...

ئیمڕۆش ئەمە باری عەرەب و موسڵمانەکانە، ئەوانە لەسەر هەمووشتێک کەرتبوون: لە لێکدانەوەی دەقەکەوە بۆ مەسەلەی خیلافەتکردن، لە بەرەنگاربوونەوەی دەرەکییەوە بۆ مەسەلەی ناوەندیی فەڵەستین.

بەوجۆرە ناو هێماکردنە بۆ حەقیقەتێکی نادیار و هاوکات پرنسیپێکی کۆکەرەوە و جیاکەرەوەیە، چونکە (ئیبن عەرەبی) وتەنی، بە یەکێک شتەکان کۆدەبنەوە و جیادەبنەوە.

یەکێک لە پارادۆکسە ئابووریەرەکان لەمبارەیەوە ئەوەیە، لەکاتێکدا ئەمریکا بە هەڵبژاردنی (ئۆباما) زەبری لە لۆژیکی ڕەگەزپەرستی دەوەشاند، شەڕی سمبولی لەنێوان سوننە و شیعەدا گەیشتە لوتکە، وەک ئەوەی ئەوکاتە لە مشتومڕە

توندوتیژەکەی نێوان شێخ قەرەزاوی و شێخ تەسخیریدا بەرگوێمان کەوت. بەڵێ (ئۆباما) ئابڕوی ئێمەی برد، ئێمەیەک کە هێرشدەکەینە سەر هەڵمەتی داگیرکاریی کولتووری، بۆ ئەوەی داکۆکی لە کولتوورێکی ڕەقهەڵاتوو، داخراو، هەڵبژاردەخواز و دوژمنکارانە بکەین، کە کاتێک دەیەوێت ژن سەرتاپاپۆش بکات و تەنیا یەک چاوی دەربکەوێت هەتاکو نەبێتە مایەی فریودان، گەیشتە لوتکەی ڕیشەکێشکردن. ئێمە لەبەردەم ئەقڵێکی نێرسالاری ڕیشەکێشکارداین، ئەوەی بە ڕیشەکێشکردنی ئەو داگیرکەرێک دەچێت، کە نیشتەجێبوونی زۆرەملی ئەنجامدەدات.

## II. پێکهێنانی یەکەکان:

ئەم تێکەیشتنەی هەمەڕەنگی و جیاوازی مانای چییە؟

مانـای ئەوەیـە چاوبخشـێنینەوە بـە وێناکردنەکانمانـدا بـۆ حەقیقەت، شوناس، دەسەڵات، یەککگرتوویی کۆمەڵگەیی، ژیانی هاویەش، بەمەبەستی پێکهێنانی زمانێکی چەمکئامێزی نوێ...

١. خولقاندنی ڕووداوەکان:

چاوخشاندنەوە لەسەر ئاستی حەقیقەت مانای ڕزگاربوونە لە چەمکەکەی وەک تەنها، نەگۆڕ، باڵاڕەو، پێشوەخت یان ئامادە، بەو شێوەیەی جڵەوکاران و پۆلیسەکانی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن بەشێوەیەکی یەقین و هاوجووت بە حەقیقەت ئاشنان، جا ئەوانە پێڕەوکارانی کتێبە ئایینیەکان بن، یان خاوەن ئایدیۆلۆژیا نوێکان. ئەم بانگەشەکردنە سەبارەت بە یەقین و جڵەوکردن و کۆنترۆڵکردن جۆرێکە لە بەخواکردن، کە بەشێوەی گەڕانەوەی ترسناک یان کاریکاتۆریانەی ئایین دەخرێتەڕوو. وەک ئەوەی فەتوا بەربەرییەکان شایەتی لەسەر دەدەن، یان بەشێوەی کۆتاییە کارەساتبار یان دڕندەکانی ناونیشانەکانی مۆدێرنیتە، ئەقڵانییەت، ئازادی، پێشکەوتن و پەرەپێدان، یان ناونیشانەکانی شۆڕشو عەرەبایەتی و ئازادی دەخرێتەڕوو. وەک ئەوەی گرفتەکانی ئاسایش، ژینگە، تەندروستی، بژێوی و سیاسەت پیشانیدەدەن و بەشێوەی تیرۆر، پیسیی ژینگە، هەژاری، ستەمکاری و دوورخستنەوە دەکەوێتەڕوو.

باشترە لەسەر ئاستی بوون و مەعریفە بێفیز و خۆپارێز بین، بەشێوەیەک کە بە وشەکانی ڕێژەییبوون، بنیاتنان، خولقاندن و گۆڕانکاری مامەڵە لەگەڵ حەقیقەتدا بکەین. وا خەریکە چەمکی فرەیی، کە لۆژیکی تاکڕەهەندی و تەنهاییبوون

تێکدەشکێنێ، توێژنەوە و لێکۆڵینەوەکانی کایە جۆریەجۆرەکان لە بواری گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، یان لە بوارەکانی پزیشکی و مێژوو، یان مرۆڤزانی و دەروونناسیی دەرککردن تیخدەکات. ڕووی دووەمی کرانەوە بەڕووی فرەییدا، کرانەوەیە بەڕووی چەمکی خوڵقاندندا، چونکە حەقیقەت دەرەقتهاتنی ئەوەیە کە دەیخوڵقێنین یان دەیگۆڕین، یان بەباشی دەتوانین دروستیبکەین و بنیاتیبنێین، یاخود ئەوەی لە تاوتوێکردن و ئاڵوگۆڕکردنیدا سەرکەوتوودەبین. بەم مانایە، ڕێژەییبوون ڕەوایەتیی خۆی بەدەستدێنێت، نەک تەنیا لەبەرئەوەی تێڕوانینەکەمان هەمیشە ڕێژیی، یان کەموکوڕن و مایەی یەقین نین، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو ڕاستیانەی دەربارەی پێشهاتەکان بەرهەمیاندێنین، چەند نموونەیەکی لێکدانەوەن و واقیع بنیاتدەنێنەوە، بەئەندازەی ئەوەی بەشداریی لە گۆڕانیدا دەکەن.

٢. ناسنامەی فرەڕەگ:

چاوخشاندنەوە بە چەمکی شوناسدا، مانای ئەوەیە بڕوا بەوە بهێنین کە شوناسی بێگەرد یان ئینتیمای تاکلایەن بوونی نییە، چونکە هەر شوناسێک گۆڕانی بەسەردا دێت یان ناوێکە بەردەوام ماناکەی دەگۆڕێت، یاخود خودێکە هوشیارییەکی ڕەخنەگرانە دژ بەخودی خۆی پیادەدەکات. ئەمەش دەرفەت دەڕخسێنێت بۆ پێکگەیشتنی مرۆڤ لەگەڵ ئەویتر، یان نەیارەکەی، یاخود دژەکەی، بەڵکو دژمنەکەی، ئەگەر بمانەوێت ئیلهام لە تێڕوانینی سوفیگەرانە وەربگرین.

ئەمە واقیعی پەیوەندیی نێوان هەر سێ ئایینە یەکتاپەرستەکەیە: جولەکە و مەسیحیەت و ئیسلام. ئێمە لەبەردەم سێ لقی هەمان بنەچەداین، یان لەبەردەم سێ کۆپیی هەمان بڕواداین، کە بەپێی جیاوازیی زمان و کولتوورەکان، یان دەوڵەت و کۆمەڵگەکان جیاو جیاواز دەبن. ئەمە واقیعی پەیوەندییەکانی ناو هەر ئایینێک و نێوان تایەفەکانیەتی کە لەسەر قۆرخکردنی ڕەوایەتی شەڕیانە.

باشترە ئەو هەمەڕەنگییە لەژێر ناونیشانێکی کۆکەرەوە یان ڕیشەیەکی هاوبەشدا قبوڵبکەین، هەتاکو تایبەتمەندییەکان لەگەڵ دەمارگیر و گۆشەگیر و توندڕەوەکاندا نەگۆڕێت بۆ سەنگەرەکانی بڕواخوازی و خەندەقە سمبولییەکان، کە زەمینەسازی بۆ جەنگە دڕەندەکان دەکەن.

بڕوابوون بە قبوڵکردنی فرەئینتیمابوون بۆ تاقە بنەچەیەک، مانای کردنەوەی گرێی دژبوونە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەویتر و تێکشاندنی لۆژیکی هاوجوتبوونە لە مامەڵەکردن لەگەڵ خوددا. چونکە ئەویتر نیوە بوونخوازەکەی ترمانە کە ناکرێت لێی

دابڕێین، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە چارەنووسەکان تێکهەڵکێشن و شوناسەکان بەجیهانیبوون، یاخود کولتووره سنووربڕ و کیشوەربڕەکان فرەڕەگن. لێرەوە ئیمڕۆ هاوڵاتیبوونێکی جیهانیی سنووربڕ سەرهەڵدەدات، بەئەندازەی ئەوەی شوناسێکی کۆسمۆپۆلیت دێتەئاراوە، کە لە ڕووی کۆڵەکەی ناوچەیی و ڕەهەندە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیەکەیەوە فرەلایەنەیە، بەئەندازەی ئەوەی لە ڕووی فرە پیشە و فەرمان یان فرە ڕەگەز و نیشتەجێبوونەوە ئاوێتەیە.

کەچی شوناسی بێگەرد، وەک تەماهیکردنێکی تەواو لەگەڵ خۆدا، جگە لە گۆشەگیری و بۆشی شتێکی تر بەرهەم ناهێنێت، بەهەمان ئەندازەش هەژاری و تیرۆر بەرهەمدێنێت. با لێرەدا بپرسین، ئەنجامی مامەڵەکردن لەگەڵ خود، وەک شوناسێکی هاوجوت و لەگەڵ خۆرئاوا وەک دژ، یان بێگانە، یاخود دوژمن، چی بوو...؟! ئاکامەکەی پاش دوو سەدە، لە هەڵمەتەکەی (ناپلیۆن)ـەوە بۆ هەڵمەتی داگیرکاریی (بوش)، ئەوە بوو کە برای نیشتمان یان ئایین گۆڕا بۆ دوژمن، وەک ئەوەی فیتنە مەزهەبیەکان و شەڕەکانی ناوخۆ لە زیاتر لە وڵاتێکی عەرەب دا پیشانیدەدەن.

باشترە بەشێوەی ڕێژەیەک یان زیادەکارییەک مامەڵە لەگەڵ شوناس بکرێت، بەو ئەندازەیەی نەشوناکردنێکی گۆڕاو یان پێکهاتەیەکی دووڕەگە و زیندوێتییەکی بونخوازە بەڕووی ئەویتر و ڕووداو و جیهاندا دەکرێتەوە. بەم مانایە، شوناسی ئاوێتە و فرەڕەگ سەرچاوەی دەوڵەمەندبوون و هێز و نوێبوونەوەیە، بەئەندازەی ئەوەی دەبێتە مایەی ڕزگارکردنمان لە داوەکانی دەمارگیری و داخران و توندڕەوی. لێرەوە فرەیی تەنیا مانای قبوڵکردنی ئەویتر نییە، بەڵکو لەسەر ئاستی بوون مانای ئەوەیە شوناسێک لە تێکهەڵکێشیی فرەیی و نادیار یان دژبوون و لێکدابڕان پێکدێت. ئەمەش بەپێی فرەیی ڕوو و قۆناغەکان یان لێکدژیی مەیل و هەوەسەکان، یاخود هەمەڕەنگیی کایەکانی چالاکی و بازنەکانی ئینتیما... بەم مانایە، شوناسەکانمان لە دوامانەوە نین، بەڵکو ئەوەن کە هێشتا پێیان نەگەیشتووین، بەئەندازەی ئەوەی وزەی داهێنان و گۆڕانمانن، بەمەبەستی نوێکردنەوە، گەشەپێدان، چاککردن، یان تەگبیرکردن.

### ٣ – دەسەڵاتی ناوتوێکار:

ڕووەکەی تری چاوخشاندنەوە بە چەمکی شوناس یان حەقیقەتدا، پێداچوونەوەیە بە چەمکی دەسەڵاتدا، بەمانا لاهوتی، یان غەیبی، یاخود ئەودیو سروشتییەکەی، وەک ویستێکی ڕەها، یان ڕەچەڵەکێکی پیرۆز، یاخود ڕەوایەتیەکی باڵا کە ملکەچی لێپێچینەوە و گفتوگۆکردن نییە. چونکە لەم جیهانەدا هەموو شتەکان

ڕێژەیی، مەرجدار، یان فرە، گۆڕاو، کاتی، لەناوچوو، یاخود کەموکوڕو ناکاملن...
بەلام بەخشینی سیفەتەکانی خواوەندی و پیرۆزی و هەڵەنەکردن بە مەسەلە، کار، سیاسەت و جەنگەکان، جا دروشمەکە هەرچییەک بێت، ئاکامەکەی ستەمکاری و دامەزراندنی چەند ڕژێمێکی تۆتالیتارییە، بەئەندازەی ئەوەی لەسەر قۆرخکردنی ڕەوایەتی و زەوتکردنی ئازادیی فیکر و دەربڕین دادەمەزرێت، بۆ بەتەنیا جڵەوکردنی بیرورا و بڕیار.
چاکترە وەک کایەیەکی ملکەچی گفتوگۆکردنی گشتی و تاوتوێکردنی ئەقڵانی و پێداچوونەوەی ڕەخنەگرانە مامەڵە لەگەڵ دەسەڵاتدا- هەر دەسەڵاتێک- بکرێت، جا ئایینی بێت، یان سیاسی، یان ئابووری، یاخود ئەکادیمی، بەتایبەتی دەسەڵاتی سیاسی کە لەکۆتاییدا سەرەنجامی یاسایی یان ڕێکاریی بزاوتی کۆمەڵایەتی و چالاکیی بەرهەمهێنان یان داهێنانی هەر بکەرێکی کۆمەڵایەتیە لە کەرت و کایە جیاوازەکاندا، وەک ئەوە لە حکومەتی دیموکراتی و کارامەدا هەیە.

٤. ناوەندی کۆکەرەوە:

لەکۆتاییدا پێویستیمان بە چاوخشاندنەوەیە بە یەکەی کۆمەڵایەتیدا، جا بچووک بێت یان گەورە، تایەفە بێت، یان هۆز، یاخود شتێکی تر، چونکە کۆمەڵگە تەنیا یەکەیەکی سادە، یان تەنێکی لێکچوو، یان پلەبەندییەکی توندوتۆڵ، یاخود ویستێکی باڵادەو نییە... دەشێت ئەمە باری کۆمەڵگەی داخراو و پۆڵایین بێت.
بەلام کۆمەڵگەی زیندووی پەرەسەندووی کراوە و گەشاوە، لە ڕووی ئاست و کایە هەمەجۆرەکانەوە، بونیادێکی ئاوێتە و ئاڵۆزە، یان کیانێکە لە ڕووی توێژ و توێژاڵە جۆربەجۆرەکانەوە هەمەڕەنگ و فرە لقوپۆپە، یان لە ڕووی هێزە کاریگەرەکانەوە شانۆیەکە بۆ پێشبڕکێ و ململانێ. ئەو کۆمەڵگەیە ناوەندێکە بۆ فرەیی و فەزایەکە بۆ تاوتوێکردن، بەئەندازەی ئەوەی تۆڕێکە لە کارلێککردن و پەیوەندییە گۆڕاوەکان.
بەپێی ئەم تێگەیشتنە دەربارەی یەکگرتن، دەبێت دان بەواقیعدا بنێین، هەتاکو بزانین چۆن ناکۆکییەکانمان بەڕێوەدەبەین، یان کێشەکانمان چارەسەردەکەین، یاخود کاروبارەکانمان ڕاییدەکەین. واتە دان بەوەدا بنێین کە جیاوازین، هەتاکو بزانین چۆن یەکدەگرین. چونکە هاوشێوە یان هاوچەشن لەگەڵ هاوشێوە و هاوچەشنی خۆیدا یەک ناگرێت، بەڵکو کۆششدەکات بۆ لابردن و جێگرتنەوەی، یان سەرپێدانەواندن و زاڵبوون بەسەریدا.
ئەمەش ئەوەیە کە ئەزموونەکانی یەکگرتن لە جیهانی عەرەب دەیخەنەڕوو، چونکە

عەرەب دەستەوسانن لەئاست یەکخستنی تاقە گەرەکێکدا، بەڵکو هەتاکو ئەوان بانگەشەی ئەوە بکەن هاوچەشنن و کۆلۆنیالیزم پرشوبڵاویکردونەتەوە، زیاتر لێک دادەبڕێن و دەچن بەگژ یەکتردا. ئەمەش سەیرنییە، چونکە یەکگرتن دەرهاویشتەیەکی خۆرسک یان واقعێکی سروشتی نییە، بەڵکو کارێکی ڕووناکبیریی دامەزراوەییە، پێویستی بە کۆششکردن هەیە بۆ کارکردن لەسەر خود و گۆڕینی، بۆ ئەوەی لە بازنەی تەسک یان قۆزاخەی خنکێنەر بێتەدەرەوە، بەمەبەستی دۆزینەوەی ئەوەی کاری هاوبەش پێویستی پێیەتی، یان چوونە ناو یەکگرتنێکەوە،کە پێکدێت لە چەندین چوارچێوە، فۆرم، دامودەزگا و کەرەستە.

بەوجۆرە ئێمە لەگەڵ ئەویتر کۆدەبینەوە، بۆ ئەوەی هاوجووتبین لەگەڵیدا، یان هەتاکو ببینە کۆپییەکی ئەو، بۆ ئەوە نا کە بیخەینە ژێردەستەوە یان بۆ ئەوەی وەک ئێمەی لێ بێت، بەڵکو بۆ ئەوەی لەگەڵیدا کۆببینەوە و یەکبگرین، بەخوڵقاندنی ئەوەی لە زمانەکان، ڕوویەرەکان، فەزاکان و بازاڕەکاندا کۆکەرەوە، یان هاوبەش، یاخود گشتین... واتە هەرشتێک کە دەرفەت بۆ دەستدانەکانی دیالۆگو دانوستان، یان شەریکایەتی و تاوتوێکردن، یاخود ئاڵوگۆڕ و کارلێککردن دەڕەخسێنێت و فراوانیاندەکات. ئەی چۆن دەبێت لەکاتێکدا ئێمە لە سەردەمی ئەو ئامرازانەداین کە لەگەڵیاندا توانستەکانی پێکگەیشتنی خەڵک زیاتردەبێت.

بەم مانایە، یەکگرتن، جا لەسەر ئاستی خێزان بێت، یان کۆمپانیا، کۆمەڵ، چین، نەتەوە، یاخود لەسەر ئاستی سەرجەم مرۆڤایەتی، مانای کۆکردنەوە نییە بەمەبەستی سەرکوتکردن و لەخۆگرتن، یان جیاوازیخوازی و دوورخستنەوە، واتە هەر شتێک کە کاری یەکگرتنەکە مینرێژدەکات، بەڵکو توانای خوڵقاندنی فەزایەکی فراوان یان ناوەندێکی کۆکەرەوەیە.

ناوەندەکەش لە ڕووی واتاوە کایەیەکی کولتووری، سمبولی، سیاسی و کۆمەڵگەییە، کە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەیە، جا گەورە بێت یان بچووک، بەوپێیەی فەزایەکە بۆ وتوێژکردن و دیالۆگ، یان تاوتوێکردن، یاخود ئاڵوگۆڕکردن، مادام مەحاڵە جیاوازییەکانی نێوان شوناسەکان لەناوبەرین، جا تاکەکەسی بن یان دەستەجەمعی. ئەوەی شیاوە، بنیاتنانی سیستەمێکە بۆ لێک جیاکردنەوە و پێکگەیاندنی من و ئەویتر، تایبەتی و گشتی، کۆمەڵگەو ئابووری، یان سیاسەت و ڕووناکبیری... ئەمەش خوڵقاندنی ئەو ناوەندە دەیڕەخسێنێت کە فۆڕمێک بۆ پێکەوەژیان، یان زمانێکی کۆکەرەوە، یان ڕووبەرێکی هاوبەش، یاخود جیهانێکی کراوە بەڕووی ئەویترو ڕوودلو و جیهاندا پێکدێنێت.

بەوجۆرە هیچ کۆمەڵگەیەک بەبێ خولْقاندنی ناوەندێکی کۆکەرەوە، کە تیایدا خەڵک پێکدەگەن، دانامەزرێت، جا ئەوە پەیوەندیی بە گوندێکی بچووکەوە هەبێت، یان دەوڵەتێکی گەورەوە. بەئەندازەی ئەوەی خەڵکەکە مەبەستیانە جیاوازی و کێشمەکێشەکانیان لە رێگەی ئەو نێوەندکارانەوە بەڕێوەبەرن، کە زمان بەهۆی تواناکانی پێکگەیشتن و بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵانییەوە پێکیدێنێ، بۆ گەیشتنە دۆزینەوەی چەند رێسایەکی کۆکەرەوەی کاری هاوبەش، کە لای رای گشتی یان ئەقڵی گشتی و ئەقڵی گەردوونی قبوڵکراوە.

بێگومان ئەمە باری ئەو کۆمەڵگەیەیە، کە دەرفەت بۆ تاک و کۆمەڵەکانی دەڕەخسێنێت، بڕێک ئازادیی بیرکردنەوە و دەربڕین و رێکخستن بۆ چوونە ناو تاوتوێکردنی ئاشکراو گفتوگۆ گشتییەکان بەدەستبێنێت. ئەمەش ئەوەیە کە دامودەزگا و کۆمەڵــە و دامەزراوە مەدەنی و رووناکبیری و سەندیکایی یان سیاسییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی دەیکەن. ئەوانەی خاوەنەکانیان بەپێچەوانەی ئەو تایەفـە و هۆزانـە بیردەکەنەوە و کاردەکەن کە چەند جیهانێکی داخراو یان شوناسێکی باڵاڕەوی وەها پێکدێنن، تەماهیکردنی بۆش و هاوجوتبوونی هەڵخەڵەتێنەر لەناو تاکەکانیدا باڵادەستە، بەتایبەتی لە کاتی ململانێ و جەنگەکاندا.

بۆ نموونە، ئەمە باری فەڕەنسای کۆمارییە: فەڕەنسا فەزایەکە بۆ پێکگەیشتنی ئازادانە و ژینگەیەکی بەپیت بۆ تاوتوێکردن و گفتوگۆ و مشتومڕەکانی نێوان هێز و حیزب و چالاکییە جۆربەجۆرەکان، بەچەپ و ڕاست و ناوەڕاستەوە. هەروەها ئەمە باری ئەمریکای دیموکراتییە: هەریەکێک لە دوو حیزبە گەورەکە رووبەرێکە بۆ گفتوگۆ و دانوستانی بەردەوامی کراوە بەڕووی فرە دەنگی و شێواز و هەڵویستدا. ئەمەش باری لوبنانە، بەتایبەتی پێش هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ، چونکە نمونەیەکی پێکەوەژیان و تاقیگەیەکی ئەزموون و سەکۆیەکی ئازادیی وشە بوو، بەئەندازەی ئەوەی بەپێی پێکهاتە تایەفەگەرە فرەلایەنەکەی ناوەندێکی فرەیی بوو. ئەمەش تاڕادەیەک بارەکەیەتی لە ئیمڕۆدا، سەرباری قورسایی فشارەکان و سەرەنجامەکانی جەنگەکان: دەشێت فراکسیۆنێکی میانەکار تیایدا پێکبێت و هەر فراکسیۆنێک یان حیزبێکی سیاسی وەک فەزایەک بۆ هەمەڕەنگی و فرەیی یان ناکۆکی کاری خۆی بکاتو خودی لوبنان بەتایبەتی دەتوانێت ناوەندێک بۆ تاوتوێکردن و گفتوگۆ دەربارەی مەسەلە جێناکۆکەکان پێکبێنێت، وەک ئەوەی تاوتوێکان دەربارەی مەسەلەی فراکسیۆنی ناوەندیخواز دەیخاتەڕوو.

لێرەدا رۆڵی رووناکبیر دێت، کـە بزوێنـەر و خولْقێنـەر و گۆڕانکارە، بەئەندازەی

ئەوەی تیشکۆیەک بۆ گفتوگۆ دەخولقێنێت، یان مەسەلەکان دەوروژێنێت، یان مشتومڕەکان دەبزوێنێت، یاخود ناکۆکی و کێشمەکێش و کێشەکان لەئاستی تایبەتەوە دەگوێزێتەوە بۆ ئاستە گشتییەکەی، هەتاکو بەزمانی چەمکناسای خۆی دایانڕێژێتەوە، یان سروشتی ڕۆشنگەری و جیهانیان بەبەردا بکات. شایانی باسە، سەرۆکی ئەو لیژنەیەی لە سەردەمی سەرۆکی فەرەنسی (جاک شیراک)دا پێکهێنرا بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی مەسەلەی حیجاب ناونرا: نێوانکاری کۆمار.

بەم مانایە لە ناوەڕاستخوازی تێدەگەین: ناوەڕاستخوازی پیواری (غیابی) هەڵوێست یان بیروڕا نییە، کۆکردنەوەش نییە بە مەبەستی هەڵخەڵەتاندن، بەڵکو فەزایەکی فراوانە بۆ پیادەکردنی ئازادییەکانی بیرکردنەوە، بەئەندازەی ئەوەی ژینگەیەکی ژیواریی بەپیتە بۆ ئاڵوگۆڕکردن، یاخود ناوەندێکە بۆ گفتوگۆ و تاوتوێکردن و دانوستانی بەردەوام.

بەبێ ئەوە پشێوی بەربڵاودەبێت، یان بەپێچەوانەوە ستەمکاری باڵادەستدەبێت، ئەمەش ئاکامی لۆژیکی هاوجووتخوازی و ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی ناوەڕاستخوازە، کە ناوەڕاست و نێوەندکار، یان نێوبژێوان و ڕایەڵەیە: بەربڵاوی وێنەی تاقە سەرۆک، یان بەرزکردنەوەی دروشمی «من یان هیچ کەسێک»، هەتاکو دەگاتە دامەزراندنی چەند کۆمەڵگەیەکی تۆتالیتار و چەند حکومەتێکی دیکتاتۆری، یان چەند بزووتنەوەیەکی پۆپۆلیست، کە تیایاندا ئازادییەکان دەخنکێنرێن و فەزای فراوان دەگۆڕێت بۆ تونێلێکی تاریک.

لێرەدا دان بەوەدا دەنێم، یەکێک لە پارادۆکسەکان ئەوەیە، کە ئەو پیشەکار و بازرگانانەی کار بە کاڵا ماددییەکان دەکەن، لە ڕووی پەیوەندییەکانی پێکگەیشتنەوە، سەرکەوتووترن لە ڕووناکبیران. بەڵگەی ئەوەش ناوەندی بازرگانی لە بەیروت ژینگەیەکی ژیواریی کۆکەرەوەی بۆ ئاڵوگۆڕکردنی مرۆڤانە پێکدەهێنا، بەپێچەوانەی ناوەندە ڕووناکبیرییەکانەوە کە خۆراکیان دەدایە کێشمەکێشەکان، یان بەهاکانی پێکگەیشتن و پێکەوەژیانی کۆمەڵەکانیان وێراندەکرد، بەئەندازەی ئەوەی بڕوا هەڵبژاردەخواز و ئایدیۆلۆژیای پۆلایینی شۆڕشگێر یان ڕزگاریخواز تیایاندا باڵادەستبووە.

### ڕۆشنگەرییەکی ڕەخنەگرانەی هەمیشەیی:

پوختەی ئەم شیکردنەوەیەی چەمکەکان لەسەر ئاستە مەعریفییەکانی مرۆڤزانی و سیاسەت و کۆمەڵگە کامەیە؟

چیتر بەڕێوەبردنی جیاوازییەکان، یان ئاراستەکردنی شوناسەکان بە چەند وشەیەکی کەلەپووریی باو، یان چەند وشەیەکی مۆدێرنسیت، ئایینی یان عەلمانی سوودی نییە، چیتر ئەوە بەس نییە دروشمەکانی ئەقڵانییەت یان، دیموکراسی، یاخود دادپەروەری بەرزیکەینەوە بۆ بەڕێوەدەبرێن مەسەلەکان، وەک ئەوەی پیرەکانی ڕێنسانس و پەککەوتەکانی مۆدێرنیتە لای خۆمان دەیکەن.

لەمەودوا، لەبەر ڕۆشنایی تێکشکان و پاشەکشێ و هەرەسهێنانەکاندا، پێویست و ژیارییە بزانین بە چ شێوازێکی ئەقڵانی توخنی واقیع دەکەوین؟ بە چ شێوەیەکی دیموکراسی حکومەتەکان بەڕێوەببرێن؟ بە چ واتایەک ئازادییەکان پیادەبکرێن؟ بە چ سیستەمێکی دادپەروەری سامانەکان دابەشبکرێن؟

ئەقڵانییەتی ڕاستەوڕاستی سادەکاری تاکڕەهەندمان جێهێشتووە و بەرەو ئەقڵانییەتێکی ئاوێتە هەنگاومان ناوە، کە واقیع بە هەموو ئاڵۆزی، نادیاری، پارادۆکس، کەلێن و چاوەڕوان نەکراوەکانییەوە دەبینێت. هەروەها دیموکراسیی نوێنەرایەتیی ژمارەیی و وەرزیمان جێهێشتووە و ڕوومانکردۆتە دیموکراسییەک، کە بەئەندازەی ڕۆژانەبوونی بەردەوامە، یان بەئەندازەی هاوبەشیبوونی پێکگەیشتنخوازە، بەئەندازەی گشتیبوونی تێپەڕێنەرخوازە، بەجۆرێک کە لەگەڵیدا تاوتوێکان لە فەزای کۆمەڵایەتیدا بە درێژی و پانی، شاقوڵی و ئاسۆیی فراوان بێت. هەروەها ئێستا ئێمە سروشتی یاسایی و یەکسانیخوازیی دادپەروەریی جێدەهێڵین، ئەویش یەکەم بە دووپاتکردنەوەی ئەو ڕێگا ڕێکارانەی یاساکان بەهۆیانەوە جێبەجێدەکرێت، دووەم پێداگرتن لەسەر مەسەلەی داننان بە ئاستی بوونخوازیی نێوان من و ئەویتردا، ئەوەش بە تێپەڕاندنی جیاوازیخوازی لەسەر بنەمای ڕەنگ، ڕەگەز، ئایین، توخم، یاخود تەمەن... چونکە بەبێ داننانی دوولایەنە، کە چەمکی لێبووردەیی هەڵخەڵتێنەر تێدەپەڕێنێ، ئەو لێبووردەییە یەکە و شوناسەکان مینرێژدەکات و هیچ دادپەروەرییەک بەجێناهێنرێت و هیچ مافێکیش ڕێزی لێ ناگیرێت. گرنگتر ئەوەیە ئێمە خەریکە لە چەمکی تەوباوی و بەهەشتیانەی ئازادی ڕزگارماندەبێت، کە بۆتە مایەی ئەو هەموو پەککەوتەیی و ستەمکارییە و ڕوودەکەینە تێگەیشتنێکی تر، ئەویش ئەوەیە کە ئازادی بریتییە لە ئاسۆیەکی کراوە. بۆیە ئازادی دەرگایەک نییە بە دەستێکی ڕەنگینەوە لێوەی بچینە ناوەوە، بەڵکو ڕێڕەوێکە ئامرازەکەی داهێنانێکە ڕاناوەستێت، وەک چۆن مرۆڤ دەستبەرداری خستنەگەڕی وزەی زیندوو نابێت بۆ خوڵقاندن و داهێنان، بەشێوەیەک کە دەرفەتی بۆ برەخسێت چالاکی و دەسەڵاتی خۆی پیادەبکات، یان ڕۆڵ و کاریگەریی خۆی هەبێت.

لەکۆتاییشدا، ئێمە چەمکی ئەو خودەمان تێپەڕاندوە، کە بیرکەرەوەیەکی باڵاڕەوی سەروەرەو بۆخۆی ئامادەدەبێت و بەشێوەیەکی شەفاف تەماهی لەگەڵ خودی خۆیدا دەکات، یان بەشێوەیەکی دڵنیای هاوجووت دەرک بە واقیع دەکات. چونکە ئەمە وەهمێکی سینەویی دیکارتی کانتییە کە ڕزگارمانبووە لە دەستی. لەبەرئەوەی خود بریتییە لە ئاڵۆزی و پارادۆکس و کەلێنەکانی خۆی، بەئەندازەی ئەوەی بریتییە لەو وەهم و خورافە و هێزە بێدەنگ یان شاراوانەی لەپشتییەوە کاردەکەن. هەروەها خود ئەوەیە کە بیری لێ دەکەیتەوە و بەئەقڵتدا دێت، یان دەیسەلمێنی و بەرنامەڕێژیی دەکەیت، بەئەندازەی ئەوەی بریتییە لە لایەنە تاریکەکان و ئەو ناوچانەی لە بیرکردنەوە دوورخراونەتەوە، یان سەختن بۆ تێگەیشتن، یاخود دەکەونە دەرەوەی مەودای ئەقڵ.

ئەمەش لێکیدەداتەوە چۆن ئێمە ئەوە پێشێلدەکەین کە داوایدەکەین، یان لەگەڵ ئەوەدا پێکدێین کە بانگەشەی بەگژاچوونەوەی دەکەین، یان دەگەینە ئەوەی نامانەوێت، یان لووتمان دەبێت بە لووتی ئەوەی چاوەڕوانی ناکەین و بە مێشکماندا نایەت، یان نەزانیی خۆمان لەبارەی شتێکەوە بۆ دەردەکەوێت کە دڵنیابووین لە ئاشنابوونمان پێی، یاخود دەستەوسانمان لەئاست ئەوەی وامان دەزانی توانای کردنیمان هەیە.

هەموو ئەوانە چەمکەکانی سەروەری و بەدەستەوەگرتن دەهەژێنن، بۆ ئەوەی وابکەن پەیوەندیمان بە مانا، حەقیقەت، ئازادی و دادپەروەرییەوە تەنیا گرەوێک بێت، کە دەستدان لە ئەنجامدانی گۆڕانکاریی خوڵقێنەرانە یان سازشکردنی بنیاتنەرانە بێتەئاراوە. ئەمەش لە ڕێگەی چونە ناو کارێکی ڕۆشنگەرانەی ڕەخنەگرانەی بەردەوامەوە، کە لەگەڵیدا جوگرافیای مانا و پەیوەندییەکانی هێز گۆڕانیان بەسەردا دێت.

## نموونە و هیوا:

بەگەڕانەوە بۆ سەرەتا، کۆتایی بە بابەتەکە دێنم. چاوەڕوانی گۆڕانی جینە سروشتییەکان ناکەین بۆ گۆڕینی بابەتە ڕووناکبیرییەکان، واتە ئەو مۆدێل، پرنسیپ، فۆڕم و ڕێسایانەی پەیوەندییەکانی خۆمانیان پێ دەچنین یان چارەنووسە هاوبەشەکانی خۆمانیان پێ بەڕێوەدەبەین و تێکهەڵکێشن و بەناویەکداچوون.

ئاسۆکان دانەخراون، نموونە و هیوایەک لەبەردەمماندایە کە ئەورووپا بەرجەستەیدەکات، چونکە ئێمڕۆ تاقە گرتبوونەوەیە لە جیهاندا، کە کەمترین توندوتیژی پیادەدەکات. ئەورووپا پاش چەندین جەنگی ماڵوێرانکەر ئاقڵبووە و پەندی وەرگرتوە و هۆشی

بەبەردا هاتۆتەوە، نەک بەهۆی (کانت) و باقیی ئەوە ئەقڵانییەکانەوە، بەڵکو لەبەر چەند هۆیەکی تر: یەکەم/ جەنگەکان تەنیا وێرانکاریی دوولایەنە و پێکهاتن دژ لەگەڵ دژەکەی بەرهەمدێنن. دوەم/ ترسی دەوڵەتە ئەوروپییەکان لەو هێزە نوێیانەی دێنە سەر شانۆکە، جا هاوپەیمان بن، یان نا. ئەوروپا لەوەدا سەرکەوتووبوو، ئەوەش لە ڕێگەی کارکردنی بێوێنەوە لەسەر خود، کە لەگەڵیدا گۆڕا بۆ ڕووبەرێک بۆ تاوتوێکردن لەسەر زیاتر لە ئاستێک، بەئەندازەی ئەوەی لە وەهمی ئایدیۆلۆژیا تەوباوییە ڕزگاریخوازەکان ڕزگاربووبوو، یان لۆژیکی فیکری تاکڕەهەند و سیستەمی تۆتالیتاری یان فاشیی تێکشکاند، بەتایبەتی بەئەندازەی خاوبوونەوەی مەیلی فەندەمەنتالیستانەو داواکردنی مانای ئایینی لەناویدا...

بەم مانایە، ئەوروپا- پاش هۆشپیاهاتنەوەی- گەڕایەوە بۆ فەیلەسووفەکان، بۆ ئەوە نا کە لاساییان بکاتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئیلهامیان لێ وەربگرێت، یان چەمکەکانیان دەربارەی ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی بەشێوەیەکی نوێ وەبەربێنێتەوە. چونکە ئێمە ئێستا لە ڕووی دەربڕینی دروشم، یان مەسەلە، یان ناونیشانەکانەوە (کانتی)، یان (هیگڵی)، یاخود (مارکسی) نین، بەڵکو هەوڵدەدەین لەبەر ڕۆشنایی تێکشکان و هەرەسهێنانەکاندا، وەک ئەوەی لە کارەسات و بەربەرییەت و نهلیستیبووندا دەیبینین، شێوازەکانی ڕاستبێژی و ڕەوایەتی نوێبکەینەوە. ئەوەش لە ڕێگەی داهێنانی کەرەستەیەکی نوێوە بۆ فیکر و کارکردن، تێگەیشتن و دەستنیشانکردن، یان بیرکردنەوە و تەگبیرکردن، لە ڕێگەی تێکشکاندنی لۆژیکی فیکری تاکڕەهەند و تۆتالیتاری، یان هەڵبژاردەخواز و دوورخەرەوەخواز، یاخود دەستەبژێر و ناوەندیخوازەوە...

لە دەستەواژەکانی ئەو کەرەستە نوێیە، وەک دەبینم و دەستنیشاندەکەم و بۆ تاوتوێکردن پێشنیاردەکەم، بریتین لە: دانپیانانی دوولایەن، ڕەهەندی فرەلایەن، شوناسی فرەڕەگ، هاوڵاتیبوونی جیهانی، فیکری ئاوێتەخواز، یەکە ئاوێتەکان، دیموکراسیی بەشداریکردن، ئەقڵی تاوتوێکار، لۆژیکی گۆڕانکاریخواز، ڕۆشنگەریی بەردەوام، فەزای کۆکەرەوە و بەتایبەتیش بێفیزیی بوونخوازی و خۆپارێزیی مەعریفی، واتە ئەوەی وامان لێدەکات هەڵوێستی دانپیانان، ڕێزگرتن، چاودێری و پاراستن بەرامبەر هەر تاک و بوونەوەرێک بگرینەبەر. چونکە هەرشتێک حەقیقەت و بەش و ڕەوایەتیی خۆی هەیە، هەر بوونەوەرێک هێز و جوانی و کاریگەریی خۆی هەیە. بەبێ ئەوە، نەرجسییەت و ناوەندیخوازیی مرۆڤ لێمان هەڵدەگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی شت و بوونەوەرەکان تۆڵەمان لێ بکەنەوە.

لە ڕووی عەرەبیشەوە، دەشێت بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە و بنیاتنەرانە چارەسەری

جووتە دەربڕێک بکەین: یەکەم بڕوای دەستەبژێری هەڵبژاردە کە بریتییە لە قۆرخکردنی کلیلەکانی حەقیقەت و ڕێی ڕاست پیشاندان و بەختەوەری لەلایەن هەر لایەنێکەوە و پیادەکردنی چاودێریکردنی کاروباری گشتی و لەژێر ئەم یان ئەو دروشمدا. ئاکامەکەش ململانێی شرۆڤەکردنەکان و جەنگی ڕەتکردنەوەی نێوان تایەفە و مەزهەبەکان، یان حیزب و تەوەرەکان بوو. دووەم گرێی تەماهیکردن لەگەڵ خود و ترس لە خۆرئاوا، کە لە ڕێگەی پیادەکردنی تایبەتمەندییەوە گوزارشتی لێ دەکرێت، لەبەر یەککەوتەیی و بۆشی، یان ستەمکاری و نادیدەیی، یاخود هێرشکردنی کولتووریی خۆرئاوایی، پاش تیخکردنمان لەلایەن خۆرئاواوەو گۆڕانی بیرۆکە و بەهاو سیستەمەکانی بە بنچینە و سەرچاوەی تێڕوانین و کاری ئێمە، ئەمەش لە بواری بەرگریکردن لە ڕەسەنایەتیدا ئەوپەڕی ساختەکارییە.

باشترە مەسـەلەکان بخەینـەوە سـەر ڕێـڕەوی خۆیـان: پیادەکردنـی زیندوێتی بوونخوازیمان و خستەگەڕی وزە فیکرییەکانمان، بە کارکردن بە زمانی خوڵقاندن و گۆڕانکاری، یان شەریکایەتی و تاوتوێکردن، بەجۆرێک کە بەشداربیکەین لە داهێنانی چەند ناونیشـان و بەهایەکی نوێـدا بۆ دروسـتکردنی ژیـان و جیهـان، یان لانی کەم بەشداریکردنمان لە بەرهەمهێنانەوە و داڕشتنەوەی ناونیشانە کۆنەکان، بەمەبەستی دەوڵەمەندکردن و گەشەپێدان. بەبێ ئەوە ئەوانیتر دانمان پێدا نانێن، چۆن دانمان پێدا بنێن، ئەگەر ئێمە دان بەیەکدا نەنێین؟

ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەخاتەڕوو: ئایا ڕووناکبیر، فەیلەسووف، شاعیر، ئەدیب و فەقیهەکان دان بەیەکتردا دەنێن؟ واقیع پێچەوانەی ئەوەیە، وەک مشتومڕە توندوتیژەکان و وشە برینداركەرەکان دەیانخەنەڕوو، ئەوانەی ڕقیان لێ دەتکێت و ویستی سڕینەوە و ڕەتکردنەوە بەرجەستەدەکەن.

جارێکی تر، ئەوەی پێویسـتمانـە، دانپیانانی دوولایەنەیــە بۆ بەهێزکـردن یان خەملاندنی بەهاکانی خۆپارێزی و بێفیزی، یان ئاڵوگۆڕکردن و هاوکاری.

## پەراوێزەکان:

١- هێما بۆ ئەوە دەکرێت، کە زاراوەی «هەمەڕەنگی» هاوتای زارەوەی فەڕەنسی (Diversite)یە، وەک ئەوەی لەو دەربڕینانەدا بەکاردەهێنرێت کە هێما بۆ هەمەڕەنگیی بایۆلۆژیانە یان مرۆڤانە دەکەن (Diversite Biologique ou Humaine)، بەڵام زاراوەی «فرەیی» هاوتا فەڕەنسییەکەی بریتیە لە (Multiple ou Pluriel)و لەو دەربڕینانەدا بەکاردێت کە هێما بۆ فرەجەمسەری (Multipolarisme) یان فرەلایەنی (Multilateralisme) یان فرەژیری (Intelligence Plurielle) دەکەن.

٢- فەیلەسووفی ئەڵمانی (ئەکسل هۆنت) بە یەکێک لەو فەیلەسووفە دەرکەوتووانە دادەنرێت، کە کار لەسەر چەمکی دانپیانان و نوێکردنەوەی کردوە. بڕوانە ئەو چاوپێکەوتنەی گۆڤاری ئسپری (Esprit) لە تەمموزی ٢٠٠٨ و لەژێر ناونیشانی «فەلسەفەی دانپیانان: ڕەخنەیەکی کۆمەڵایەتی»دا ئەنجامیداوە.

٣- هێما بۆ ئەوە دەکەم، کە (والتەر بن میکلن) لەم ماوەیەدا (شوباتی ٢٠٠٨) کتێبێکی بەناونیشانی «هەمەڕەنگی دژی یەکسانی» نووسیوە. بڕوانە وتارەکەی لەمبارەیەوە: «ئازادی، برایەتی... هەمەڕەنگی؟»ی ڕۆژنامەی لۆمۆند دیپلۆماتیک، ژمارەی شوباتی ٢٠٠٩.

٤- (بیار روزانفالون)، مامۆستای کۆلیژی دی فرانس و سەرۆک کۆماری بیرۆکەکانی فەرەنسا، ناوبرەوشاوەترین شارەزای فیکری سیاسییە و یەکێکە لەوانەی چەمکی دیموکراسی نوێدەکاتەوە، بەوەی بیخاتە بەر پشکنینی ڕەخنەگرانە و شیکردنەوەی ئەقڵانی، لەبەر ڕۆشنایی تێکشکانەکان و تەحەدداکاندا. ئەوەش لە بەرهەمە جۆربەجۆرەکانیدا، بەتایبەتی دواکتێبی: «ڕەوایەتیی دیموکراتی»دا (٢٠٠٨) دەردەکەوێت. لەمبارەیەوە بگەڕێرەوە بۆ پێشکەیی ئەو کتێبەی لەژێر ناونیشانی «هەڵوەشاندنەوەی دیموکراسییەکان» و گۆڤاری ئسپریی ژمارەی ئاب/ئایلولی ٢٠٠٨دا بڵاوکراوەتەوە.

٥- وای لێهاتووە فرەیی گشت لقەکانی مەعریفە تیخدەکات. لە دەروونناسی دەرکپێکردندا، دەشێت مەسەلەو کێشەکان بە دەستەواژەی «فرەژیری یان فرەئەقڵی» لێکبدرێنەوە. لەمبارەیەوە بڕوانە کتێبی زانای ئەمریکی (هوارد گاردنەر): «پێنج ئەقڵ لەپێناو داهاتوودا»، کتێبخانەی عوبەیکان لە ڕیاز ٢٠٠٧. ئەمەش لە بواری مێژوودا ڕوودەدات، کاتێک دەبینین سەردەمی نیولیتی، کە مرۆڤایەتی لەگەڵیدا لە قۆناغی ڕاوکردنەوە چۆتە ناو قۆناغی کشتوکاڵی و شوانکاری و نیشتەجێبوونی شارییەوە، تاق و تەنیا نەبوو، بەڵکو لە ڕووی بنەچە و شێوازەکانییەوە فرەلایەن بوو. لەمبارەیەوە بڕوانە ئەو چاوپێکەوتنەی (جان گیلان)ی مامۆستای کۆلیژی دی فرانس (شارەزا لە بواری ژیواری ئەورووپای سەردەمی نیولیتیدا) لەگەڵیدا کردوەو لە گۆڤاری «زانستە مرۆڤایەتییەکان»ی ژمارەی ئازاری٢٠٠٩دا بڵاوبۆتەوە.

هەروەها لە کایەی مرۆڤزانیدا، چونکە چیتر قبوڵکراونییە کار لە کایەیەکی تایبەت بە کۆمەڵێک بکرێت، کە لە گۆشەگیریی کولتووریدا دەژی. ئەوەی ئیمڕۆ ڕوودەدات، کارکردنە لەسەر چەند کۆمەڵێک کە کرلێککردن لەنێوانیاندایە. لێرەوە بواری کارکردن گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەویش بە کرانەوە بەڕووی شوێنەوارو دیمەنەکاندا. لەمبارەیەوە بڕوانە ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ مرۆڤزان (مارک ئابلیە) لە گۆڤاری «بلیمەتەکانی زانست»ی ژمارەی شوبات- نیسانی ٢٠٠٩دا لەگەڵی کراوە. پێدەچێت ئەوەی لە بواری پزیشکیدا ڕوودەدات، کاتێک تاقە نەخۆشییەک (بۆ نموونە شێرپەنجە) لە یەک ئۆرگاندا بەشێوەیەکی فرەلایەن دەستنیشانو چارەسەر دەکرێت.

## کاری هاوبەش(١)

ئەو رۆڵە کامەیە دەبێت ناوەندی عەرەبی بۆ رووناکبیری و راگەیاندن، وەک دامەزراوەیەکی عەرەبی کە بایەخ بە سمبول و داهێنەرەکانی نەتەوەکەی دەدات، بیگێرێت؟

راشکاوانە وەڵامەکەم ئەمەیە: ئەوەی چاوەڕواندەکرێت هەر دامەزراوەیەکی کاری هاوبەشی عەرەب بیکات بریتییە لە: چۆن عەرەب لە دەستەوسانی خۆی دەربهێنێ، هەتاکو دەستپێشکەریی مێژوویی خۆیان بەدەستبهێننەوە و زیندوێتی بوونخوازی خۆیان پیادەبکەن، بۆ ئەوەی پێشکەوتنی خۆیان دروستبکەن و ببنە شەریکێکی بەرهەمهێن و کارامە لە ۆرکشۆپی ژیواری و لەسەر شانۆی جیهان؟

### أ. کێشەکە:

بیانوی پرسیارەکە، واقعی جیهانی عەرەبە لە ئیمرۆدا، بە پاشکەوتن، پارچەپارچەبوون، نەخۆشی و قەیرانەکانییەوە.

بێگومان عەرەب لەچاو رابردوودا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەڵام بەراورد بە پێشکەوتنی ئەوانیتر پاشکەوتوون. بۆیە هێشتا ئەو پرسیارەی لە سەردەمی رێنسانسەوە خۆی دەردەبڕێت، بەڵام بەشێوازێکی نوێ، هەمان پرسیارەکەی پێش دوو سەدەیە: بۆچی خۆرئاواییەکان پێشکەوتن و موسڵمانەکان دواکەوتن؟ بەڵام ئێستا بۆتە: بۆچی زۆر کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی و ئاسیایی و ئیسلامی پێشکەوتن، کەچی عەرەب بەراورد بەو ئامانج و دروشم یان دەستکەوتانەی ئەوانیتر ناتوانن پێشکەون؟

ئەمە باری وڵاتەکانی وەک یابان و کۆریا و مالیزیایە، کە چەندین موعجیزەیان لە بواری پەرپێداندا دروستکردوە. ئەوەتا چین، هیندستان، بەرازیل، تورکیا و چەندین وڵاتی تازە دەرکەوتوون، کە کۆتوبەندەکان دەشکێنن و دەکەونە پاڵ کاروانەکە، بۆ ئەوەی هاوشانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دەوڵەتە ئەورووپاییەکان ببنە شەریک لە پیشەسازی و سەرکردایەتیکردنی جیهاندا، ئەوەش لە رێگەی بەرهەمهێنانی سامان، زانیاری، تەکنۆلۆژیا و تەنانەت بیرۆکەوە.

ڕەچاودەکرێت هەندێک لەو وڵاتانە خاوەنی ئەو سامانە بێشومار و دەوڵەمەندە، سروشتی و مادییە، یان کەلەپووری و سمبولییە نین کە عەرەب هەیانە، بەڵکو هەندێک لەوانە زۆر لە عەرەب پاشکەوتووتربوون، کەچی توانیان پەراوێز جێبهێڵن، هەتاکو پێشکەوتن بەدەستبێنن، یان پەرەسەندن بهێننەدی، یاخود موعجیزە دروستبکەن.

## اا. پارادۆکسەکە:

ئەوەش پارادۆکسەکەیە: چونکە لە جیهانی عەرەبدا دەوڵەمەندییەک لە دەرهاویشتەکاندا هەیە، لەبەرامبەر شکستخواردنێک لە بەڕێوەبردن و تەگبیرکردندا. سوپایەک لەوانە هەیە کە خوێندنیان تەواوکردوە، لەبەرامبەردا دەگمەنی لە دەرفەتەکانی کارکردندا بەدیدەکرێت. چەندین گەنجی جیاکارە و سەرکەوتوو هەن، کە دەگۆڕێن بۆ کۆچکردوو یان بێکار. کەواتە بەهەدەردانێکی دووقات لەئارادایە.

ئەم واقیعە تەحەددایەکی گەورەیە لەبەردەم کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا، بەتایبەتی لای ئەوانەی سەرقاڵی کاری گشتین، یان دەچنە ناو کاری عەرەبیی هاوبەشەوە.

با دان بەوەدا بنێین، هەتاکو بزانین چۆن واقیعەکە دەستنیشاندەکەین و کێشەکە هەڵدەوەشێنین، بەمەبەستی دۆزینەوەی چارەسەرەکان. پرسیارەکە: چۆن ئەم یان ئەو وڵات دەتوانێت وزەکانی خۆی بخاتەگەڕ و هێزەکانی خۆی ببزوێنێ و سمبولە داهێنەرەکان و نموونە سەرکەوتووەکانی خۆی لەو کار و پرۆژانەدا وەبەربهێنێت، کە بەسوود و پەرەپێدان بۆ هەموو کۆمەڵگە بەگشت توێژ و توێژاڵەکانیەوە دەگەڕێتەوە؟ پرسیارێکی تر: چۆن دەتوانین پاشکەوتن بگۆڕین بە پێشکەوتن، وەستانی ئابووری بگۆڕین بە پەرەپێدان، دەستەوسان بگۆڕین بە موعجیزە، پەراوێزبوون بگۆڕین بە ناوەندێکی کاریگەر؟

بەبڕوای من کلیلی وەڵامەکە، گەڕانەوەیە بۆ بنەچە و بنچینە، واتە بۆ ئەو فیکرەی خەسڵەتی مرۆڤ و بەڵانس و یەکەمین سەرمایەیەتی، بەبێ گوێدانە شوناس، یان پیشە، یان کار، یاخود توێژی کۆمەڵایەتیی.

ئەمەش ئیشکالیەتەکەیە، چونکە ئەوەی نەتوانێت بەشێوەیەکی بەپیت و خوڵقێنەر، یان بنیاتنەر و بەرهەمدار بیریکاتەوە، ئەوا وزەکەی خۆی پەکدەخات و سامانەکەی خۆی بەهەدەردەدات یان دەرامەتەکانی خۆی بەفیڕۆدەدات. بۆیە پێناسەکەی من بۆ پەراوێزکار ئەوەیە کە بەچاکی ئەقڵی خۆی بەکارناهێنێ و سامانەکانی وەبەرناهێنێت. نموونەکان لە جیهانی عەرەبدا ئاشکرا و ئابڕووبەرانەن، چونکە دەرامەتێکی زۆر هەیە، بەڵام کەمیی بیرۆکەکان لەئارادایە، یان ئەوانە

لەئارادان کە بەشێوەیەکی خراپ، یان نەزۆک، یاخود وێرانکـەر بیردەکەنـەوە.
لێرەدا بیرپارەکان لەوە بەدوورناگرم.

پێچەوانەکەش ڕاستە: ئەوەی بەشێوەیەکی زیندوو و خوڵقێنـەر یان لێهاتوو بیردەکاتەوە، دەتوانێت بەباشی دەرامەتەکانی وەبەربهێنێ، یان سامانەکەی دووقات بکات، یاخود تواناکانی خۆی بنیاتبنێ، لەوانەشە بتوانێت چەند سەرچاوەیەکی نوێ بۆ وزە بخوڵقێنێت، ئەمە ئەگەر خاوەنی ئەو سەرچاوانە نەبوو.

### III. میتۆدەکە:

سەرەتای بیرکردنەوەی بەرهەمدار، داننانە بە کێشەکەدا، لە ڕێگەی دەستنیشانکردن و تێگەیشتنیەوە، بۆ سەرلەنوێ دارشتنی ئاراستەکان و ڕیزکردنەوەی ئەولەویاتەکان و بنیاتنانی پلان و ستراتیژەکان، کە پێویستیان بە ئەنجامدانی کاری پێداچوونەوەی ڕەخنەگرانە و لێپرسینەوەی ئەقڵانیانـە هەیـە. ئەمەش مەسـەلەیەکی میتۆدەییـە و لە جیهانی عەرەبدا لە سـەرووی هەموو بایەخپێدانەکانەوەیە، چونکـە گەلێک جار لە ڕووبەڕووبوونەوەی قەیران و تەحەدداکان هەڵدێین، یان دەیانگێڕینەوە بۆ ئەویتر، یاخود کاردەکەین بۆ خوڵقاندنی چەند دوژمنێکی لە ناوخۆ و دەرەوە، بۆ ئەوەی لەو هەقداریانە هەڵبێین، کە پەیوەندیان بە ئازادییە گشتییەکان، یان چاککردنی هەلومەرجی ژیانەوە هەیە.

ڕەخنەش بەمانا ناسراو و باوەکەی پیادەناکرێت، واتە وەک هەڵوەشاندنەوە و ڕەتکردنـەوە، یان تۆمەتبارکـردن و تاوانبارکـردن، یاخـود دوورخسـتنەوە و تۆڵەسـەندنەوە، وەک ئەوەی خاوەنەکانی ئەقڵی فەندەمەنتالیستی هەڵبژاردەخوازی تاکڕەهەند پیادەیدەکەن. چونکە کاری ڕەخنەگرانە، بەمانا پۆزەتیڤ و ئەقڵانی یان بنیاتنەرەکەی، کردنـەوە و دۆزینـەوە یان فراوانکردنی دەستدانە لە ڕێگەی کاری لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە، یان توێکاری و هەڵوەشاندنەوەوە، بەمەبەستی بنیاتنانـەوە و پێکهێنانـەوە، بەجۆرێک کە هۆشـداری دەربارەی هەڵەکان یان دۆزینەوەی تەنگژەکـان بدرێت، یاخود ئەو دروشـم و ئامرازانـە توڕبدرێن کە سواون، بەڵام بە پاراستنی دەستکەوتەکان بۆ بنیاتنان بەهۆیانەوە و لەسەر بنچینەیان. بەم مانایە، ڕەخنەگرتن هەڵوەشاندنەوەی ئاستەنگێک، یان کردنەوەی داخراوێک، یان ڕەواندنەوەی وەهمێک، یاخود دەربازبوون لە تەنگژەیەکە، لە ڕێگەی دۆزینەوەی ئامرازێک، چارەسەری کێشەیەک، پێکهێنانی هاوکێشەیەک، یان خوڵقاندنی دەرفەتێکەوە.

### IV. دەرفەتەکە:

ئاخاوتن دەربارەی دەستدان و دەرفەت وام لێدەکات هەڵوەستە لەئاست ئەو رۆڵەدا بکەم، کە خراوەتە ئەستۆی ئێمەی کارکەرانی کایەکانی فیکر و لقەکانی مەعریفە، ئەمەش بەجۆرێک لە هەڵگەڕانەوەی رەخنەگرانە بەرامبەر بە خود، هەتاکو جارێکی بڵێم کێشەکەمان لەگەڵ بیرۆکەکانی خۆماندایە، بەڵام کێشەکەمان لەگەڵ ستەمکار و پیاوی ئایینی یان خۆرئاوا، وەک زۆرێک بەهەڵەدا دەچن، کێشەیەکی دەرەکیی پلە دووە. واتە کێشەکەمان کێشەی شوناس یان ئازادی نییە، بەڵکو کێشەی مەعریفەیە. چونکە هیچ کەسێک رێگە لە بیریارێک ناگرێت قەدەغەکراوەکان هەڵوەشێنێت یان پێشهاتەکان بخوێنێتەوە، بەمەبەستی دۆزینەوەی میتۆدێک، یان کردنەوەی کایەیەک، یان دارشتنی تیۆرێک، یاخود داهێنانی کەرەستەیەکی چەمکئامێز.

بۆیە ئەرکی یەکەممان ئەوەیە، لە کارەکەماندا قاڵبین و لە شیکردنەوەی دیاردەکان و لێکۆڵینەوە دەربارەی کێشەکان و تێگەیشتن لە واقیعی جیهانیدا، کار بە تایبەتمەندیی خۆمان بکەین، ئەوەش بە کەرەستەکانی کایەکەمان، وەک تێگەیشتن و فۆرمی بەئەقڵانیکردن و سیستەمە مەعریفییەکان...

ئەو شۆرش و گۆرانکاری و شەپۆلە تەکنۆلۆژی، رووناکبیری، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵگەییانەی ئێستا روودەدەن، هەرەشە نین، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەرفەتن بۆ ئەوە بچینە ناو ئەو گفتوگۆ جیهانیانەی لە گۆرەپانی فیکردا لەبرەودان. هەتاکو بتوانین هاورێی ئەو شتانە بین کە لە ناوەندەکانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەدا بەرهەمدەهێنرێن. لەپێناو داهێنانی چەند ناونیشانێکی نوێ، یان گەشەپێدانی ناونیشانە کۆنەکان دەربارەی ئەقڵانییەت و دیموکراسی و رۆشنگەری...

کەواتە با ئێستا، لە سەردەمی جیهانگیری و زانیاریی گەردوونیدا، دەرفەت بەفیرۆنەدەین، وەک ئەوەی لە سەردەمەکانی رێنسانس و شۆرش و مۆدێرنیتەی سەرەتادا کردمان و بایەخدانە ئایدیۆلۆژییە ناسیونالیست، یان ئایینی، یاخود سیاسییەکان زاڵبوون بەسەر خولیا مەعریفییەکان و دروستکردنی چەمکەکاندا. ئەمەش وای لێ کردین ببینە چەند بیریارێکی بێ بەرهەم یان تێکۆشەری شکستخواردوو. ئێستا دەرفەتەکە لەوەی رابردوو لەبارترە، بەوپێیەی دەستدان فراوانترە و دەرگاکان واڵان. بەڵگەش ئەوەیە، چیتر بەرهەمهێنانی مەعریفی تایبەت نییە بە وڵاتێک یان شوناسێکی کولتووری و چیتر لەلایەن خۆرئاواییەکانەوە قۆرخ ناکرێت، چونکە زۆر بیریار هەن بەشێوەی جیهانی پیادەی توێژینەوە و چالاکییەکانیان دەکەن، بۆ ئەوەی بچنە ناو زرکشۆپی بەرهەمهێنانی مەعریفییەوە و چەند بیرۆکەیەکی کیشوەربڕ و کولتووربڕ

بەرهەمبهێنن، وەک لە چین، هیندستان، یابان، بەرازیل و هەندێک لە ئەفریقاییەکان ڕوودەدات. لێرەوە دەبینین ناودارانی فیکر، جا ڕەگەزنامەکەیان هەرچییەک بێت، بەهۆی بیرۆکە، گفتوگۆ، کۆڕەکان و شوناسەکانیانەوە بوونەتە ئەستێرەی جیهانی. ئەوەش جیهانگیریی بیرۆکەکان و بەجیهانیبوونی بیریارەکانە.

با دیموکراسی بە نموونە بهێنینەوە. دیموکراسی تەنیا ڕێکارێک نییە وەریبگرین یان فۆرمێک نییە جێبەجێیبکەین، بۆ ئەوەی بیگۆڕین بۆ حکومەتێکی دیکتاتۆری یان دروشمێکی بۆش، وەک چۆن پەیوەندیی خۆمان بە ئەقڵانییەت و ڕۆشنگەری و سۆشیالیزمەوە گۆڕی بۆ چەند کردەیەکی تاریک یان ڕەقهەڵاتنێکی فیکری... دیموکراسی نەشونماکردنی تێگەیشتنەکەیەتی، بەئەندازەی ئەوەی پیادەکردنێکی زیندوو و ئەزموونێکی دەوڵەمەندە، بەهۆیەوە دەگۆڕێین و پەیوەندیی خۆمان بەواقیعەوە دەگۆڕین. ئەمە ئەوەیە کە لەسەر زەمینەی دیموکراسییە خۆرئاواییەکان ڕوودەدات و دیموکراسی بە قەیران و تێکشکانەکانیەوە هەمیشە دەکەوێتە بەر گفتوگۆکردن، لەپێناو گەشەپێدان و فراوانکردنی دەستدانەکانی لە ڕووی چوارچێوە و دامەزراوەو میکانیزمەکانیەوە...

بۆیە ئەوەی ئێمە ئێستا پێویستمانە، شکاندنی قۆزاخەی مرۆڤزانییە، لەگەڵ قسەنەکردن دەربارەی هەڵمەتی داگیرکاریی کولتووری، بەڵکو کارکردنە بە ئەقڵی خۆمان و خستنەگەڕی وزە فیکرییەکانمانە، بۆ ئەوەی هەڵمەتی داگیرکاریی جوان و دەوڵەمەند پیادەبکەین. ئەمەش بەهۆی بەرهەمهێنانی ئەو بیرۆکانەوە، کە بەهۆیانەوە لە واقیعەکەمان تێدەگەین و ژیانی خۆمان دروستدەکەین و کولتووری خۆمان و کولتووری گشتی یان جیهان دەوڵەمەنددەکەین، هەتاکو بەشداربیکەین لە بەڕێوەبردنی جیهان و مەسەلەکانیدا.

ئەمە ئەوەیە کە لەلایەن خۆمەوە دەیکەم، چونکە کۆتوبەندی مرۆڤزانیم شکاندوە و لەمێژە دەستبەرداری بەڕەگەزکردنی ئەقل و زانینەکان بووم و چیتر باسی ئەقڵی عەرەبی، یان ئیسلامی، یاخود خۆرئاوایی ناکەم، لەپشت چەمکی پێکدادانی کولتوورەکان و پێگەی شوناسەوە سەنگەر لێ نادەم، بەڵکو بەپێی پیشەکەم کار بۆ شیکردنەوەی دەکەم، بەئەندازەی ئەوەی وەک کارکەرێکی بواری مەعریفە ڕەفتاردەکەم، ئەوەی ئەرکەکەی بەرهەمهێنانی ئەو بیرۆکانەیە، کە قسە لەگەڵ هەریەکێکدا دەکەن شەیدای مەعریفەیە.

### ٧. پرنسیپەکە:

هیچ بەڕێوەبردن و تەگبیرکردنێک بەبێ گۆڕانکارییەک، کە پەی بە چوارچێوەکانی

ڕوانین یان ئامرازەکانی کارکردن لە یەکێک لە ڕووەکانەوە دەبات، بوونی نییە، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە ڕیفۆرمەوە هەبێت، یان ڕابوون، یاخود نوێکردنەوە و گەشەپێدان.

ئەمە ئەوەیە کە کۆمەڵگە زیندوو و کراوە و گەشاوە، یان پێشکەوتوو و پەرەسەندووەکان دەیکەن. ئەوان لەهەمبەر گۆڕانکاری و هەقدارییەکاندا گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەتایبەتی کە جیهان وەک پێشوو نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕیشەیی و بونیادی و خێرا گۆڕانی بەسەردا دێت. لێرەشدا هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ چوونە ناو ئەو جیهانە و بەشداریکردن تیایدا، جگە لە گۆڕانکارییەکان کە پەی بە میتۆدەکان و پرنسیپەکان و تیۆرەکان دەبەن. جا ئەگەر ئەمە ئەوە بێت کە نەتەوەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قەیران و گرفتەکان دەیکەن: بەدەستهێنانی ویست و بنیاتنانی توانا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ و بنیاتنەرانە بگۆڕێن، وەک دروشمەکەی سەرۆکی ئەمریکی (باراک ئۆباما) کە سەرکردایەتیی دەوڵەتێکی مەزن دەکات، ئەوا واچاکە عەرەب، پاش ئەوەی لە کاروانەکە دواکەوتوون و وەک پیاوە نەخۆشەکەی جیهانیان لێ هاتوە، بگۆڕێن. واتە ئەوەی زۆر پێویستیانە، دۆزینەوەی ئەو توانست و ڕێگا و ئامرازانەیە، کە دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێنێت گوێزانەوەیەکی چۆنایەتی بهێننەدی، هەتاکو لە پەراوێزبوونی خۆیان بێنە دەرەوە و پێشکەوتنێک بەدەستبهێنن کە لە تۆماری ژیواریدا بۆیان بنووسرێت.

ئەگەر ڕەخنەی بنیاتنەرانە میتۆدە کاریگەرەکە بێت، ئەوا گۆڕانکاری ئەو پرنسیپەیە کە بە چەمکە ئاوێتەکەی و مانا هەمەجۆرەکانییەوە کاردەکات: گۆڕانکارییەکان دەرفەتن نەک کارەسات، نوێ دەوڵەمەندبوونە نەک هەڕەشە، گەنجان وزەن نەک بارگرانی. گرنگترینیش ئەوەیە کە واقیع هەمیشە دەگۆڕێت، بەئاشکرا یان نهێنی، بەخراپی یان باشی. بۆیە بێگومان ئەوەی پێش ناکەوێت، پاشدەکەوێت و ئەوەی باش نەبێت لە خۆگۆڕیندا، ئەوا گۆڕانکارییەکان دەیخەنە پەراوێزەوە، یان پێشهاتەکان تۆڵەی لێ دەسەندنەوە.

## VI. چەمکەکان:

ئەو پێشوەخت و وێناکردنانەی دەشێت و پێویستە بگۆڕێن، پەی بە پەیوەندیمان بەخۆمان، شوناس، کەلەپوور، ئەویتر و جیهان دەبەن. هەروەها پەی بە چەمکەکانمان دەربارەی تاک، کۆمەڵگە، دەسەڵات، هێز، کار و بەها دەبەن. ئەمە لە ڕوویەکەوە زیاتر و بە زیاتر لە مانایەک:

١- یەکەم کەلەپوورەکەمان یەکێکە لە کۆڵەکەکانی شوناس و کەسایەتیمان، هیچ

کەسێک ناتوانێت لێمانی داماڵێت، بەڵکو چاوەڕوانی ئەو کەسەیە کە لەبەر ڕۆشنایی پرسیار و ڕاستی و کێشەکانی سەردەمدا کاری لەسەر دەکات، بۆ ئەوەی بیگۆڕێت بە دراوێک کە لەسەر ئاستی گۆڕەپانی فیکری لە جیهاندا شایستەی تاوتوێکردن بێت. بۆیە کێشەکە ئێستا ئەوە نییە نەگۆڕەکان بپارێزین یان دەستبەرداریان بین، چونکە ئەوە تۆقاندن و خەپاڵپلاوی و سادەکارییە. مەسەلەکە ئەوەیە، پەیوەندیی زیندوو، پەرەسەندوو، نوێبوەوە، گەشەندوو و هەنوکەیی لەگەڵ نەگۆڕەکانماندا بکەین. بەشێوەیەک کە شوناسەکەمان نوێبێتەوە و وای لێ بکات بەهۆی بەرهەمهێنانی حەقیقەتەکان و خوڵقاندنی پێشهاتەکانەوە دەوڵەمەندتر و بەهێزتر بێت. ئەوەی بیەوێت لەباری خۆیدا بمێنێتەوە، ئەوە لەدەستدەدات کە دەیەوێت بیپارێزێت و پەیوەندییەکی هەژارانە، ڕەقهەڵاتوانە، یان دوژمنکارانە لەگەڵ نەگۆڕەکانی خۆی دەبەستێت.

ب- دوەم ئێمە وەک میللەت و نەتەوەکانی تر بەشێکین لە جیهان، نە باشترین لەوان و نە کەمتریش. خەسڵەتی هەریەکێکیش لە ڕەچەڵەک و بنچینەی خۆیەوە بەدەست نایەت، بەڵکو لە ڕێگەی ئەوەی دەرەقەتی دێت یان قاڵدەبێت تیایدا، یاخود لە ڕێگەی ئەو بەها مەعریفی، جوانکاری، ئەخلاقی، یان پێکگەیشتنکارانەی دەیانکات و ئەنجامیاندەدات، جا تاک بێت یا کۆمەڵ، دەوڵەت بێت یان کۆمپانیا، حکومەت بێت یان دامەزراوەیەکی ئەهلی. ئەمە پاسپۆرتی مرۆڤ و ئامرازەکەیەتی بۆ پچڕینی دانپیانان و ڕەوایەتی لە پیشەکەی، دەوروبەرەکەی، کۆمەڵگەکەی، یان جیهاندا: کارکردن و پسپۆڕی، لێهاتوویی و لێوەشاوەیی، دۆزینەوە و داهێنان لە یەکێک لە کایەکاندا.

یەکێک لە پارادۆکسەکان ئەوەیە، کۆمەڵگە عەرەبییەکان- کە خەڵکەکەی بانگەشەی ئەوە دەکەن خاوەن کتێبێکن هانیاندەدات بۆ خوێندنەوە و بیرکردنەوە لە دنیا و بوونەوەرەکان - لە ڕووی ڕووبەرکانی خوێندنەوەوە لەئاستی هەرە خوارەوەدان. ئەمەش نیشانەی نەزانی و شکستخواردنیانە و ناویان لە جیهاندا دەزڕێنێت. لێرەوە پێداویستیی هەرە گرنگ بۆ دەرچوون لە باری سڕبوونی فیکری و قۆزاخەی کەلەپوور، کرانەوە و ئاگاداربوون و هاوڕێیکردنی هەمیشەیی هەرشتێکی نوێیە، هەروەها مامەڵەکردنە بە لۆژیکی نوێ و ئیجتیهاد و ڕەخنەگرتن لەگەڵیدا، بەبێ هیچ گرێ و مەراقێک.

### VII. بکەرەکە:

ج- سێیەم گۆڕینی تێڕوانینە بەرامبەر بە تاک، جا ئینتیما یان کار یاخود

دەوروبەرەکەی هەرچییەک بێت، بە مامەڵەکردن لەگەڵیدا لە ڕێگەی چەمکی بکەری پسپۆڕ و بەرپرسیارەوە. بێگومان تاک ئیمانی خۆی هەیە، با ئیمانی بەوە هەبێت کە دەیەوێت، جا خوا بێت یان مرۆڤ، دەق بێت یان ئەقڵ، شورا بێت یان دیموکراسی، بەمەرجێک لە کارەکەیدا قاڵبێت و لێوەشاوەیی خۆی بسەلمێنێت. هەروەها هەرتاکێک هاوڵاتییە لە دەوڵەت و نیشتمانێکی کۆکەرەوەدا، بەبێ گوێدانە ئیمان و بڕواکەی. چەمکی هاوڵاتیی مەدەنیانەش دەستکەوتێکی نوێیە و شایستەی ئەوەیە بیپارێزین، بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەستەگەرییە تایەفەگەر و هۆزگەرە تەشەنەسەندوەکان، کە کۆمەڵگەی عەرەبی هەنجن هەنجن دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا تاک تەنیا ئیماندارێک یان هاوڵاتیەک نییە، بەڵکو بکەرێکی پسپۆڕ و بەرهەمهێنیشە، بەئەندازەی بەشداریکردن و کارابوونی لە کارەکەی، یان دەوروبەرەکەی، یاخود کۆمەڵگە گشتییەکەیدا. ئەوەی کاریش ناکات هەر کارایە، بەڵام بەشێوە نێگەتیڤ، یان نەرێک، یاخود وێرانکارەکەی کە دەبێتە مایەی بەهەدەردان و لەناوچوون، یان بۆشایی و دڵشکان، یاخود توندوتیژی و تیرۆر.

ئەوەی چەمکی تاکی کاراش بەهێزدەکات ئەوەیە، کە چیتر کارکردن لەگەڵ شۆڕشی کۆمۆنیکاشیۆن و زانیارییەکاندا پشت بە هێزی بازوو و دەست نابەستێت، بەڵکو پشت بە خستنەگەڕی وزەی ئەقڵی و وەبەرهێنانی زانیاری و زانینەکان دەبەستێت. بەم مانایە، هەر تاکێکی کارکەر ئیمڕۆ بە کرێکاری مەعریفە دادەنرێت، وەک ئەوەی بەزمانی سەردەم دەردەبڕێت. واتە ئەو تاکەی توانای ئیجتیهادکردن و داهێنان و پێشنیارکردنی شتێکی هەیە کە بەشداریدەکات لە چارەسەرکردنی کێشەکان، یان چاککردنی کارڕاییکردندا.

## VIII. بیرۆکە و سامان:

د – چوارەم گۆڕینی تێڕوانینە دەربارەی کۆمەڵگە، بە تێکشکاندنی بەربەستە شاقوڵییەکانی نێوان توێژ و گرووپەکان، یان تیخکردنی بەربەستە ئاسۆییەکان لەنێوان کایە و بوارەکاندا، چونکە چیتر کۆمەڵگەی گەشاوە و لێهاتوو، کۆمەڵگەی دەستەبژێر و جەماوەر، یان پێشڕەو و میللەت، یان سەرکردە و حەشامات، یاخود سەرۆک و ڕەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵگەی چەند کایەیەکی پسپۆڕی و کەرتێکی بەرهەمهێن و ڕەوایەتیەکی کارا و بەرپرسیارانەیە، کە لەنێوان خۆیاندا زانیاری و ئەزموونەکان ئاڵوگۆڕدەکەن، بەجۆرێک کە لەگەڵیدا فەزای کۆمەڵایەتی بە ئاقارە جۆربەجۆرەکان و لەسەر گشت ئاستەکان دەگۆڕێت بۆ ۆرکشۆپێکی فیکری پێکهاتوو لە بزاوتێکی هەمیشەیی

لێپێچینەوە و گفتوگۆکردن، خولّقاندن و داهێنان، پێکگەیشتن و ئاڵوگۆڕکردن. ئەمە کۆمەڵگەی تاوتوێکارە، کە خەریکە لە سەردەمی زانیاری و پێکگەیشتندا پێکدێت.

بۆیە کێشەکە تەنیا پڕکردنەوەی کەلێنی نێوان ڕووناکبیر و میر، یان بیریار و حوکمڕان نییە، وەک خاوەن ئەقڵە دەستەبژێرەکان بیری لێ دەکەنەوە، بەڵکو کردنەوەی کایە و بوارەکانە بەڕووی یەکتردا، بەجۆرێک کە پەیوەندیی دوولایەن و کارلێککردن لەنێوانیاندا دروستبێت، چونکە لەمڕۆ بەدواوە هیچ کەرتێک نییە بەتەنیا دروستبێت و پشت تەنیا بەخۆی ببەستێ، بەتایبەتی کە بەرهەمهێنانی مەعریفە و زانیاری بەردەوام سامان و دەسەڵات بەرهەمدێنێت. ئێمە لەبەرامبەر ئەو چالاکی و کارانەداین ئەو تۆڕانە پێکدێنن کە پەیوەندییان پێکەوە هەیە و کار لێک دەکەن. ئەوانەی بڕوایان بەوەیە کە بیرۆکە پەیوەندیی بە سامانەوە نییە، بەشداریانکردوە لە شکستپێدان و نەزۆکیی بیرۆکەکاندا. لە بەرامبەردا ئەوانەی بەو شێوەیە ڕەفتاریانکردوە کە سامان هیچ پەیوەندییەکی بە بیرۆکەوە نییە، دەوڵەمەندییەکی بێ پەرەپێدانیان هێناوەتەئاراوە. چونکە پەرەپێدان لە هەر بوارێکدا، بەری زیندوێتی فیکر و بوژانەوەی کولتوورە. بەم مانایە، هەر گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی بەری ئەوەیە کە خەڵک لە کایە جۆربەجۆرەکانی کار و بازنەکانی جوڵە یان لەسەر شانۆی چالاکییەکانیان دروستیدەکەن یان ئەنجامیدەدەن.

ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگەکانمان شوناسی خۆیان پیادەبکەن و بگۆڕێن بۆ کۆمەڵگەی بەرهەمهێن و لێهاتوو، ئەمە مەسەلەیەکی ناوەندییە: بڕوا بەوە بهێنین کە گۆڕانکاری، جا ناونیشانە و شێوەکەی هەرچییەک بێت، بە چەند بڕیارێکی سەرەوە ڕوونادات، بەڵکو سەرەنجامی کۆششی کۆمەڵگەیە بە هەموو هێزەکانییەوە. هەروەها هەریەکێک بڕوا بەوە بهێنێت کە گۆڕانکاری ڕووەو باشتر و چاکتر بەرپرسیارێتییەکی دوولایەنەیە دەکەوێتە ئەستۆی گشت بکەرەکان، هەریەکە و لە کایەی کار و بازنەی کاریگەریی خۆیدا.

هـ- پێنجەم پێداچوونەوەیە بە چەمکی دەسەڵات و هێزدا. چونکە دەسەڵات تەنیا دامەزراوە و دامودەزگای سیاسی، یان کارگێڕی، یاخود ئاسایش نییە کە لەسەرەوەڕا پیادەبکرێت. هەر بکەرێک دەتوانێت لە ڕێگەی بەرهەمهێنان و دەستوەردان، یان گفتوگۆ و پێشنیارکردنەوە کار و کاریگەریی هەبێت و لەسەر یەکێک لە ئاستەکان دەسەڵاتی خۆی پیادەبکات.

هەمان مەسەلە دەربارەی هێز ڕاستە، چونکە لە سەردەمی دیجیتاڵدا، کە کێشە و شوناسەکان بەجیهانیدەبن، یان بەرژەوەندی و چارەنووسەکان تێکهەڵکێشدەبن،

وەک ئەوەی گرفتەکان لەسەر گۆڕەپانی جیهانی دەیخەنەڕوو، هێزی سەربازیی ڕووهەڵماڵراو بەتەنیا هێز دروست ناکات، چونکە لەبەرامبەر هێزی مادی یان زۆردار، هێزی نەرم و ژیر یان هێمن و ئاشتیخوازانە هەیە، وەک ئەوەی لە داهێنانی یەکێک لە بوارەکاندا دەردەکەوێت، جا ئەوە دەقێک بێت یان دیوانێک، ڕۆمانێک، ئامرازێک، دراوێک، مارکەیەک، یان ڕێسایەکی چاک بۆ ژیان، یاخود مۆدێلێکی کارا بۆ پەرەپێدان. واتە هەرشتێک شایستەی تاوتوێکردن بێت و کۆمەڵگە و کیشوەر بڕ بن.

## IX. ڕاگەیاندن و هێزەکەی:

باسکردنی هێز پێویستی بەوەیە هەڵوەستە لەئاست ڕاگەیاندنی بینراودا بکەین، کە وای لێهاتووە لە سەردەمی وێنە و نیمەندا بە تەکنۆلۆژیا، کەناڵ، تۆڕ، بەرنامە و کارەکانی زیاترین کاریگەریی لەسەر ژیانی خەڵک هەیە، چونکە بەشداریدەکات لە پێکهێنانی ڕای گشتی و دروستکردنی ڕاستییەکاندا. هەروەها بەو زانیاری، وێنە، سمبول، نموونەی ژیانبەسەربردن و شێوازەکانی ژیان بەدرێژایی کاتژمێرەکان بەشداریدەکات لە پێکهێنانی ئەقڵ و خەیاڵ و چێژ لای چەند توێژێکی فراوان...

لێرەوە ڕاگەیاندنکار یان میدیاکار ئامادەیی خۆی- بەڵکو دەسەڵاتی خۆی پیادەدەکات - تەنانەت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ سیاسەتمەدار و دەوڵەتکاراندا، بەو جۆرەی هەندێک جار لە دیالۆگ و ڕووبەڕووبوونەوە تیڤییەکاندا بەدیدەکەین، کە ڕاگەیاندنکارەکان بەڕێوەیدەبەن و میوانەکانیان دەخەنە بەر لێپێچینەوە و لێپرسینەوەوە، وەک ئەوەی ڕۆژی حەشر بێت.

بەهەرحاڵ، ڕاگەیاندن شمشێرێکی دووسەرەیە، بەواتای ئەوەی سوودەکەی یان مەترسییەکەی پشت بە چۆنییەتی بەکارهێنان و خستنەگەڕی دەبەستێت، وەک ئەوەی لە هەمووشتێکدا هەیە، جا خوا بێت یان ئامێرێک، کاڵایەک بێت یان بیرۆکەیەک، دامەزراوەیەک بێت یان هێزێک... ئەمە کاریگەریی تەلەفزیۆنە: دەشێت ئامرازی ساختەکردن و بەلاڕێدابردن بێت بۆ خستنەوەی پەردەپۆشکردن یان دروستکردنی نەزانی. بەقسەیەکی ڕاشکاوانە: دەشێت کەناڵەکان بەکاربهێنرێن بۆ بڵاوکردنەوەی چەند فەتوایەکی، کە بێدەرەتانن و مایەی پێکەنینن و ناو و ناوبانگی عەرەب دەزڕێنن، یان ببنە بڵنگۆیەک بۆ بڵاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیای سەرتاپاگیر و کولتووری نامیدە، کە حەشامات و تیرۆریستان دروستدەکەن. بەپێچەوانەوە، دەشێت ئامرازێک بن بۆ ڕووناکبیرکردن و پەروەردەکردن و ڕۆشنەنگەرکردن، یان ناوەندێک بۆ بەڕێوەبردنی مشتومڕی بەپیت و تاوتوێکردنی ئەقڵانیانە دەربارەی کێشە زیندووەکان

و مەسەلە چارەنووسسازەکان، یاخود سەکۆیەکی ئازادانە بێت بۆ خستنەڕووی کار و چالاکییە داهێنەر و نوێکان، بە ناوەڕۆکە مەعریفییەکان و ڕەهەندە جوانکارییەکان و بەها پێکگەیشتنخوازەکانیانەوە.

## X. چەند مۆدێلێکی نوێ:

کوتایی قسەکان: لەگەڵ چوونە ناو سەردەمی زانیاری و دیجیتاڵ و کۆمەڵگەی مەعریفەوە، بکەرێکی مرۆیی نوێ، بە فرەیی مۆدێلەکان و هەمەڕەنگیی سمبولەکانییەوە، خەریکە لەسەر شانۆکە پێکدێت و دەردەکەوێت.

با دان بەوەدا بنێین: مۆدێلە ناسراو یان باوەکان ڕاستبێژیی خۆیان لەدەستداوە، جا کەلەپوورخواز بن یان تەنانەت مۆدێرنیست. مەبەست ئەوانەیە کە خاوەنەکانیان بە ئەقڵی فەندەمەنتالیستانەی دوورخەرەوەخواز و تاکڕەهەند، نەرجسی یان بیروکراتی، ئیمپریالی یان جیهادکارانە بیردەکەنەوە... وەک ئەوەی لە مۆدێلی دەستەبژێرانەی شکستخواردو و خەباتکاریی بەسەرچوو، یان بیروکراتیی پەککەوتە و مۆدێلی تیرۆریستانەی کوشندەدا بەرجەستەدەبێت. ئەمە وێڕای مۆدێل و سمبولەکانی تاقە سەرۆک و سەرکردەی ئیلهامبەخش و فریادڕەسی دڵسۆز و مەهدیی مونتەزەر..

وەک دەزانین ئاکامەکە دروستکردنی وەهمەکان و داهێنانی دوژمنەکان و ئاڵۆزبوونی کێشەکانە، بۆ بەرهەمهێنانی پاشکەوتن و گەندەڵی یان ستەمکاری وماڵوێرانیی زیاتر، واتە هەموو ئەو خراپەکاری و مەترسی و کارەساتانەی دەیانچنینەوە.

لەبەر ڕۆشنایی هەرەسهێنان و قەیرانەکان و لەژێر کاریگەریی شۆڕشەکان و گۆڕانکارییەکاندا، ئەوەی مرۆڤایەتی پێویستی پێیەتی، چەند مۆدێل و شێوازێکی نوێیە کە سمبولەکانیان بریتین لە بیل گەیتس، نیلسۆن مەندیلا، ئەحمەد زویل، محەمەد یونس، مهاتیر محەمەد، تەیب ئەردۆگان، یان باراک ئۆباما و نموونەکانیان کە لە کاری ڕۆشنگەریدا سەرکەوتووبوون، یان لە بەرژەوەندیی یاسادا دەستبەرداری دەسەڵات بووە، یان لە بواری کاردا داهێنەربوون، یان لاوازبوون و لەبەردەم خەڵکدا گریاون، یاخود بەشێوەیەکی کراوە و ئاوێتە و سنووربڕ شوناسی خۆیان پیادەکردوە.

لێرەدا هێما بۆ چوار خەسڵەتی ئەو مۆدێل و سمبولانە دەکەم:

١. ئەوانە خۆپارێزی و بێفیزی پیادەدەکەن، بەئەندازەی ئەوەی بەرپرسیارێتی بەرامبەر بەخۆ و ئەویتر و زەوی و سروشت دەگرنە ئەستۆ.

٢. ئەوانە خاوەن شوناسی فرەڕەگ و کراوەن، بەئەندازەی ئەوەی بەشێوەیەکی ئازادانە و سەربەخۆ بیردەکەنەوە.

٣. ئەوانە بە ئەقڵێکی ئاوێتە و ڕەهەندێکی فرەلایەن مامەڵە لەگەڵ واقیع دەکەن، بەئەندازەی ئەوەی قاڵن لە زمانی خوڵقاندن و گۆڕانکاری و تاوتوێکردندا.
٤. بۆیە ئەوانە خاوەن شوناسی جیهانی و گەردوونین و بایەخ بە کێشەکانی کۆمەڵگەکان و وڵاتەکانیان دەدەن، بەئەندازەی ئەوەی کێشەکان و داهاتووی مرۆڤایەتی یان مەسەلە و چارەنووسی زەوی جێی بایەخدانیانە.

## XI. گرەوەکە:

بێگومان ئەوە مانای ئەوە نییە ئێمە لەبەردەم ئەو مودێلانەداین، کە قاڵب یان ڕێسان و دەبێت شوێنپێیان هەڵبگیرێت یان جێبەجێبکرێن، چونکە ئەوە مەحاڵە، لەبەرئەوەی هەر مۆدێلێک بێوێنەیە، بەئەندازەی ئەوەی خەسڵەت و شوێن پەنجەی خاوەنەکەی پێوەیە. مۆدێلی سەرکەوتوو، هاندەر و بزوێنەرە، بەئەندازەی ئەوەی شایانی کار لەسەر کردنە، هەتاکو هەریەکێک مۆدێلی خۆی دروستبکات، ئەو مۆدێلەی دەبێتە مایەی ڕوانین و بایەخپێدان، یان بابەتی لێکۆڵینەوە و گۆڕانکاری. بەوپێیەی یەکێک بە خوڵقاندن لێهاتوویی و بێوێنەیی خۆی دەسەلمێنێ و بە گۆڕانکاری دەزانێت چۆن گۆڕانکارییەکان ئەنجامدەدرێن و بە تاوتوێکردن پەیوەندییەکانی یەکترناسین و ئاڵوگۆڕکردن و کارلێککردن گرێدەدات و بە ڕەهەندی گەردوونی بایەخدەدات بە پاراستنی سروشت و چاودێریکردنی بوونەوەرەکان. ئەوەش گرەوەکەیە.

## پەراوێز:

ئەم بابەتە لەو دیدارەدا پێشکەشکرا، کە لە ئایاری ٢٠٠٩دا لە قاهیرەو لەسەر داواکاریی ناوەندی عەرەب بۆ کولتوورو ڕاگەیاندن ڕێکخرا.

## فرەڕەنگکردن/ هەقداری/ هاوسەنگی(*)

قەیرانی جیهانیی ئاڵۆزبوو و فرەسەر، کە لە شوێنێک زیاتر و لەسەر ئاستێک زیاتر هەڵمەتدەبات و زەبر دەوەشێنێت و بەم دواییانە لەسەر ئاستی گەردوونی تەقیوەتەوە، ئەوە دەخاتەڕوو کە پێکگەیشتنی مرۆڤانەی تاکلایەنە، کە بە ئەقڵی فەدەمەنتالیستانە، لاهوتیانە، تاکڕەهەندانە، حەتمیانە، یان بەهەشتیانە بەڕێوەدەبرێت، شکستخواردن و تێکشکانی سەلماوە، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە پەرەپێدانی سامانەکان و بەکاربردنی توانستەکانەوە هەبێت، یان بە بەڕێوەبردنی دەوڵەتەکان و دەستاودەستکردنی دەسەڵاتەکانەوە، یاخود بە بەرگریکردن لە ماف و ئازادییەکانەوە.

لێرەوە و لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەرەسهێنانانەی تێپەڕێنەری دوانە خنکێنەر و حەتمییەتە توندوتیژەکانن کە جیهان دابەشدەکەن بۆ ڕەسەنایەتی و مۆدێرنیتە، یان ناوەند و پەراوێز، یان سەرمایەداری و سۆشیالیزم، یاخود ئیسلام و خۆرئاوا... بیرکردنەوە و کارکردن لە ڕوانگەیەکی ڕێژەیی، فرەیی، پێکهاتنخواز، داهێنەرانە، گۆڕانکاریخواز و دووڕەگ، چەند چارەسەرێکی نوێ و جیاواز پێویستن، ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە:

١. مۆدێلی بێگەرد لە پەرەپێداندا بوونی نییە، بەوپێیەی لە بنەڕەتدا شوناسی بێگەرد یان نەگۆڕ نە لە ڕابردوودا هەبووە و نە لەئێستادا هەیە، تەنیا لە مێشکی خاوەنەکانیدا نەبێت، چونکە مەسەلەکە پێکهێنان و فرەڕەگکردنە، بەئەندازەی ئەوەی جێهێشتن و تێپەڕاندنە، بەمەبەستی ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکاری، جا پۆزەتیڤانە بێت یان نێگەتیڤانە، پێشکەوتن بێت یان پاشکەوتن. ئەی مەسەلەکە چۆن دەبێت کاتێک مرۆڤایەتی ئیمڕۆ دەچێتە ناو سەردەمی پشت بەیەک بەستن و تێکهەڵکێشیی بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکانەوە، بەئەندازەی ئەوەی دەچێتە ناو دنیای ڕەگەزە هەمەجۆرەکان و کولتووره سنووربڕەکان و مۆدێرنیتە فرەڕەگەکانەوە. بەڵگەی ئەوەش مۆدێلە هاوچەرخ و بەجیهانیبووەکانە، لە (فۆکۆیاما) وە بیگرە بۆ (ئۆباما)، بە تێپەڕبوون بەلای (سارکۆزی)ی سەرۆکی فەڕەنسا و بەشێک لە وەزیرەکانیدا، چونکە

هەر هەموویان خاوەن شوناسی فرەڕەنگ و ئاوێتەن و سنووری زمان، ڕەگەز، ڕەنگ و ئایینەکان دەبڕن... ئەمەش ئەوەیە کە بەم دواییانە لە کاتی ئاهەنگەکانی کردنەوەی (ئوتێل ئەتڵەنتس) لە دوبەی و (مۆزەخانەی ئیسلامی) لە دەوحە ڕووی دا، کاتێک ئەستێرە جیهانییەکان کۆبوونەوەو هونەرەکان ئاوێتەبوون، یان زمانەکانی سەردەم و کولتووره جۆربەجۆرەکان تەماهیان لەگەڵ یەکتر کرد و کتێبە پیرۆزەکان لە تەنیشت یەکەرەکان بوون و ئایەتەکان بەرامبەر بە ئایکۆنەکان بوون. ئەمەش کاریگەریی فرەڕەگکردنە، کە پێچەوانەکەی هەڵبژاردەخوازی و داخران و ڕۆتینە: ئەوە جیهان لە چنگی دەمارگیریی نەتەوەیی و ئایینی ڕزگاردەکات، بەئەندازەی ئەوەی شێوازێکی پێگەیشتنی مرۆڤە، چونکە سەرچاوەی هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندبوونە.

۲. کارەکانی پەرەپێدان بەو گرێ و مەراقانە بەرێوەنابرێن، ئەوانەی کۆنترۆڵی ئەقڵی ئەوانەیان کردبوو کە بە وشەکانی هەڵمەتی داگیرکردنی کولتووری و تیخکردنی فیکری مامەڵەیان لەگەڵ ئاسۆکانی مۆدێرنیتە و کردنەوەکانی جیهانگیری و تەکنۆلۆژیا دەکرد، ئەمەش بەبیانوی بەرگریکردن لە شوناس و نەگۆڕ و نەریتەکان، بەرامبەر بە کولتووری خۆرئاوا کە بە کولتوورێکی نامۆ، یان دوژمن، یاخود وێرانکار دادەنێن... وەک ئەو هەوڵەی لای ئێمە هەیە بۆ هێرشکردنە سەر بەخۆرئاواییبوون و بەئەمریکاییبوون و جیهانگیری.

ئەو جۆرە وەسفکردن و وشانە برێک بەوەهمکردن و تۆقاندن و سادەکاریی لەخۆدەگرن. بۆیە ئاستەنگ بۆ کارەکانی پەرەپێدان دروستدەکەن، لەبری ئەوەی دەرگا و ڕێگاکان لەبەردەمیاندا واڵابکەن، ئەمە سەرباری ئەوەی شایەتی لەسەر پیادەکردنی ساختەکاریی بوونخوازیی خاوەنەکانیان دەدەن، چونکە زۆربەی ئەو ناونیشانانەی لە ڕێگەیانەوە وشەکانی بوونی خۆمان دەخوێنینەوە، یان بەهۆیانەوە بەرگریی لە بوونی خۆمان دەکەین، بەرهەمی فیکری خۆرئاوایین. وەک دیموکراسی و ئازادی و شوناس، وێڕای پەرەپێدان و کۆمەڵگەی زانیاری و ئابووریی مەعریفە. ئەمەش سەیرنییە، چونکە کولتووری دەوڵەمەند و خوڵقێنەر، بەهۆی زمانەکانی چەمک، دەستکەوتە مەعریفییەکان، ڕەهەندە جوانکارییەکان، سیستەمە بەهاخوازەکان و دۆزینەوە تەکنۆلۆژییەکانیەوە، کولتوورێکی سنووربڕ و ئەقڵبڕە، بەئەندازەی ئەوەی جیهانی و گەردوونییە.

۳. ئەوانەی شمشێری بەرگریکردن لە شوناسە ئەقڵییە گۆشەگیر و موحافەزەکارەکان بەرزدەکەنەوە، لەڕاستیدا بەرگریی لە خراپترین نەریتەکان و نەزۆکترینیان دەکەن، بەمەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ خراپەکاری و هەڵەی زیاتر. بۆیە ئەوانە پەرەپێدان

ناهێننەدی و واقعێک ناگۆڕن، بەڵکو تەنیا لە پاشەکشە و پێشێلکردنی ئەوەدا باشن کە بانگەشەی بۆ دەکەن.

٤. نموونەکان لەمبارەیەوە ڕوون و ئابڕوویەرن، چونکە هەڵوێستە نێگەتیڤ و دوژمنکارەکان بەرامبەر بە ڕاستی و گۆڕانە جیهانییەکان زاڵبوون، پرۆژەکانی پەرەپێدان شکستیانخواردوە، بەئەندازەی ئەوەی وزەی خوڵقاندن و داهێنان و گۆڕانکاری ئیفلیجبووە. ئەمە ئەوەیە کە زۆر عەرەب لە سەردەمی ڕێنسانسەوە پێوەی سەرقاڵبوون و هەتاکو ئێستاش پێوەی سەرقاڵن و بەهۆی نەرجسیبوونی کولتووریی زیادەڕۆیانەوە کەللەڕەقی و لوتبەرزی دەنوێنن. هەروەها ئەفغانی و ئێرانی و سۆماڵی و ئەندەنوسییەکانیشی سەرقاڵکردوە... سەرەنجامەکەش گۆڕانی پەیوەندییە لەگەڵ ئەگۆڕەکان بۆ ئاستەنگ و تەنگژە. تەنانەت لە فەڕەنسا، کاتێک بە لۆژیکی بەرگری دژی هەڵمەتی داگیرکردن و جیهانگیری و ئەمریکاییبوون ڕووبەڕووی گۆڕانکارییە ژیوارییەکان بوونەوە، چەندین ساڵ کەوتنە دوای کاروانی ئەورووپییەوە.

بەپێچەوانــەوە، ئەزموونــە سەرکەوتووەکانــی بــواری پەرەپێدان ئەوانەن، کــە خاوەنەکانیان باســی هەڵمەتی داگیرکاریی کولتووری یان سروشتی وێرانکاریی جیهانگیری کولتووری و ئابووری ناکەن، بەڵکو بازدانە ژیوارییەکان و وەرچەرخانە مێژووییەکان وەک دەرفەت و تەحەدداکان یان هەقدارییەکان دەخوێننەوە، هەتاکو بە زمانی شیان و خوڵقاندن و گۆڕانکاری مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، وەک ئەوەی لە یابان و مالیزیا، ئینجا لە چین و هەندێک دەوڵەتی کەنداو و بەم دواییانەش لە تورکیا ڕوویداوە.

ئەمە باری خاوەن شوناسی دەوڵەمەندە، کە بەچاکی دەزانێت لەبەر ڕۆشنایی پێشهاتە نوێکان و گۆڕانکارییەکاندا چی بکات، بۆ ئەوەی لە ڕوویەکی دیاریکراوەوە بەشداری لە ۆرکشۆپی ژیواری و دەوڵەمەندکردنی سەرمایەی مرۆییدا بکات. باشترین بەرگریکردن لە شوناسی کولتووری و کۆمەڵگەیی، پیادەکردنی تایبەتمەندیی خوڵقێنەرانە و بێوێنەیە لەلایەن مرۆڤەوە، بەجۆرێک کە دەرفەتی بەشداریکردنی لە دروستکردنی جیهان و سەرکردایەتیکردنی چارەنووسەکاندا بۆ برەخسێت.

٥. ئەگەرچی لەوبڕوایەدام، کە پێگەیشتن خاوەن سروشتێکی لیبرالیی سەرمایەدارانەیە، چونکە پشتبەستووە بە کرانەوەی ئاسۆکان و سنوورەکان و بازاڕەکان لەبەردەم ئازادیی دەستپێشکەری و بزاوی کارکردن و داهێناندا، بەڵام ناڵێم تەنیا یەک ڕێگە بۆ پەرەپێدان هەیە، کە قوتابخانەیەک یان ڕێبازێک قۆرخیدەکات. ئەوانەی بە لۆژیکی تاکڕەهەندانەو لە ڕێگەی دوانەی خراپەکاریی ڕووت و ئەوپەڕی چاکەکارییەوە مامەڵەیان لەگەڵ مەسەلەکان کردوە، بیرۆکەکانیان دژیان هەڵگەڕاونەتەوە، بەئەندازەی ئەوەی

لەگەڵ دژەکانیان پێکهاتوون. باشترە لەبەر ڕۆشنایی تێکشکانەکاندا کار بە فیکرێکی ئاوێتە بکرێت، کە خراپەکانی هەر ڕێبازێک بەدووردەگرێت، بۆ ئەوەی باشەکان و دەستکەوتەکان بپارێزێت، جا ئەوە پەیوەندیی بە سەرمایەداری و لیبرالیزم و جیهانگیرییەوە هەبێت، یان دەستوەردان و چاودێری و پاراستنەوە... چونکە هەمویان ئەو ڕێباز و ڕێسا و ڕێکارانەن، کە قورسایی خۆیان هەیە لە دۆزینەوەی چارەسەرەکان و پێکهێنانی فۆرمەکاندا.

٦. تاقە مۆدێلێک لەناو قوتابخانەیەکدا لەئارادانییە، بەڵکو مۆدێلەکان بەپێی فرەیی ڕەوتی مێژوویی و ژینگە جوگرافیەکان و شوناسە کولتووری و کۆمەڵگەییەکان هەمەجۆرن. بەوپێیەی مۆدێلی ئەمریکی وەک مۆدێلی فەڕەنسی نییە، فەڕەنسیش وەک ئەڵمانی نییە، ئەڵمانیش وەک یابانی و مالیزی نییە... بەوجۆرە هەر وڵاتەوە لەکۆتاییدا مۆدێلی خۆی دەدۆزێتەوە و سواری ملی هاوکێشەکەی خۆی دەبێت، بۆیە پێگەیشتن بە ئەقڵییەتی کۆپیکردن و لاساییکردنەوە ڕوونادات، بەڵکو بە زمانی خوڵقاندن و داهێنان دێتەدی...

٧. ئەو مۆدێلانە سەرکەوتوونان، کە لە دەرەوەڕا خۆ لە کۆمەڵگەکان هەڵدەقورتێنن، یان بە ئەقڵییەتی دەستەبژێرانەی ناوەندیخوازی لەسەرەوە کۆنترۆڵکراو دەسەپێنرێن، چونکە ئیمرۆ دەستەبژێریی نەرجسیانە پەرەپێدان دروست ناکات، بەڵکو گۆڕاوە بۆ جۆرێک لە بەربەرییەتی کۆمەڵگەیی، وەک ئەوەی ئەو نازناوە خواوەندانە دەیانخەنەڕوو کە ڕووناکبیران دەیانبەخشنە سمبول و ناودارەکانیان. مۆدێلی لێهاتوو و سەرکەوتوو، جا سەرچاوەکەی لەهەر شوێنێکەوە هاتبێ، ئەوەیە کە بکەر و بەرهەمهێنەکانی، هەریەکەو لە کایەی کارەکەیدا، بەشداریدەکەن لە گۆڕین و بنیاتنانەوە، یان دەوڵەمەندکردن و گۆڕینیدا. بۆیە کاری پەرەپێدان پرۆسەیەکی ئاوێتە و بەردەوامی بزاوتی بێشومارە، کە لەسەر گشت ئاستەکان ڕوودەدات و بکەرەکان لە بازنە و کەرت و کایە جۆربەجۆرەکانی خۆیاندا بەشداریی تێدا دەکەن، بەجۆرێک کە لەگەڵیدا کۆمەڵگە بگۆڕێت بۆ ۆرکشۆپێکی بیرکردنەوەی بەپیت و کارکردنی بنیاتنەرانە. ئەوەش بەپێی ستراتیژێک، کە سەرتاپای فەزای کۆمەڵایەتی، بە ئاسۆیی و شاقوڵی، تیخبکات و هاتوچۆ بەناویدا بکات و بە چەند شێواز و ڕێگا و میکانیزمێک کە بەردەوام جیاواز و هەمەڕەنگن و بەردەوامیش نوێدەبنەوە، هەتاکو بەشدارییکەن لە نوێکردنەوەی چەمک و تیۆرەکاندا، یان لە گەشەپێدانی میتۆدو مۆدێلەکاندا.

٨. پێوانەی نەگۆڕ یان چارەسەری حەتمی و کۆتایی بوونی نییە، هەر مۆدێلێک ئەزموونێکی زیندوو پێکدێنێت، کە لەژێر لێکۆڵینەوە و بنیاتنان و تەواوکاریدا

دەبێت، بەمەبەستی ڕاستکردنەوە و چاککردن. بۆیە چارەسەرکردنی بەهەشتیانە، یان چارەسەرکردنی ڕۆژگارە زێڕینەکان بەسەرچووە، کە لەسەر دەستی ڕێبەرێک (پێغەمبەرێکی مژدەبەخش یان فەیلەسووفێکی تیۆریست) زەوی پڕ لە دادپەروەری و ئاشتی دەبێت. باشترە بە وشەکانی ڕێژەییبوون و نێوانکاری بیربکەینەوەو بە لۆژیکی خوڵقاندنو گۆڕانکاری کاربکەین. بۆیە چاوەڕوانی موعجیزە لەسەر دەستی ئەوانە ناکەین، کە ناوی تاقە سەرۆک و سەرکردەی ئیلهامبەخش و پاڵەوانی فریادڕەسیان لێ دەنێین، مەبەست ئەوانەیە کە کلیلەکانی چارەسەرە تەلیسماوییەکانی گشت کێشەکانیان بەدەستەوەیە. چونکە ئاکامەکەی پێشێلکردنی دروشمەکان و دوورینەوەی تێکشکانەکانە لەسەر زەمینەی واقیع. باشترە هەر تاکێک بەرپرسیارێتی خۆی بگرێتە ئەستۆ، هەروەها سەربەخۆیی و زیندوێتیی فیکریی هەبێت، بەجۆرێک کە وەک تاکێکی شارەزاو بەرهەمهێن ڕەفتاربکات، بەئەندازەی ئەوەی بکەر و بەشداردەبێت لەگەڵ ئەوانیتر، بۆ دروستکردنی خۆی و بنیاتنانی کۆمەڵگەکەی و ئاڕاستەکردنی چارەنووسەکەی.

٩. کارەکانی پەرەپێدان لەسەر یەک ئاست: ئابووری یان دارایی، ڕوونادات. چونکە پێگەیشتنی تاکلایەنە بچووککردنەوەی کەسێتی و هەژاریی مانایە، بەڵکو پەردەپۆشکردنی بوونە لەژێر ویستی بەدەستەوەگرتن و کۆنترۆڵکردن و خاوەندارێتیدا. مرۆڤ حسابێکی بانقیی ڕووت نییە، کە مەبەستی کەڵەکەکردنی سامانەکان بێت، بەڵکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە چەندین هەست و مەیل و ئارەزوو و پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا هەیە، کە ناچارە ژیان لەگەڵیاندا بەسەربەرێت. هەروەها کۆکردنەوەی پارە ئەوپەڕی ئامانج نییە، بەڵکو ئامانج ئەوەیە مرۆڤ ژیانێکی ئاسوودە، یان شایستە، یاخود سەلامەتخوازانە بەسەربەرێت. بۆیە پێگەیشتن فرەڕەهەندە، بەئەندازەی ئەوەی لەسەر بنچینەی هاوسەنگیی نێوان هێز و مەیل و ڕەوتەکان دادەمەزرێت. هەروەها پەیوەندییە بە سامان یان دەسەڵاتەوە، وەک چۆن پەیوەندییە بە بەها و ئازادی و شکۆوە. ئەوەی ئیمڕۆ دەچێتە ناو کارەکانی پەرەپێدانەوە، کەسێکە کۆششدەکات بۆ بەدەستهێنانی بژێوی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و ئاڕاستەکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانیتر، بەئەقڵییەتی دانپیانان و فرەڕەگکردن و هاوکاریکردن، ئەمە سەرباری بەهاکانی پسپۆڕی و لێهاتوویی و هەقداری.

١٠. هیچ چارەسەرێکی پەرەپێدانخواز نییە لەسەر حسابی سروشت و ژیان بێت. ئەمە لە ڕوویەکەوە یەکەمین ئەولەویەتی هەیە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو مەترسیانەی هەڕەشە لە پیسبوونی ژینگە و لەناوچوونی بوونەوەرە زیندووەکان دەکەن. لێرەوە پەرەپێدان پێویستی

بە دامەزراندنی لقێکی مەعریفیی نوێ هەیە، کە هەندێک ناویدەنێن (ژینگەزانی)ی کولتووری یان سیاسی، کە ئامانجی دەوڵەمەندکردنی ژیاریو هاوسەنگییە سروشتییەکانە. بەهەرحاڵ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەیوەندیی نێوان قەیرانی سروشت و قەیرانی ئابووری و ئامرازەکانی چارەسەرکردنیان زیاتردەبێت، وەک ئەوەی لێکۆڵینەوە و کۆڕەکان دەیخەنەڕوو، دواترینیان کۆنگرەی ئیسلامیی سێیەمی وەزیرەکانی ژینگە بوو، کە لە ربات (تشرینی دووەمی ٢٠٠٨) بەسترا. لێرەوە پێگەیشتنی مرۆیی ئیمڕۆ پێویستی بە تێکشکاندنی لۆژیکی بەخواکردن هەیە، کە بەهۆیەوە مرۆڤ وەک موڵکدار یان سەردار و خاوەنی سروشت ڕەفتاردەکات و چۆن بیەوێت و بەبێ هیچ حسابکردنێک ڕەفتار لەگەڵ موڵکەکەی خۆی دەکات. باشتر و سەلامەتتر و بەردەوامترە هەریەکێکمان وەک ئەو تەگبیرکارە بیریکاتەوەو کاریکات کە دەرەقەتی هەمووشتێک دێت و دان بەوەدا دەنێت، هەر بوونەوەرێک ماف و بەشی خۆی هەیە و وەک چاودێر و پاسەوان و دەستپاک ڕەفتار لەگەڵ خۆی و مرۆڤەکانی تر دەکات، هەروەها لەگەڵ سروشت و زەوی و بوونەوەرەکانی تر.

١١. هەر پێگەیشتنێک ڕەهەندی جیهانی و سروشتی گەردوونیی خۆی هەیە، چیتر هیچ یەکێکمان ناتوانێت بەتەنیا قەیرانە وێرانکارەکان چارەسەربکات، بەڵکو لە ڕێگەی گفتوگۆ و ڕاوێژکردن و هاوکارییەوە ئەوە دەکرێت، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە قەیرانەکانی دارایی، یان ئاسایش، یاخود پەرەپێدانەوە هەبێت. لێرەوە ئێستا دروشمەکە لای ئەورووپییەکان بریتییە لە: قوتاربوون پێکەوە یان خنکان لەگەڵ یەکتردا. ئەگەر بشمانەوێت ئایەتی قورئان بەکاربهێنین، ئەوا دەتوانین بڵێین: ئەوەی لە شوێنێک سوودبەخش بێت، سوودی بۆ هەموان دەبێت. بەپێچەوانەشەوە، ئەوەی لە شوێنێک زیانبەخش بێت، زیانی بۆ خەڵک و ژیان و زەویش دەبێت.

١٢. هیچ پەرەپێدانێک لەسەر هەر ئاستێک: ئابووری، یان سیاسی، یاخود ژیواری بە توندوتیژی و بەهێزی سەربازی نایەتەدی، بەڵکو بە ئەقڵێکی ئاشتیخوازانە، شارستانیانە، تاوتوێکار و ئاڵوگۆڕخواز ئەنجامدەدرێت. واتە وەک ئیمڕۆ دەوترێت، بەهێزێکی هێمن و نەرم. لێرەوە پەرەپێدان پێویستی بەوەیە پرۆژەکان و بەرنامەکانی بە ئەقڵییەتی هاوکاری و شەریکایەتی بەڕێوەببرێن، نەک بە ئەقڵییەتی تاکخوازی و خۆپەرستی، یان هەژموون و قۆرخکردن. ئەمەش مانای تێکشکاندنی لۆژیکی تاک جەمسەرییە، کە کۆنترۆڵی جیهان دەکات و کاروبارەکانی بەڕێوەدەبات.

**پوختەی قسە:** پاش ئەو هەموو هەرەسهێنان و کارەساتانە، دروستکردنی ژیان، یان بەڕێوەبردنی جیهان، یاخود سەرکردایەتیکردنی چارەنووسەکان بە ئەقڵییەتی فەندەمەنتالیستانە یان ئیمپراتۆرییانە، ستەمکارانە یان سەرتاپاگیرانە، جیهادکارانە یان

ئینجیلخوازانە، تەلمودییانە یان کەربەلاییانە، لاهوتیانە یان ناسوتیانە ئەنجام نادرێت.

بۆیە سەدەی بیست و یەکەم، سەدەی ئایینی نابێت، وەک ڕووناکبیرانی گەورە و خاوەن ئەقڵی تاکڕەهەندی ئایدیۆلۆژیانە پێشبینیدەکەن، یان ئەو بانگەشەکرانە خەونی پێوە دەبینن کە وێرانکاری و گەندەڵی لە سەرتاپای جیهاندا دەچێنن. ئەم سەدەیە زیاتر فرەشێواز و مۆدێل یان فرە ڕێباز و سەرچاوە دەبێت، مەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە یان ترسناک بگەڕێتەوە، وەک چۆن ئێستا ئایین لە ڕێگەی چەند فەتوایەکی دەگەڕێتەوە، کە بانگەشەکارە نوێکان و فەندەمەنتالیستە جیهادکارەکان دەریاندەکەن، ئەمەش باری هەر فەنەدەمەنتالیزمێکە، جا ناو و دروشمەکانی هەرچییەک بێت.

لەکۆتاییدا، خێزانی نێودەوڵەتی، بەگشت کۆمەڵە زمانەوانی، ڕەگەزی، تایەفەگەری و هەرێمەیەتیەکانییەوە، ئێستا خۆی لەبەردەمی دووریانێکی گەورە و تەحەددایەکی مەترسیداردا دەبینێتەوە، کاتێک ڕووبەڕووی کارەسات و بەربەرییەت و پووچگەرایی دەبێتەوە، وەک ئەوەی لە پیسبوونی ژینگە، تیرۆر، هەژاری و پارچەپارچەبوونی کۆمەڵگەکان و پشێویی بەهاکاندا بەرجەستەدەبێت. ئێمە هەمووومان لەبەردەم چەند داخوازییەکی زۆربۆهێنداین، کە بەرگەی دواخستن ناگرن، بەڵکو هەڵدەکشێن بۆ پلەی فەرمانی بڕیارلێدراو، لەپێناو هێنانەدیی ئاسایش بە هەر سێ کۆڵەکەی ژینگە و خۆراک و کۆمەڵگەوە. ئەمەش هەموان دەخاتە بەردەم بەرپرسیارێتییەکی گەورەوە بۆ لەکۆڵگرتنی ئەو «ئەمانەتەی» مرۆڤ لە هەڵگرتنی هەڵدێت، بەجۆرێک کە کار بۆ گۆڕینی خۆی بکات، بەشێوەیەک کە پەی بە ئاراستەی بوونخوازی، شێوازی کولتووری، چالاکیی ژیواری و کاری سیاسی بەرێت. هەروەها پەی بە سیستەمەکانی دەستاودەستکردنی دەسەڵات و دابەشکردنی سامان و مسۆگەرکردنی کار بەرێت، بەئەندازەی ئەوەی پەی بە شێوەکان و ئامرازەکان و شێوازەکانی کارکردن، بەرهەمهێنان، داهێنان، پێکگەیشتن، گواستنەوە و وەبەرهێنان دەبات، هەتاکو خۆماکی زۆربوون و بەکاربردن، یان ویستی جڵەوکردن و دەسەڵاتخوازی بەرەو لەناوچوون وماڵوێرانیمان نەبەن...

## پەراوێز:

ئەمە بابەتەکەم بوو لەو کۆنگرەیەدا پێشکەشم کرد، کە دامەزراوەی فیکری عەرەبی لە ماوەی نێوان ١٣-١٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٨دا لە ژێر ناونیشانی «کولتووری پەرەپێدان»دا ڕێکیخست.

## هەتاکو ئیماندار هاوڵاتی نەسڕێتەوە

جیهان، زیاتر لە هەر ڕۆژێکی ڕابردوو، وێڕای ئەو هەموو سەردەمەی فێرکردنی ئەخلاقی و ڕێنماییکردنی ئایینی و ڕۆشنگەریی و لەوانەشە بەهۆی ئەوانەوە، نێچیری دڵەڕاوکێ و شڵەژانە، بەئەندازەی ئەوەی شانۆی ململانێ و جەنگەکانە. ئەمەش مانای فشۆڵیی بیرۆکەکان یان شکستخواردنیانە لە بواری دەستنیشانکردنی واقیع، یان دروستکردنی ڕووداوەکان، یاخود کاریگەرییان لەسەر پێشهاتەکان.

ڕووداوەکان لەمبارەیەوە ئابڕووبەر و ئاشکران، لە پێکدادانی کولتوورەکانەوە بۆ شەڕەکانی ناوخۆ، لە تەقینەوەکانی مزگەوت و کڵێساکانی جیهانی عەرەبەوە بۆ مشتومڕەکان دەربارەی حیجاب و مزگەوتەکان لە ئەورووپا، هەتاکو بە جەنگەکانی دەقەکان و ناوەکان کۆتاییدێن، ئەوەش پاش ئەوەی ئیمانی ئایینی گۆڕاوە بۆ پشێویی دەماری و تیرۆر، بەڵکو شێتی.

ئەم واقیعە دەمانگێڕێتەوە بۆ هەمان ئیشکالییەت، کە ئێستا لەڕیزی پێشەوەیە و بۆتە مایەی بەفیڕۆدانی کۆشش و وزەی زیاتر، هەتاکو چەند قەیرانێکی زیاتر بچنینەوە. مەبەستم ئیشکالییەتی ئایین و مۆدێرنیتە، یان ئایین و ئازادی، ئایین و دەوڵەتە، ڕاستریشە بڵێین ئیشکالییەتی ئایین و ژیانی هاوبەشە. مەبەست لە ئایین لێرەدا ئیسلام و پەیوەندییەتی لەگەڵ هاوڵاتیبووندا. ئەمەش توخنکەوتنێکی ئەو مەسەلەیەیە بەبێ هیچ دەستپێکێک.

### ڕەچەڵەکی زاراوەکە:

زاراوەی «هاوڵاتی» بە زمانێکی چەمکناسا داهێنانێکی گریکییە و لەدایکبوونی فەزای گشتییە و بواری سیاسی لە شار/ دەوڵەت لای یۆنانییە کۆنەکان بەرجەستەدەکات. لێرەوە وشەی «هاوڵاتی» لە وشەی «نیشتمان»ەوە وەرنەگیراوە، وەک ئەوەی لە عەرەبییەکەدا هاتووە، بەڵکو لە وشەی شار (Polis) بە یۆنانی، یان (Cite) بە فەڕەنسی وەرگیراوە و هێمایە بۆ ماناکانی وەک ئازادی، ماف، شار، دەوڵەت، ژیوار...

چەمکەکە لـە یۆنانەوە گوێزراوەتـەوە بـۆ خۆرئاوای نـوێ و وڵاتەکانی تری جیهان، بەوڵاتە عەرەبییەکانیشەوە. ئەوەش شـان بەشـانی زاراوەکانی تری وەک کۆمار، دیموکراسی، فەلسەفە، لۆژیک، عەلمانیەت و ئەو چەمک و بوارانەی تر، کە بەشداریانکردوە لە پێکهێنانی فەزای ئەقڵی لە ژیواری گریکیدا و سەرمایەیەکی فیکریی موڵکی مرۆڤایەتین بەگشتی و لە زیاتر لە بوارێکی ژیان و کۆمەڵگەدا- بەتایبەتی لە بواری سیاسیدا- وەردەگیررێت و وەبەردەهێنرێت. بێگومان چەمکی هاوڵاتیبوون لە کۆمەڵگە نوێکاندا، لەچاو ئەوەی ڕۆژگاری گریکەکاندا، فراوانتربووە. چونکە ئەوکاتە تەنیا شاری دەگرتەوە، بەڵکو توێژێکی شار شایستەی نازناوی هاوڵاتی بوو، کەچی لە کۆمەڵگە نوێکاندا کۆمەڵگـە بـە گشـت توێژ و چینەکانیەوە دەگرێتـەوە. ئەمە سەرباری گەشەکردنی دیموکراسی بەشێوازە جۆربەجۆرەکانیەوە و بەپێی ڕەهەندی زاڵ تیایاندا: کۆماری، دەستووری، لیبرالی، یان بەشداریخواز... یەکێک لە پارادۆکسەکان لەمبارەیەوە ئەوەیە، کە یۆنانییەکان مرۆڤیان وەک بوونەوەرێکی قسەکەری عاقڵ پێناسەکردوە و جیاوازییانکردوە لەنێوان یۆنانی و بەربەری، یان هاوڵاتیی ئازاد و ئەوەی مافی هاوڵاتیبوونی نییە.

## جوگرافیای چەمکەکە:

هیچ چەمکێک بەخودی خۆی، وەک شوناسێکی ڕوون یان ماهییەتێکی نەگۆڕی باڵاوەو، دانامەزرێت، بەڵکو چەمک کایەیەکی واتـادارە و خاوەن پێکهاتـەی خۆی و تۆڕی پەیوەندییەکانێتی لەگەڵ ئەوانیتردا. ئەمەش باری چەمکی هاوڵاتیبوونە، بە توخم و خەسڵەتەکان و سەرجەم پەیوەندییەکانیەوە لەگەڵ چەمکەکانی تردا. چەمکی هاوڵاتیبوون فرەڕەهەند و خاوەن بونیادێکی ئاوێتەیە، ئەوەش لە چەند ڕوویەکەوە:

- هاوڵاتیبوون بەبێ فەزایەکی گشـتی نابێت، کـە زمانی کۆکـەرەوە و مەسەلەی هاوبەشی ناو هـەر یەکەیەکی کۆمەڵگەیی پێکدێنێت. ئەمەش ئەوەیە کـە مانای بنەڕەتیی پیت بەپیتی وشەی کۆماری یۆنانی (شتی هاوبەش) هێمای بۆ دەکات. لێرەوە هاوڵاتی کوڕی کۆمارە، کە ڕوویەرێکی هاوبەش و بەرژەوەندییەکی گشتی، یان ڕەوایەتییەکی گشتییە. ڕاستە هاوڵاتیی وەها هـەن، کـە لەسایەی سیستەمە پاشایەتیەکاندا دەژین، بۆ نموونە لە ئینگلستان، بەڵام پاشایەتی لێرەدا ڕواڵەتکارانەیە، واتە تەنیا ڕوویەکی تەقلیدییە بۆ سیستەمی دیموکراتی و کۆمەڵگەی مەدەنی.
- هاوڵاتیبوون لەگەڵ عەلمانیەتی زمـان و تێڕوانینـدا پێکهاتـوە. واتـە هاوڵاتی ئەو کەسەیە لە کۆمەڵگەی دنیاییدا دەژی، کە ڕەوایەتیی خۆی لە مەرجەعیەتێکی

دەرەکیی باڵاوە: لاهوتی یان غەیبی، بەدەست ناهێنن، بەڵکو خۆی بەرپرسیارێتیی بەرامبەر بەخۆی دەگرێتە ئەستۆ و خۆی دروستدەکات و کاروبارەکانی خۆی ڕێکدەخات، ئەوەش بەپێی ئەوەی یاسادانان و یاساکان، یان بەهاکان و پێوانەکان دایاندەڕێژن.

ئەمەش مانای پیواری (غیابی) ئایین ناگەیەنێت، کە لە کۆمەڵگەی گریکیدا هەبووە و لە گشت کۆمەڵگە کۆن و نوێکاندا هەبووە و کاریگەربووە، بەڵام گرنگ ڕێگەکەی و چۆنییەتی کارکردن یان کەوتنەگەڕێتی. ئاشکرایە سوکرات لە شار/ دەوڵەتدا بە تۆمەتی «نکۆڵیکردن لەخوا» سزای لەسێدارەدان درا بەسەریدا. ئەمەش نموونەیەکی مێژووییە، شایەتی لەسەر ئەوە دەدات کە ئایین، وەک دەسەڵاتێکی سمبولی، دژی ئازادیی دەربڕینی هاوڵاتی بەکارهێنراوە. زۆر ئایین بەم ڕووە نێگەتیڤ یان ستەمکارییە بەکارهێنراوە.

– ڕووەکەی تری عەلمانیەتی تێڕوانین، بەئەقڵانیکردنی گوتارە. واتە هاوڵاتی ئەو کەسەیە کە بەڵگە و بیروڕا زاڵدەکات بەسەر بڕوای داخراو و ئیمانی کوێرانەدا. دەشێت هاوڵاتی بڕوای بە پرنسیپێک یان بڕوایەک هەبێت، بەڵام لە فەزای گشتیدا پەنا بۆ دیالۆگی ئاشکرا و تاوتوێکردنی ئەقڵانی دەبات، بەبێ دەستبەسەراگرتنی لاهوتیانە یان مەرجەعیەتە پیرۆزەکان، جا لەژێر هەر دروشمێکدا بێت. لێرەوە ئەقڵ، نەک فەرمان یان ئایین، سەرەتایە لای هاوڵاتی.

– هاوڵاتی ئەو کەسەیە کە بڕێک سەربەخۆیی خۆیی و ئازادیی هەڵبژاردنی بەدەستەوەیە. واتە ئەو لە هەڵبژاردن و گفتوگۆدا، یان بڕیارسازی و سیاسەتی دەوڵەتدا بەشداریدەکات. ئەوەش لە ڕێگەی سیستەمی دیموکراتییەوە، کە دەرفەتی هەڵبژاردنی حوکمڕانەکانی بۆ دەڕەخسێنێت. لێرەوە لەدایکبوونی هاوڵاتیبوونی دیموکراتی هاوشانی گەشانەوەی هونەرەکانی ئاخاوتن و تەکنیکەکانی دیالۆگ و بەڵگەهێنانەوە بووە.

– ڕووەکەی تری حوکمڕانیی دیموکراتی، سەروەریی یاسایە، چونکە هاوڵاتیان هاوشێوەن، بەئەندازەی ئەوەی لەبەردەم یاسا بەکارەکاندا یەکسانن. ئەمەش مانای ئەوەیە، هاوڵاتی ئەو کەسەیە پەیوەندیی ئاسۆیی لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیدا دەبەستێت کە جیاوازە لەگەڵ ئەو پەیوەندییە شاقوڵیانەی باوک بە کوڕەکەیەوە، یان پیاوی ئایینی بە دەستوپێوەندەکەیەوە، یاخود پاشا بە ڕەوەکەیەوە دەبەستێتەوە. بێگومان ئەو گوێدێری سەرۆکەکانیەتی، بەڵام بەشێوەی بڕواهێنان و ملکەچبوون بۆ سیستەم، نەک لەسەر بنچینەی وەلا بۆ کەسەکان.

بەو جۆرە هاوڵاتیبوون پشت بە دیموکراسی و دەسەڵاتی یاسا دەبەستێت،

بەئەندازەی ئەوەی پێویستی بـە یەکسـانیی لیبرالیستانە هەیە. لێرەوە لەگەڵ بیرۆکەی هاوڵاتیبووندا شێوازەکانی تری پەیوەندی، کە پشت بە وەلا بۆ شێوازە جۆربەجۆرەکانی خێزانی، یان تایەفەگەری، یاخود حیزبی دەبەستن، تێکدەشکێن. بەم مانایە هاوڵاتیبوون لەگەڵ پێغەمبەرایەتی نایەتەوە، کە مانای ئەوەیە پێغەمبەر لە خەڵک بۆ خۆیان لەپێشترە. چونکە هاوڵاتی ئەو کەسەیە، کە کەسێکی مردوو یان زیندو و نایکاتە کۆیلە، بەڵکو خۆی بەرپرسیارە بەرامبەر بە خۆی، بەئەندازەی سەرقاڵبوونی بە دروستکردنی خۆی و بەشداریکردن لە بەڕێوەبردنی چارەنووسی خۆیدا. بۆیە ئەوەی زیاتر لەگەڵ ماناکانی تاک، ئازادی، هاوڵاتیبوون، فەزای گشتی، جەماوەر، حەشامات و ڕەوە ناکۆکە، پێکهاتە فاشییەکان یان دەمارگیرییە ڕەگەزپەرستەکانە.

– لەکۆتاییدا هاوڵاتی ئەو کەسەیە کە شوناسێکی تێپەڕینی هۆز، تایەفە، کۆمپانیا، یان گرتبوونەوە ئەهلی و تەقلیدییەکان یان تایبەتی و ئابوورییەکان پیادەدەکات. ئەمەش مانای کۆمەڵگەی مەدەنییـە، کـە تیایدا تاکەکان ئینتیمایان بۆ شار، یان دەوڵەت، یاخود نەتەوە هەیە و دەشێت هاوڵاتی سنووری چوارچێوە ناوچەیی یان نیشتمانییەکان ببڕێت، بۆ ئەوەی ئینتیمای جیهانیی خۆی پیادەبکات. لێرەوە زاراوەی کۆسمۆپۆلیتی لەدایکدەبێت، کە ئەویش داهێنانێکی گریکییە و لە دوو وشە پێکهاتووەKosmos کە مانای جیهانە و Polis کە مانای شارە. بەم مانایە هاوڵاتیی جیهانی ئەو کەسەیە، کە شوناسێکی دەوڵەتبڕ و نیشتمانبڕ پیادەدەکات، بەڵام جیهانیبوون لێرەدا کۆکردنەوە نییە لەسەر بنچینەی برایەتیی ئایینی، یان چینایەتیی پرۆلیتاریانە، وەک ئەوەی لای مارکسییەکان بەدیدەکرێت، بەڵکو جیهانیبوونێکی کراوەیە، مرۆڤ لەگەڵیدا هەست بە یەکگرتوویی ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەکات.

ئەگەرچی زاراوەی کۆسمۆپۆلیتی لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا گێڕدرایەوە، ئینجا لە سەردەمی ململانێ ناسیونالیست و جەنگە جیهانییەکاندا پاشەکشەیکرد، بەڵام ئیمڕۆ دەگەڕێتەوە ڕیزی پێشـەوە، بەتایبەتی کـە ئێمە لە سـەردەمی زانیاریی دیجیتاڵی و مۆدێرنیتەی هرۆژمهێن و پشت بەیەک بەستندا دەژین و بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان لە گۆڕەپانی گەردوونیدا تێکهەڵکێشن. بۆیە باشترە بەجۆرێکی جیهانیانە بیربکەینەوە. ئەمەش ئەوەیە کـە ئێستا ڕوودەدات، وەک کار و چالاکییە جیهانییە تەرخانکراوەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری گەردوونی دەیخەنەڕوو، جا ئەوە تایبەت بێت بە دامودەزگای نەتەوە یەکگرتووەکان، یان کۆنگرە جیهانییەکان، وەک کۆنگرەی کۆپنهاگن کە بەم دواییانە بەسترا بۆ ڕوانینە مەسەلەی ژینگە (پاییزی ٢٠٠٩).

ئەمەش مانای ئەوە نییە هاوڵاتی لە ڕەگەز، شوناس، کەسەکار، یان کولتوور دادەماڵرێت، چونکە کۆمەڵگە تۆڕی کاریگەرییە دوولایەنەکانە، جا لەنێوان تاک و تاکدا بێت، یان تاک و کۆمەڵگە، یاخود گرووپەکان. تەنانەت تاکی بکەر، کە ئامادەیی و ئاسەواری لە کۆمەڵگەکەیدا پیادەدەکات، دەچێتە ناو ژینگەیەکی کۆمەڵگەییەوە، کە کولتوور و بەها و چوارچێوە و کۆڵەکەکانی خۆی هەیە. واتە بەئەندازەی کاریگەریخستنەوە، دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە و بەئەندازەی گۆڕینی کۆمەڵگەکەی، خۆیشی دەگۆڕێت. بۆیە هیچ تاکێک نییە بەدەربێت لە ئینتیمای ئەهلی و تەنیا ئینتیمای بۆ دەوڵەت و یاساکانی یان کۆمەڵگەی مەدەنی و دامەزراوەکانی هەبێت. ئەوانەی توشی ئەو خەیاڵپلاوییە بوون، خراپترین گرتبوونەوە و دەستەگەریی ئەهلی بوون. بەهەرحاڵ، هاوڵاتیی کاریگەر لە قۆزاخەی تاقە ئینتیمای خۆیدا ناژی، بەڵکو شوناسێکی کراوەی فرە ئینتیما پیادەدەکات: خێزان، ئایین، نەتەوە، پیشە، سەندیکا، کۆڕ، دامودەزگا هەرێمایەتی یان نێودەوڵەتیەکان.

### وەرگێڕانە عەرەبییەکە:

بنچینەیەک بۆ چەمکی هاوڵاتی لە کولتووری سیاسیی کۆنی عەرەبیدا نییە، بۆیە زاراوەکە وەک زاراوەکانی کۆمار، یان دیموکراسی، یاخود کۆمەڵگەی مەدەنی لەگەڵ شەپۆلەکانی نوێکردنەوەدا هاتە ناو جیهانی عەرەبەوە.

ئەوەی لە بەرامبەر «هاوڵاتی» باوبووە، زاراوەکانی «ئیمانـدار» یان «بـرا» بووە، کە هێماکردنە بۆ ئینتیما بۆ ئایینێک، یان هۆزێک، یاخود نەتەوەیەک. ئەمەش لە دەستەواژەکانی وەک «میری موسڵمانەکان» یان «ئەی برای عەرەب»دا دەردەکەوێت. هێشتا ئەو زاراوانە باون، بە بەڵگەی ئەوەی هەندێک سەرۆک کۆمار لە جیهانی عەرەبیدا، کاتێک خوتبە بۆ جەماوەر یان حەشامات دەدەن، دەستەواژەی: خـوشک و برایـان بەکاردێنن و دەشـێت وشـەی هاوڵاتیشی بخەنـە سەر، وەک دەستەواژەی: خوشک و برایانی هاوڵاتی.

تەنانەت وشەی «شار» لە عەرەبیدا هەمان واتای ئەوەی زمانە خۆرئاواییەکانی نییە، کە هێماکردنە بۆ ئەو خەڵکانەی ئازادبوون و مافی هاوڵاتیبوونیان بەدەستهێناوە. لە عەرەبیدا وشەکە هێماکردنە بۆ ماناکانی ملکەچی، سەرکوتکردن، زەلیلکردن، یان کۆیلایەتی، بەئەندازەی ئەوەی لە ماناکانی قەرزاری یان ئایینەوە هاتووە، کە هەردووکیان لەگەڵ چەمکی هاوڵاتیبوون و ئازادیدا نایەنەوە.

بەهەرحاڵ، وێڕای دامەزرانی کۆمارەکان و پیادەکردنی میکانیزمەکانی دیموکراسی،

کەچی زاراوەی هاوڵاتیبوون لە جیهانی عەرەبیدا نەبۆتە چەمکێکی ناوەندی. لەوانەیە مافەکانی هاوڵاتیبوون لە سەردەمی لیبرالیزمی دوای قۆناغی کۆلۆنیالیزمدا ڕێزی لێ گیرابێت، وەک ئەوەی لە لوبنان، یان میسر، یاخود تونس ڕوویدا، بەڵام دوای ئەوە پاشەکشە لە بەرژەوەندیی چەمکەکانی تردا: تێکۆشەر، هاوڕێ، شۆڕشگێڕ، ڕوویدا، بەتایبەتی لەگەڵ هەڵکشانی بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی و هەژمونی پرۆژە ناسیونالیست یان چەپڕەوەکاندا، کە وەرگێڕران بۆ چەند حکومەتێکی دیکتاتۆری و ڕژێمێکی تۆتالیتاری. لەگەڵ هاتنە سەر شانۆی فەندەمەنتالیزمەکانیشدا وشەی ئیماندار بەهێزەوە بەکارهێنرا و چەند زاراوەیەکی وەک بانگەشەکار، موجاهید، یان جیهادکار خرایە سەر لیستی زاراوەکانی پێشکەوتنخوازی و عەلمانییەت، کە بەشداریکرد لە قوتدانی چەمکی هاوڵاتیدا...

ئەمەش چارەنووسی گشت زاراوە نوێکانە. چونکە کۆمار وەرچەرخا بۆ پاشایەتی، دیموکراسی چەند حکومەتێکی دیکتاتۆریی بەرهەمهێنا، عەلمانییەت گۆڕا بۆ دەستەگەریی تایەفەگەرانە. خراپترینیش ئەوەیە، کە لەگەڵ زاڵبوونی مۆدێلە بڕوامەند و ئیماندارەکاندا، هاوڵاتی کە سەربەخۆیی و شوناسی سنووربڕی خۆی پیادەدەکات، کەوتە بەر تۆمەتبارکردن بە کفرکردن و خراپەکاری، یان بەکرێگیراوبوون و خیانەتکردن.

## ئیماندار و هاوڵاتی:

بەمە دەگەینە ئیشکالییەتی ئایین و هاوڵاتی، پرسیارە گرنگەکەش ئەمەیە: ئایا موسڵمانی دەروەست دەتوانێت موسڵمان و هاوڵاتیش بێت؟

بێگومان کەسانێک هەن لەو بڕوایەدان، ئیسلام لەگەڵ مۆدێرنیتەدا- بە ناونیشان و بەهەکانییەوە- ناکۆک نییە، وەک زۆرێک لەو موسڵمانانە دەریدەبڕن کە بە پاڵاوگەی جیهانگیریدا تێپەڕیوەن، یان ملکەچی گۆڕانکارییەکانی مۆدێرنیتە بوونو سوودیان لە دەستکەوتەکانی وەرگرتووە. ئەوانە تەنیا وەک ڕەهەندێکی کەسایەتیی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ ئایین کردوە و ئینتیمای ئایینی یان تایەفەگەرانە زاڵ ناکەن بەسەر ئینتیمایاندا بۆ وڵاتێک، نیشتمانێک، کۆمەڵگەیەک، یان جیهانێک بەواتا هەرە فراوانەکەی. ئەوەی ئەمە بارەکەی بێت شوناسی ئایینی خۆی پیادەدەکات، ئەوەش وەک بەڵانسێکی ئەخلاقی، یان کەلەپوورێکی کراوەی تێپەڕێنەری سیستەمەکانی فیقهە و ئاخاوتن، یاخود پەیوەندییەکی کەسێتی بەماناو حەقیقەتەوە، کە وەردەگێرێت بۆ سوودێک لە ژیانی گشتیدا، بەڵام بەبێ هاوارکردن، یان بانگەشەکردن، یاخود ستەمکاری. موسڵمانەکانی ئەم پۆلە ئیمڕۆ کەمایەتین، بەڵکو گەنارگیرن و کاریگەرییان کەمە.

ئەو مۆدێلەی ئێمڕۆ باڵادەستە، ئیسلامییە. لێرەدا من جیاوازی لەنێوان موسڵمان و ئیسلامیدا دەکەم. مەبەستم لە ئیسلامی موسڵمانێکی فەندەمەنتالیستە دەیەوێت ژیان لەسەر بنچینەی ئایینێک رێکبخات، کە بەلای ئەوەوە مەرجەعیەتی باڵا یان دەسەڵاتی رەهای لە گشت کاروبار و مەسەلە و کێشەکاندا هەیە، جا بچووک بن یان گەورە. لێرەوە دروشمی: ئیسلام چارەسەر و ئەڵتەرناتیڤە، سەریهەڵداوە. بەوجۆرە ئیسلام وەک شوناسێکی کولتووری مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بەئەندازەی ئەوەی وەک دەوڵەت، حکومەت، سیستەمی سیاسی، یان بەرنامەی ئابووری مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت. واتە بەو جۆرەی هەموو وەڵام و چارەسەرەکانی گشت پرسیار و کێشەکانی لەلابێت. سەیرنییە مەسەلەکەش بەو شێوەیە بێت، چونکە موسڵمانی فەندەمەنتالیست هیچ وتەو کردارێکی بەدڵ نییە، جگە لەوەی خوا فەرمایشیکردوە یان لە دەقدا هاتووە. باشتریشە بڵێین، جگە لەوەی ئەو شێخە فەتوای دەدات و لەکۆتاییدا شیکردنەوە یان ئاخاوتنەکەی جێگەی قسەکانی خوا دەگرێتەوە...

ئەوەی ئەمە بڕوا و هەڵوێستەکەی بێت، مەحاڵە موسڵمان و هاوڵاتیش بێت. بۆ نموونە، مەحاڵە موسڵمان و لوبنانی، موسڵمان و سوری، موسڵمان و میسری، موسڵمان و فەڕەنسی، یان موسڵمان و سویسری بێت... چونکە ئەوەی بەوجۆرە بیریکاتەوە و کاربکات، ئایین بەلایەوە یەکەمە و هەموو شتەکانی تر کار بۆ خزمەتکردنی ئەو ئایینە دەکەن، ئەگینا دووردەخرێنەوە، یان ڕەتدەکرێنەوە، یاخود تاونباردەکرێت. بەپێی ئەم لۆژیکە، ئەولەوییەت لای موسڵمانی دەرەوەست بۆ دەق، شەریعەت، فەتوا، حیجاب، مزگەوت، بەرگری و ڕێبەر دەبێت، نەک دەوڵەت، نیشتمان، کۆمار، دیموکراسی، یاساکان، بەرژەوەندیی گشتی و ژیانی هاوبەش. ئەمەش ئەوەیە کە بەبێ ئەمسەر و ئەوسەر و پێچوپەنا زۆربەی ئەو ئیسلامییە فەندەمەنتالیستانە دەریدەبڕن، کە جەغت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ئیسلام لەگەڵا فەلسەفە، عیلمانییەت، دیموکراسیو کۆماردا ناکۆکە، تەنانەت هەندێکیان وشەی «دەوڵەت» ڕەتدەکەنەوە و زاراوەی «خیلافەت» لەو بەباشتر دەزانێت. ئەمەش وادەکات نیشتمانەکان دوخراوە یان هەڵپەسێردراوبن وەک لە لوبنان، یان مینرێژکراوبن وەک لە وڵاتێکی عەرەبی زیاتر کە فرە تایەفەیە، بەئەندازەی ئەوەی هەڕەشە لە بنەماو ڕێساکانی ژیانی هاوبەش دەکەن یان هەڵیاندەتەکێنن.

ئەوە فەرامۆش ناکەم، ئیسلامی وەها هەن کە دەڵێن ئیسلام و مۆدێرنیتە و تەنانەت عەلمانییەت ناکۆک نین بەیەکتر، بەڵام ئەوانە کێشەکە بەلاڕێدا دەبەن، چونکە مەرجەعی موسڵمانی دەرەوەست خوا و دەقە، واتە ئەوەی ڕەهایە و

نێردراوەتە خواراوە، لەکاتێکدا عەلمانی پێیوایە خود و ئەقڵی خۆی مەرجەعیەتی، واتا ئەوەی کۆتاییدێت و سنووردار و ڕێژەییە. هەروەها ئەوە پشتگوێ ناخەم کە عەلمانیی وەهاش هەن بەشێوەیەکی ڕەها مامەڵەیان لەگەڵ ئەقڵدا کردوە، ئەوانەش ڕووی دوەمی ئەقڵی ئایینی تاکڕەهەندن.

ئیسلامیی وەهاش هەن کە کۆماریان دامەزراندوە، وەک لە ئێران، بەڵام کۆمارەکە گۆڕاوە بۆ ئۆتۆکراتی و تیایدا ناڕازی بەوە تاوانباردەکرێت کە سەرپێچیی خوا و قورئان دەکات. ئیسلامیی وەهاش هەن ڕایدەگەیەنن، کە لە نیشتماندا لەگەڵ ئازادیی بیرکردنەوە و دەربڕین و پرنسیپی هاوبەشدان، کەچی لەوەدا ڕاستبێژ نین، چونکە ئەوەی ڕایدەگەیەنن ناکۆکە لەگەڵ دەقەکان/ سەرچاوەکاندا. هەروەها لە کارپێکردن و هەڵوێستەکانی سەر زەمینەی واقیعدا بەدیناکرێت، چونکە ئەوانە لایەنگری ئازادین بۆ خۆیان و دژی ئازادین بۆ ئەوانیتر. بەڵگەش ئەوەیە، ئەوان لەگەڵ پۆشینی حیجابدان لە ئەورووپا، بەڵام لەو شوێنەی حوکمڕانیدەکەن یان دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە لەگەڵ ئازادیی نەپۆشینی حیجاب نین، جا ژنەکە موسڵمان بێت یان ناموسڵمان.

من ئەوەم خوێندۆتەوە، کە (تاریق ڕەمەزان) ی موسڵمانی سویسریی بەڕەچەڵەک میسریی لەو نامەیەدا وتویەتی کە بەناوی مافی هاوڵاتیبوونەوە ئاراستەی خەڵکی وڵاتە نوێکەی (سویسرا) دەکات و ناڕەزایی بەرامبەر دەنگدانیان دژی بنیاتنانی مزگەوت دەربەبرێت، بەڵام ئەگەر (تاریق ڕەمەزان) وەک ڕێبەری پێشووی گرووپی «ئیخوان موسلمین» (مەهدی عاکف) بیردەکاتەوە، ئەوا مەحاڵە بتوانێت موسڵمان و هاوڵاتیش بێت، چونکە کاتێک پرسیاریان لە (شێخ عاکف) کرد داخۆ خیلافەت مانای ئەوەیە کەسێک لە دەرەوەی میسر حوکمڕانیی میسر بکات، ئەو ڕۆژە وەڵامەکەی ڕاچڵەکین یان ئابڕووچوونی خستەوەو بریتیی بوو لە: میسرم بەلاوە گرنگ نییە، چونکە خیلافەت لە دەوڵەت و نیشتمان لەپێشترە.

خیلافەت لێرەدا مانای ئینتەرناسیونالیزم نییە، کە لە مرۆڤایەتیدا وەک یەک سەیری مرۆڤەکان دەکات، بەبێ جیاوازیخوازی لەسەر بنەمای ڕەگەز، یان ئایین، یاخود ڕەنگ. چونکە ناموسڵمان لە خیلافەتدا پلە دوە، بەئەندازەی ئەوەی لە سورگەی حەقیقەت و ئیمان و ڕێگەی ڕاست دوزینەوە و تەنانەت مرۆڤایەتی دووردەخرێتەوە. ئەمە ئەوەیە کە هەموو ئایینە یەکتاپەرستەکان وا لێ دەکات بە ئەقڵییەتی بەکافرکردنی یەکتر مامەڵە لەگەڵ یەکدا بکەن. ئەمە لۆژیکی ئایینیشە بەگشتی، لە ڕووی ناکۆکییەوە لەگەڵ کۆمەڵگەی عەلمانی و مەدەنی. جا ئەگەر ئێستا کڵێسا لە ئەورووپا لەگەڵ دەوڵەتی شارستانیی دیموکراتیدا ژیان بەرێتە سەر،

یان گەیشتبێتە ئەو بڕوایەی لە سێبەریدا بژی، ئەوە لەبەرئەوەیە کە لەبەردەمی شەپۆلەکانی مۆدێرنیتەو هێزەکانیدا زیاتر لە جارێک شکستیخواردوە، وەک ئەوەی بەشێوەیەکی تایبەتی لە فەڕەنسا ڕوویداوە (١٧٨٩-١٩٠٥). جا ئەگەر فەڕەنسا چاودێریی کڵێسای بەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگەوە ڕەتکردبێتەوە، چۆن داوای لێ دەکرێت ئەو مافانە بداتە موسڵمانەکان کە لە مەسیحییەکانی سەندوەتەوە!

ئەوەتا (یەحیا حوسی) ی ئیسلامی، نوێنەری گرووپەکەی لە ئەڵمانیا، ڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێت کە یاخیبوون لە دەوڵەتی یەمەن هیچ پەیوەندییەکی بە نەهێشتنی هۆیەکانی بەرژەوەندیی ماقوڵەوە نییە، وەک نەهێشتنی بێدادی، یان بەدەستهێنانی بەرژەوەندی، یاخود چاککردنی باری بژێوی، بەڵکو ئەوان دەجەنگن بۆ ئەوەی کولتووری قورئان «لەسەروو هەموو کولتوورەکانەوە بێت». جا لەبەرئەوەی دەق شایانی فرەلێکدانەوەیەو ڕووبەرێکی بەپیت و کراوەیە بەڕووی لێکدانەوەی جیاواز و شرۆڤەکردنی ناکۆکدا، ئەوا لەکۆتاییدا لێکدانەوەی حوسییەکان بەرز ڕادەگیرێ، ئەوەش ئەنجامی ڕەتکردنەوەی لێکدانەوەکانی تر و دوورخستنەوەی خاوەنەکانیان، یان ڕیشەکێشکردنیان.

ئاکامەکەش شەڕی ناوخۆی نێوان گرووپ و مەزهەبەکانە. ئەمە لە ڕابردوودا ڕوویداوە و ئێمڕۆش لە زیاتر لە گۆڕەپانێکدا ڕوودەدات. ئاشکرایە موسڵمانەکان، پاش دابەشبوونیان بۆ چەندین گرووپ، بەڵکو چەندین ئایینی دژ بەیەک و گۆڕان بۆ چەند تایەفەو کۆمەڵگەیەکی داخراو، بەهۆی فەزا و بەها و دامەزراوەکانی مۆدێرنیتەوە بەڕووی یەکترا کرانەوە، بەڵام کاتێک هەر گرووپێک گەڕایەوە بۆ بڕوا و فیقهی خۆی، بەمەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتر یان لەگەڵ دەوڵەت و نیشتمانەکانەکەی، سەرەنجامەکە ئەو هەموو خوێنڕشتن و ماڵوێرانییە بوو.

ئینجا ئەگەر موسڵمانە فەندەمەنتالیستەکان یەکتری قبوڵ نەکەن، چونکە ئەوەی پەیوەندییەکانیان کۆنترۆڵدەکات، ستراتیژی ڕەتکردنەوە و لۆژیکی دوورخستنەوەیە، جا لەنێوان مەزهەب و مەزهەبێکی تردا بێت، یان لەناو یەک مەزهەبدا، وەک ئەوەی شەڕە ناوخۆکان دەیخەنەڕوو، چۆن ئەویتری ئەورووپایی، خورئاوایی، چینی، یان هیندی قبوڵدەکەن؟ لێرەوە کێشەی ئیسلام لەگەڵ خۆرئاوا و عەلمانیەت بۆتە کێشەیەکی پلە دوو. ئێمە لەبەردەم کێشەیەکی ئاوێتەداین، کە ڕووی یەکەمی پەیوەندیی موسڵمانە بە موسڵمانەوە، ڕووی دوەمی پەیوەندییەتی بەویترەوە، جا ئایندار بێت یان بێئایین.

ئەمەش مانای ئەوە نییە کە پێویستە موسڵمان لایەنگری عەلمانیەت بێت یان ببێتە کەسێکی تر، بەڵکو مانای ئەوەیە دان بە ڕەوایەتیی ئەویتردا بنێ، ئەگەر لە

ڕووی مەزهەب، یان ئایین، یاخود کولتوورییشەوە جیاوازبێت. هیچ دانپیانانێکیش بەبێ گۆڕانی دوولایەنە، کە بەهۆیەوە کەسەکە ناوەندێتیی خۆی جێدەهێڵێت و دەستبەرداری بانگەشەکردن بۆ بەدەستەوەگرتنی کلیلەکانی حەقیقەت دەبێت، بەجۆرێک کە تایبەتمەندیی خۆی بەشێوەیەکی ئاوێتە و کراوە پیادەبکات، بەشێوەیەک، کە دەرفەتی ئەوەی بۆ بڕەخسێت بەشداربێت لە بنیاتنانی جیهانێکی هاوبەش لەتەک ئەوانەی جیاوازن لەگەڵیدا.

## ئایین دەوڵەتە:

بەڵام ئەوەی ئیسلامییە فەندەمەنتالیستەکان دەیانەوێت، چونکە یاریدەدەرە بۆ حوکمڕانیکردنیان، هێنانەژێرباری ئەویترە، ئەگەرنا ئەوا چارەنووسی نەفرەتیلێکردن و دوورخستنەوە، یان ڕیشەکێشکردن دەبێت. ئەمەش لۆژیکی فەندەمەنتالیزمەکانە بەگشتی، بە نموونە جۆریەجۆرە ئایینی، یان ناسیونالیست، یاخود چەپەکانییەوە.

ئەمە مانای ئەوە نییە ئاقارە فەندەمەتالیستەکانی ئێستا، جا ئیسلامی بن یان نائیسلامی، حوکمڕانیان دەوێت یان لە دەوڵەتە دامەزراوەکان نارازین، چونکە دەیانەوێت وەک ترس و خواناسی، ئاستی سڵەمینەوە لەنێوان مرۆڤ و هاوچەشنەکەیدا، وەک مامەڵەکردنی هاوشێوە، دانتان بە فرە زمانی و ڕەنگ و ڕەگەزەکاندا، یارمەتیدان و هاوکاریکردنی نێوان نەوەکانی ئادەم، هاندان بۆ ئەنجامدانی کاری سوودبەخش کە ململانێ و شرۆڤەکردنە مەزهەبییەکان تێدەپەڕێنێت، پیادەی ئایین بکەن. بەپێچەوانەوە ئەوانە کۆششدەکەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئایینی خۆیان و سەپاندنی دەسەڵاتی ئایینی خۆیان لەژێر سایەی مێزەری ئەو ڕێبەرەدا، کە خەلیفە و نمایندە و سێبەری خوایە لەسەر زەوی. بەڵێ ئەوانە دژی دەوڵەتی شارستانین، کە هاوڵاتیانی ئازاد تیایدا دەژین و سنوورەکانی تایەفەو مەزهەب و حیزبەکان تێدەپەڕێنن و لەبەردەم یاساکان و سیستەمە مرۆڤکردەکاندا یەکسانن، بەڵام لەگەڵ ئەو دەوڵەتە تۆتالیتارییەدان کە بەهێزی ڕووت توانستەکان قۆرخدەکەن و هەناسەکان دەژمێرن و مرۆڤەکان ملکەچدەکەن، لەپێناو دەستەمۆکردن و خستنەگەڕیان بۆ چەند بانگەوازێکی مەحاڵ یان بڕوایەکی وێرانکار، کە بەڵێنە بەهەشتییەکان دەگۆڕن بۆ شاییەکانی خوێن. بەوەش ڕووەکەی تری دەوڵەتی عەلمانیی تۆتالیتار پێکدێنن، وەک ئەوەی لە نموونەکانی ستالینیزم، فاشیزم، ماویزم یان کۆپییە کاریکاتۆرەکانیان لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەمدا بەدیمانکردن...

ڕاستە دەوڵەتی ئایینی تۆتالیتار لە ڕووی دروشمەکانەوە ناکۆکە لەگەڵ دەوڵەتی عەلمانیی تۆتالیتاردا، بەڵام هەردووکیان لە ڕووی لۆژیک و میکانیزم و کاریگەرییەکانەوە

دەست لەگەڵ یەکتر تێکەڵدەکەن، چونکە هەردووکیان ستەمکاری و خراپەکاری بەرهەمدێنن، هەردووکیان دڕندایەتی و بەربەرییەتیان پیادەکردوە. ئەمەش ئاکامی بەخواکردنە لەسەر زەوی، جا لەسایەی خوایێتیی ستالیندا بێت، یان فرانکۆ، ماو، چاوچیسکۆ، قەزافی و خومەینیدا پیادەکرابێت، یاخود لە سایەی ئەستێرەکانی تیرۆریزمی هاوچەرخدا بێت کە بانگەشە بۆ بەدەستەوەگرتنی کلیلەکانی حەقیقەت و ڕزگاربوون دەکەن.

لێرەوە من لەگەڵ (ڕێجیس دۆبرییە) نیم، کاتێک دەڵێت ئایین ڤیتامینی لاوازەکانە و هۆشبەری میللەتان نییە، چونکە باشتربوو ئایین وەک هۆشبەر بمابایەتەوە، تەنانەت ئەگەر وەک وەهم و هەڵخەڵەتاندن و بەلارێدابردنیش پیادەبکرابایە، بەوپێیەی کاریگەرییەکانی پۆزەتیڤانە دەبوون، وەک خواناسی و ترس و میهرەبانی.

بەم مانایە ئێمە دوانەی ئایین و دەوڵەت تێدەپەڕێنین، کە وەک دوانەکانی تری مۆدێرنیتە سواون، بەتایبەتی لە جیهانی عەرەبدا، چونکە ئەوەی بەدیدەکەین، تێکشکانە لە ڕووی گۆڕینی دروشمەکانەوە بە دژەکانیان، جا ئەوە لە بەرەی دەوڵەتی عەلمانیدا بێت یان تۆردووگای دەوڵەتی ئایینیدا. هەردووکیان کاریان بۆ وێرانکردنی بیرۆکەی هاوڵاتی کردووە، لەبەرئەوەی وەک چۆن بانگەشەکاری فەندەمەنتالیست پێیوایە ئیسلام، شەریعەت، فەتوا، حیجاب و ڕێبەر لە دەوڵەت و یاساکان و بەرژەوەندیی گشتی لەپێشترن، بەڵکو لە خەڵک و ژیان لەپێشترن، ئاوەهاش ڕووناکبیری مۆدێرنیست، ناسیونالیست، یان چەپڕەو، بە نموونە بڕواخوازو بەتارماییکردنە خەباتکارییەکانیەوە، پێیوایە عەرەبایەتی، یەکگرتن، سۆشیالیزم، مەسەلەی پیرۆزو تاقە سەرکردە لەپێش هەمووشتێکەوەن. سەرەنجامیش ئەو توندوتیژییە کۆمەڵگەیی و ستەمکارییە سیاسی یان خۆوێرانکردنەیە کە دەیبینین.

ئەگەر ئایین، وەک هەندێک لە پیاوانی دانیپێدادەنێن، هەمیشە وەک دەمامک یان جلوبەرگێک بەکاربرابێت بۆ تێپەڕاندنی چەند پلانێکی گومانپێکراو، یان چەند پڕۆژەیەکی ستەمکارانە، یاخود چەند ستراتیژێکی کوشندە، ئەوە لەبەرئەوە نییە کە ئایین نموونە بەرزەکان و بەها پایەدارەکان بەرجەستەدەکات، یان کاریگەریی بەهێزی لەسەر دەروونەکان هەیە. ئەمجۆرە قسەیە خۆگێلکردنە لەئاست کێشەکەدا، بەئەندازەی ئەوەی مانای نەزانییە بەرامبەر بە بونیادی ئایین و پێویستیی بڕوای ئیمانداری. ئەگەر ئاسان بێت ئایین بۆ چەند مەبەستێکی خراپەکارانە بەکارببرێت، وەک بەهانەی بۆ دێننەوە، ئەوە لەبەرئەوە نییە کەسانێک هەن ئایین زەوتدەکەن و دەشێوێنن، بەڵکو لەبەر هۆیەکی بونیادییە ئەک کاتی کە لەئاییندا هەیە، مەبەست

ئەوەیە ئایین کار بۆ دروستکردنی خەڵکانێک دەکات، کە بەچاکی فەریزەتەکانی گوێدێری یان سرووتەکانی وابەستەیی و کۆیلایەتی پیادەدەکەن.

ئەمەش ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژیا عەلمانییەکان و ئایینە نوێکان لەلای خۆیانەوە ئەنجامیدەدەن، ئەو ئایدیۆلۆژیا و ئایینانەی وەک ژمارە یان ئامێری ناو حەشاماتەکان و ڕەوەکان مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا دەکەن، چونکە ئەوانیش سرووتەکانی پەرستنی تاقە سەرۆک و سەرکردەی ئیلهامبەخش پیادەدەکەن. لە هەردوو بارەکەدا کۆمەڵەکان دەگۆڕێن بۆ چەند گرتبوونەوەیەکی ئاسیدە و بەئاسانی هەڵدەخەڵتێنرێن و بەلاڕێدا دەبرێن، لەپێناو بارگاویکردن و گۆشکردنیان بۆ ئەو پرۆژانەی ئاشنانین بە بزوێنەرەکانیان یان بەدوای ئەو دروشمە پیرۆزانەی دەبنە قوربانیان. سەیرنییە عەلمانی، ئیسلامی، ناسیونالیست و چەپڕەو پێکدەگەن، چونکە فیکری تاکڕەهەند و بڕوای پۆلایین و سیستەمی تۆتالیتار پێکەوەیان کۆدەکاتەوە.

## نەشونماکردنی بیرۆکەکە:

بەهەرحاڵ ئێمە عەلمانییەت بۆ ئەودیو عەلمانییەت تێدەپەڕێنین، وەک چۆن لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانکاری و هەرەسهێنان و قەیرانەکانی جیهانی نوێدا مۆدێرنیتەمان بۆ پۆست مۆدێرنیتە تێپەڕاند. ئەمەش دەرفەتی ڕەخساند بۆ هەریەکێک لەوانەی ڕەخنە لە مۆدێرنیتە دەگرێت باسی قۆناغێک بکات کە عەلمانییەت بۆ ئەودیو عەلمانییەت تێدەپەڕێنێت. قسەکەی (هابرماس) لەمەڕ کۆمەڵگەی ئەودیو عەلمانییەت دەکەوێتە ناو هەمان ڕێڕەوەوە، بەڵام ئەوە مانای گەڕانەوە نییە بۆ پێش مۆدێرنیتە، بەمەبەستی لەناوبردنی دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتە یان بنیاتنانی وێناکردنە ئایینیەکان دەربارەی ئایین، بەڵکو مانای کردنەوەی ئاسۆکان و دۆزینەوەی چەندین توانستی نوێیە بۆ دروستکردنی ژیانی هاوبەش، بەجۆرێک کە هاوبەش یان یەککگرتوو، کۆمەڵگەیی، سیاسی، نیشتمانی، یان جیهانی بە کرانەوە بەڕووی فرە وێناکردن و شێواز، یان فرە هێز و فراکسیۆن، یاخود فرە چالاکی و ڕەوایەتییەکاندا بەڕێوەببرێن.

بنچینەی کرانەوەکە تێکشکاندنی لۆژیکی بەدەستەوەگرتن و دڵنیاییە، بۆ ڕزگاربوون لە هاوجووتەکان و تەماهیکارەکان، چونکە مەحاڵە وێناکردنەکان لەگەڵ واقیعدا هاوجووت بن و بیروڕاکان لەگەڵ یەکتردا هاوجووت بن، بەڵکو مەحاڵە خود تەماهی لەگەڵ خۆیشیدا بکات. ئەمە وەهمێکی ئاوێتەیە پێویستە هەڵوەشێنرێتەوە، چونکە شیاو داهێنانی بناغەیەکە بۆ گفتوگۆکردن، یان خوڵقاندنی ناوەندێکی کۆکەرەوە، یاخود فەزایەکی هاوبەشە. بەم مانایە، هەریەکێک دەتوانێت بڕوای بە

هەرشتێک هەبێت، بەمەرجێک بزانێت چۆن لەگەڵ ئەو کەسەدا بژی، کە لە زمان، نیشتمان، وڵات، یان کۆمەڵگە (بەواتا فراوانەکەی) هاوبەشن لەگەڵیدا، تەنانەت ئەگەر لە ڕووی بڕواو مەزهەب و بیروڕاشەوە جیاوازیوو لەگەڵیاندا... هاوبەشیش حەقیقەتێکی پێشوەخت نییە، بەئەندازەی ئەوەی ئەزموونێکی تاقیکراوەیە، شتێک نییە بدرێت، بەڵکو مانایەکە بەرهەمدەهێنرێت و جیهانێکە دروستدەکرێت و بەردەوام بنیاتدەنرێتەوە.

ئەمەش ئەوەیە، کە خاوەن پرۆژە ئایدیۆلۆژییەکانی هەردوو بەرەکە: کەلەپوورخواز و مۆدێرنیست، تیایدا سەرکەوتوونەبوون، بەڵام ئەمە مانای گریانی درۆزنانە نییە بۆ سەردەمی ڕێنسانس و ڕۆشنگەری و لیبرالیزم، سەردەمی (محەمەد عەبدە) کە دیوت: پاش مردنی پێغەمبەر چاودێریی هیچ کەسێک بەسەر ئەقڵەوە نەماوە، یان سەردەمی (تەها حسێن) کە نەیارەکانی بەهۆی داوەرێکی ڕووناکبیرەوە داواکەیان لە دژی دۆڕاند، بەپێچەوانەی (نەسر حامید ئەبو زەید)ەوە کە هاوکارەکەی لە زانکۆ داوایەکی لە دژی تۆمارکرد، پاش ئەوەی مامۆستا گۆڕا بۆ موجاهید و زانکۆش گۆڕا بە مزگەوت.

گەڕانەوە بۆ دواوە مەحاڵە، چونکە هەمووشتێک ڕوو لە گۆڕانە. بەوپێیەی لەگەڵ چوونە ناو سەردەمی دیجیتاڵ و کەوتنە ناو واقیعی گریمانەییەوە، چوارچێوەکانی کاتو شوێن تەقینەوەو بەربەستەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵەکان دڕزیان تێ بوو. بەوجۆرەش دەرفەتەکانی پێکگەیشتنی نێوان مرۆڤایەتی فراوانتربوون، بەئەندازەی ئەوەی پەیوەندییەکانی هاوسێیەتی گۆڕانیان بەسەردا هات. ئەمەش بووە مایەی زۆربوونی بزووتنەوەی گواستنەوەی نێوان خەڵک، بەئەندازەی ئەوەی بۆ هۆی ئەوەی زانیاری و سمبول و وێنەکان بەخێرایی ڕووناکی و فیکر لە شوێنێکەوە بگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی تر.

گۆڕانکارییەکانیش بەهەشت نین، وەک خەیاڵپڵاوەکان و تەوباوییەکان بۆی دەچن، بەڵام کارەسات و ترسناکیش نین، وەک ترسنۆک و موحافەزەکارەکان تێیدەڕوانن، بەڵکو دەستدانی کراوەن، گرنگی و سوود یان مەترسی و زیانەکانیان پشتبەستووە بە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

ئەمەش مانای ئەوەیە، چیتر ناکرێت بەهەمان ئەقڵییەت و چەمکەکان، یان میتۆد و ئامرازەکان توخنی کێشەکان بکەوین و قەیرانەکان چارەسەربکەین، یان شوناسەکان و مەسەلەکان بەڕێوەببەین، یاخود مافەکان و بەرژەوەندییەکان بپارێزین. گۆڕانکاری پێویستە، بەمەرجێک پەی بە ئاراستە و ئەولەویەتەکان بەرێت، وەک چۆن پەی بە شێوازەکانی بیرکردنەوەو ئەقڵانیکردن دەبات، بەوپێیەی جیهان بە بزوێنەر و هێز

و کەرەستەکانی خۆی دەگۆڕێت، وەک چۆن بە چەمکو پێوانە و بەهاکانی خۆی گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەمە ئەوەیە کە ئیمڕۆ ڕوودەدات: هیچ چەمک یان ناونیشانێک وەک خۆی نەماوەتەوە، چونکە کۆمەڵگە، تاک، دیموکراسی، دەسەڵات، هێز و شوناس ڕوو لە گۆڕانن.

سروشتییە لەبەر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانانەی بەسەر شێوازەکانی بەرهەمهێنان و خوڵقاندن، یان تۆڕەکانی ئاڵوگۆڕکردن و شێوازەکانی پێکگەیشتن، یاخود نەخشەکانی مەعریفە و بزوێنەرەکانی کارکردندا هاتوون، چەمکی هاوڵاتی وەک زاراوەکانی تر لەم ڕەوتەدا گۆڕانی بەسەردا بێت، چونکە چەمکەکە زاتێکی پیرۆز یان سیستەمێکی داخراو نییە، بەڵکو بریتییە لە نەشونماکردن و گۆڕانکارییەکانی خۆی، بەئەندازەی ئەوەی بریتییە لە کۆی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانیتر.

بۆیە چیتر تێگەیشتن دەربارەی هاوڵاتیبوون وەک جاران نییە و وەک جارانیش پیادەناکرێت، بەڵکو بەئەندازەی دەوڵەمەندبوونی بە توخم و ڕەهەندە نوێکان: ئەقڵانییەتی ئاوێتە و ڕەهەندی فرەلایەن، شوناسی فرەڕەگ و کولتووری کراوە، زمانی تاوتوێکردن و ئەقڵییەتی شەریکایەتیکردن، میتۆدی نێوانکاری و پرنسیپی دانپیانان، زیندوێتیی خوڵقێنەرانە و بەڕێوەبردنی کارا... گۆڕانی بەسەردا دێت.

ئەم گۆڕانکاریانە لە چەمکەکاندا دەرفەت بۆ تێپەڕاندنی هەندێک لەو دوانە سواوانە دەڕەخسێنن، کە کێشەکان پەردەپۆشدەکەن. وەک دوانەی تایبەتمەندی و جیهانی، دەوڵەت و ئایین، ئاییندار و عەلمانی، یەکسانی و ئازادی، کۆمار و لیبرالیزم، یان تاکگەرایی و دەستەجەمعی. تێپەڕاندنیش بە مانای ڕەتکردنەوە، یان دوورخستنەوە نایەت، بەئەندازەی ئەوەی مانای سەرلەنوێ گێڕانەوەی پەیوەندی و ڕایەڵە و بنیاتنانە بە لۆژیکی پێکهێنان و گۆڕین، بەجۆرێک کە دەرفەت بڕەخسێنێت بۆ داهێنانی چەندین هاوکێشە و فۆرم و چوارچێوە، کە ڕەچاوی ئاڵۆزیی بێوێنە و بزاوتی خێرای واقیع دەکەن، بەئەندازەی ئەوەی دەڕواننە ڕەهەندی هەمەلایەنی کەسایەتیی مرۆڤانە. چونکە هیچ شتێک ئەوەندەی تاکڕەهەند ئازادی ناخنکێنێت و هاوڵاتیبوون وێران ناکات یان وزە ئیفلیج ناکات، جا ئەوە دروشمی خوا یان مرۆڤ بێت، بازاڕ یان دادپەروەری بێت، ئازادی یان بەرگریکردن بێت...

بەهەرحاڵ گۆڕانکارییە جیهانییەکان زەمینە بۆ کرانەوەی دەرفەتە نوێکانی بیرکردنەوە وکارو بنیاتنان خۆشدەکات، کتومت وەک چۆن قەیرانەکان و ڕچڵەکینەکان دەرفەتن بۆ ئەوەی هەریەکێک باری خۆی بگۆڕێت. ئەمەش ئەو شتەیە کە هیوادارین نەوە نوێکانی لاوان بیری لێ بکەنەوە و سەرکەوتووین لە جێبەجێکردنیدا، هەتاکو

دەرفەت بەفیڕۆنەدەن، یان لە کارەکانی بوژانەوە و چاکسازی و پێشکەوتندا وەک نەوەکانی ئێمە شکست نەخۆن.

کەواتە باشترە هاوڵاتیی تاک، جا تایبەتمەندییەکەی هەرچییەک بێت، بەهۆی ڕووە جۆربەجۆرەکان و ئینتیما تێکهەڵکێشەکان و تاقیکردنەوە دەوڵەمەندەکان و هەڵبەزودابەزە چاوەڕوانکراوەکانیەوە هەڵسوکەوت بکات... چونکە دەرهاویشتەکە تاکەکەسی و تایبەتییە، بەڵام گرتبوونەوە یان کۆمەڵگە بینایەکی هاوبەشە پێویستی بە دروستکردن و گۆڕین و پێکهێنانە، بەردەوام لە ڕووی پەیوەستی و پەیوەندییەکانەوە، یان چوارچێوە و دامەزراوەکانەوە، یان ڕووبەر و فەزاکانەوە، یاخود زمان و کۆدەکانەوە پێکدێت و دەخوڵقێت، یان بنیاتدەنرێت و ئاوێتەدەبێت، یاخود دروستدەبێت و دەکەوێتە کارلێککردنەوە.

ئەوەی ئەمە بارەکەی بێت، وەک خاوەن شوناسێک مامەڵە لەگەڵ خۆی دەکات، کە بەئەندازەی ئاوێتەبوون زیندووە، بەئەندازەی دەوڵەمەندبوون بە ئەزموونە بوونخوازییەکانی خۆی خوڵقێنەرە، بەئەندازەی ڕووکردنە داهاتوو بنیاتنەرە، بەئەندازەی بڕینی سنوورەکان هەنوکەییە. بەوپێیەی ئیمڕۆ هاوڵاتیبوونی سەرکەوتوو و لێهاتوو، بەری شوناسێکی فرەڕەگ و کۆسمۆپۆلیتیەکی کراوەیە بە ڕووی فرەیی زمان و ڕۆڵەکان، یان ڕۆژگار و فەزاکاندا.

## سەرچاوەکان:


- لسان العرب، مادة "دين".
- فرنسوا دوبيه، عمل الفرد، وهي عبارة مقالة مدرجة في كتاب مشترك تحت اشراف كلود كالام، بعنوان هويات الفرد المعاصر، منشورات تكستويل (Textuel)، باريس، 2008.
- الكسندر دوبريكس، الله والعالم والكوسموبوليتي، حول الكتابات الحديثة لهابرماس، مجلة اسبري (Esprit)، عدد ايار 2009.
- بيار روزانفالون، تفكيك الديموقراطية المركزية، مجلة اسبري (Esprit)، عدد آب/ايلول، 2008.
- ورد كلام الحوثي في افتتاحية فواز طرابلسي، جريدة "السفير"، *2010/1/17*.
- كاترين هالبان، الكوسموبوليتية، مجلة العلوم الانسانية، عدد آذار 2005.
- علي حرب:
  - فيما يتعدى ثنائية الدين والدولة، ورقة قدمت في مؤتمر "الدين والدولة في الخطاب الدولي والاقليمي والعربي الراهن" الذي عقد بدعوة من "الجمعية الانجيلية القبطية" المصرية، في مراكش، بين 8 و10 نوفمبر 2009.

## پێکهێنانی بنیاتنەرانە و گۆڕانکاریی خوڵقێنەرانە

ئەگەر پێویست بێت کۆتایی بەو وتارانــە بهێنم، ئەوا جۆرێک لە پێکهێنان بۆ ئەو چەمک و بانگەواز و ستراتیژانە ئەنجامدەدەم کە توێکاریان بۆ کراوەو هەڵوەشێنرانەتەوە، چونکە توخنکەوتنی بەرهەمدار و کاریگەر ئەوەیــە، کــە توانای تیخکردنی هەبێت، بە مەبەستی دۆزینەوە و ڕووتکردنــەوەی دەرد و لەکارکەوتنەکان، بەئەندازەی ئەوەی وزەی بۆ تێپەڕاندن و پێکهێنان و گۆڕین هەبێت.

بۆیە کاتێک ئێمە چەمکێک، یان کۆنێک، یاخود دەسەڵاتێک هەڵدەوەشێنینەوە، ئەوە بەمەبەستی ڕەتکردنەوە و سڕینەوە ئەنجام نادەین، بەڵکو لەپێناو سەرلەنوێ پێکهێنان و بنیاتنانی ئــەو چوارچێوە و چەمکانــە، یان ڕێسا و پێوانانەدایــە کە سوودبەخش، یان گونجاون، یاخود کاریگەرن.

نموونەی ئــەوە، هەڵوەشاندنەوەی چەمکی «لێبوردەیی»ــە، کە دەبێتە هۆی ڕووتکردنەوەی ئەو پێشینانەی لەسەر بنچینەیان بنیاتدەنرێت و پەردەپۆشیدەکەن، چونکە وەک کاری شیکردنەوە دەریدەخات، ئەم چەمکە لەو بڕوایەی خاوەنەکەیەوە سەرچاوەدەگرێت، ئەویتر کە گفتوگۆی لەگەڵ دەکەین، یان قبوڵیدەکەین، لە ڕەفتار، یان بڕوا، یاخود مرۆڤبوونیدا هەڵەیە، یان تاوانبارە، یاخود کەموکورە، بەڵام ئێمە لەگەڵیدا هەڵدەکەین. بۆیە لێبوردەیی کێشەی ناکۆکی یان کێشمەکێشی نێوان خەڵک چارەسەرناکات، بەڵکو بنچینەی دیالۆگ مینرێژدەکات و تەنیا وچانی نێوان دوو فیتنە یان دوو پێکدادانە. ئەمەش پارادۆکسی دروشمی «لێبوردەیی»یە، بەڵکو ئابڕووچوونیەتی (١).

نوێکردنەوە هەمیشــە مانــای ڕەتکردنەوەی کۆن نییــە، چونکە دەشــێت گۆڕان بەهۆی داڕشتنی چەند چەمکێکی نوێوە ڕوویدات. لەوانەشە بەهۆی کۆکردنەوەی خوڵقێنەرانەی بیرۆکــە و چەمکە کۆنەکان ڕوویدات، وەک سەرکەوتنی کۆکردنەوەی نێوان تەقلیــدییەت و مۆدێرنیتــە، یان ناوەندێتی دەوڵەت و ئازادیی بازاڕ، یاخود شوناسی نیشتمانی و مەودای جیهانی...

## بێفیزیی مەعریفیانە:

یەکەمین وانە لە بەرەنگاربوونەوەی تەحەدداکان و کۆڵینەوە لە قەیرانەکاندا، پیادەکردنی خۆپارێزیی فیکری و بێفیزیی مەعریفیانەی فەیلەسووف و زانا و بیریارە پیشەکارەکانە بەرامبەر بە حەقیقەت. واتە وازهێنانە لە بانگەشەکان سەبارەت بە بەدەستەوەگرتن و دڵنیایی و کۆنترۆڵکردن، وەک ئەوەی لایەنگرانی حەتمیەتە داخراوەکان، تیۆرە سەرتاپاگیرەکان، مۆدێلە تاکرەهەندەکان و ڕاستییە ڕەهاکان بانگەشەی بۆ دەکەن. چونکە جیهان لەوە ئاڵۆزتر و نادیارترە کە حەقیقەتەکەی بەدەستبهێنین، یان یاساکانی بەدەستەوەبگرین، یان ڕەوتەکانی کۆنترۆڵ بکەین، یاخود پێشبینیی ڕێڕەوەکانی بکەین... ئەگەر نا چۆن ئەو قەیران و تەنگەژانە لێکبدەینەوە، کە کتوپڕ و بەبێ ئەوەی بەمێشکدا بێت یان حسابی بۆ بکرێت، ڕووبەڕووی زاناکان دەبێتەوە و هێرشدەکەنە سەر کۆمەڵگەکان.

بۆیە باشترە هەریەکێک لە ئێمە لە قۆزاخەی نەرجسیبوونی خۆی بێتە دەرەوەو دان بە ڕێژەییبوونی بیروڕاکانی خۆیدا بنێ، هەتاکو نەبێتە پاسەوانی بیرۆکەکانی خۆی و ڕووداوەکان ڕەتبکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕاستیی چەمکەکانی خۆی بسەلمێنێت. چونکە بەو کارە دەبێتە دیلی بانگەشەکانی خۆی، یان دەکەوێتە داوی دەستەوسانی خۆیەوە، بەئەندازەی ئەوەی بیرۆکەکانی خۆی دەگۆڕێت بۆ چەند بتێکی تیۆری یان چەند زاتێکی پیرۆز.

## خوڵقاندن و تێپەڕاندن:

یەکێک لە کاریگەرییەکانی بێفیزی ئەوەیە، بڕوا بەوە بهێنین کە ئەو واقیعەی دەکەوینە نارییەوە و بەشداریی لە دروستکردنیدا دەکەین، مەحاڵە بەهۆی ئەگەرە کراوەکان و هێڵە هەمەجۆرەکان، یان تریە ماتەکان و توانستە دەوڵەمەندەکان، یاخود بزووتنەوە بەردەوام و بونیادە فرەڕەگ و ئاڵۆزەکەیەوە کۆنترۆڵبکرێت.

ئەگەر بمانەوێ لە ڕوانگەی فیکری ئاوێتەخواز و ئەقڵی ئیشکالیەتئامێز و لۆژیکی فرەلایەنەوە توخنی ڕووداوەکان بکەوین، ئەوا فرەڕەگی مانای ئەوەیە جیهان تەڵەکان و بۆشاییەکانییەتی، تەڵەکانی بە گێچەڵ و ساختە و هەڵگەڕانەوەکانییەوە کە وادەکات سەخت بێت جڵەوبکرێ و بەرنامەڕێژی بکرێت و چاوەڕوانی هەموو شتێکی بکرێت. ئەمەش ئەوە لێکدەداتەوە، چۆن کەرەستە و ئامرازەکان بێکەڵک دەبن، یان کێشەکان کێشەی تر دەخەنەوە، یاخود پێشهاتەکان دژی خاوەنەکانیان هەڵدەگەڕێنەوە.

بەڵام جیهان لەهەمان کاتدا بریتییە لە بۆشایی و کونەکانی، جا ئەوە پەیوەندیی بە

بونیادی گەڕبوونەوە هەبێت یان ئەتۆم، پەیوەندیی بە هوشیارییەوە هەبێت یان کۆمەڵگە. بۆشاییش دەستدانی بوونخوازانەیە بۆ ژیان و بیرکردنەوە و کارکردن و ڕوویەرێکیش بۆ گەمەکردن پێکدێنێت، بەئەندازەی ئەوەی دەرفەت بۆ دەستوەردانی لێهاتوو و کاریگەر دەڕەخسێنێت. بۆیە گرەوەکە، تەماهیکردن و هاوجووتبوون نییە، بەهۆی ئەقڵییەتی ئاوێنە و ڕووناکیدانەوەوە، هەروەها پەردەپۆشکردن و ڕەتکردنەوە نییە، بەهۆی لۆژیکی دوورخستنەوە و ڕەتکردنەوەوە، بەڵکو کارکردنی مرۆڤەکانەیە لەسەر واقیع، بە زمان، چەمک، کەرەستە، سیناریۆ و ستراتیژەکانی خۆیان، بەمەبەستی خوڵقاندن و تیخکردن، یان نوێکردنەوە و گۆڕین، بەشێوەی تێپەڕاندن و پێکهێنان، بەجۆرێک کە بەربەستەکان تێکبشکێن و سنوورەکان تێپەڕێنرێن. بەم مانایە، مەسەلەکە مەسەلەی جڵەوکردن نییە، بەڵکو مەسەلەی گرەوکردنەکانە بۆ کردنەوەی دەستدانەکان.

ئەمەش شیاوە بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی ئەوەی ڕوودەدات و کتوپڕ پێشدێت یان ڕاچڵەکین دەخاتەوە: کارکردن لەسەر دەرهاویشتەکان، بە خوڵقاندنی ئەو ڕوودلوانەی هاوکێشەکان دادەڕێژنەوە و ئەولەویاتەکان ڕێکدەخەنەوە، بەئەندازەی ئەوەی هەلومەرجەکان ڕاستدەکەنەوە و تەرازووی هێزەکان دەگۆڕن. جا ئەگەر ئەمە باری هەر بکەرێکی مرۆیی بێت- کایەکەی و کەرتەکەی و شارەزاییەکەی هەرچییەک بێت- ئەوا ئەرکی سەرشانی بیریارە پیشەکارەکانە: فەیلەسووف و زاناکان، کار لەسەر بیرۆکەکان بکەن بۆ نوێکردنەوە و گەشەپێدانیان لە یەکێک لە ڕووەکانی تێڕوانین و ئاڕاستە، یان کەرەستە و شێوازەوە...

بەوجۆرە ڕووداوە ئاڵۆزەکان پێویستیان بە فیکرێکی ئاوێتەیە، کتومت وەک چۆن ڕووداوە کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوەکان بە خوڵقاندنی چەند ڕوودلوێکی نوێ پێشوازییان لێ دەکرێت کە دەرهاویشتە تێدەپەڕێنێ و پێکهێنانی دیمەنەکە پێکدێنێتەوە، بەئەندازەی ئەوەی سەرلەنوێ هێزەکان لەسەر شانۆکە ڕێکدەخاتەوە.

## پێکەوەبوونی فرەڕەگ:

ڕوویەکی تری خۆپارێزیی فیکری، سەبارەت بە پەیوەندیی لەگەڵ حەقیقەتدا، بێفیزیی ئەخلاقییە، بەجۆرێک کە ڕووناکبیر یان بانگەشەکاری خولیای گۆڕینی جیهان تەویاویەتی خۆی خاوبکاتەوە، هەتاکو لە ساریلکەیی خۆیدا دەربارەی پەیوەندیی لەگەڵ دادپەروەری، یەکسانی، ئازادی و سەرڕاستی نەخنکێت.

ئەم دروشمانە هەمیشە لەلایەن ئەوانەوە پێشێلدەکرێن کە بەرگرییان لێ دەکەن، چونکە بنەچەی بزوێنەر و هاندەر لای خەڵک، داواکردنی دەوڵەمەندبوون و دەسەڵات و

پێگەیە، یان پیادەکردنی بێوێنەبوون و دەرکەوتن و بەئەستێرەبوونە، واتە ئەوەی جیاکارەبوون و خۆپەرستی، یان دوورخستنەوە و چەوساندنەوە، یاخود قۆرخکردن و زەوتکردن دێنێتەئاراوە.

ئەو مەسەلەیەی وادەکات، ئەو بەهایانەی داکۆکییان لێ دەکەین، تەنیا توێکڵێکی ژیواری بن و بەئاسانی پاشەکشەیان لێ بکرێت. ئەگەرنا چۆن ئەوە لێکبدەینەوە یەکێک لە بانگەوازەکەی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە، یان لەگەڵ دژەکەیدا پێکدێت، یاخود وێنەکەی لەسەر شێوەی دوژمنەکەی و ئەوە دروستدەکات کە بانگەشەی بەگژاچوونەوەی دەکات! چۆن لەوە تێبگەین بۆچی خەونە پەمەییەکان و بانگەوازە تەوباوییەکان لەسەر زەمینەی واقیعی مرۆیی مینرێژکراو بە هەوەس و چاوچنۆکییەکان، یان مەراق و دووڵییەکان وردوخاشدەبن! ئەمەش کارەساتی مرۆڤ بـووە لـە بەهەڵەداچوون و ناکۆکـی و ئابڕووچوونەکانیدا. دەشێت تیمێک بخرێتەکار بۆ ڕزگارکردنی گیانلەبەرێک لە چاڵەکەیدا، بەڵام لە بەرامبەردا سوپایەک سازدەکرێت بۆ بەرپاکردنی جەنگێکی پیرۆز کە گەلێک جار دادپەروەرانە نییە، بەتایبەتی کاتێک جەنگەکە سمبولی دەبێت، چونکە چەندین جەنگ لەپێناو هەژموون و بەدەستهێنانی سامان و پێگەدا بەرپادەکرێت، یان لەژێر کاریگەریی ئەو ترس و مەراقانەدا دەخرێنەگەڕ کە خەڵک دەکەنە دوژمنی یەکتر.

ئەمە ئەوەیە کە هەندێک بانگەشەکاری پارێزەری ئیمان و پێڕەوکارانی ئایینەکان دەیکەن، چونکە ئەوانە مەسەلەکانی تایبەت بە حیجابی ژنان بە مەترسی دادەنێن، کەچی گوێ بە خواردنی پـارە و مافەکان نادەن، کە زۆر گرنگتر و مەترسیدارترن لە ڕووتکردنی دەموچاو و مل یان قاچ...

تێگەیشتنی ئاڵۆزو ئاوێتە وامان لێ دەکات، تێڕوانینی ئایدیالیست و ساویلکە و تاکلایەنانە سەبارەت بە مرۆڤ تێپەڕێنین، ئەو تێڕوانینەی بارودۆخێک بەرهەمدێنێتەوە کە مەبەست چاککردن یان گۆڕینیەتی. ئەمەش سەیرنییە، چونکە مامەڵەکردن لەگەڵ شتێکدا لە ڕێگەی دارشتنی چەمکەکەیەوە، ڕێگەیە بۆ ڕاییکردنی، ئەوەش بەدەر لەو تێگەیشتنەی دەبێتە مایەی زاڵکردنی نادیدەیی یان تیرۆر.

با دان بەوەدا بنێین، لە ڕووی پەیوەندییەکانمان بە بەها و چاکەکارییەکانەوە، ئێمە لەوە کەمپایەترین کە بانگەشەی بۆ دەکەین، بۆیە باشترە ئاستی سمبولیی ڕەها و پیرۆزییەکان بێنینەخوارەوە، هەتاکو ئەوە پێشێل نەکەین کە بانگەشەی بۆ دەکەین. ئەمەش مانای وتەی «مرۆڤی هەرە خوارەوە»یە: میرنشینەکانی چاکەکاری بوونیان نییە، چونکە هیچ کەسێک سەرداری خۆی نییە، هیچ کەسێکیش لەویتر شیاوترنییە بۆ نمایندەکردنی بەهاکان، کـە تەنیـا توێکڵی ژیوارن. چونکە بەرپرسیارێتیەکە

دوولایەنەیە، بۆیە هیچ کەسێک بەرژەوەندیی گشتی ناخرێتە ئەستۆی، ئەگەر ئەو هێزانەی وەها نەبن کە چاودێریدەکەن و لێپرسینەوە ئەنجامدەدەن، یان ناڕەزاییدەردەبڕن و ڕەخنەدەگرن.

## چاوی ڕەخنەگرانە:

ئەم هەڵوەشاندنەوەیەی چەمکی مرۆڤ، لە پەیوەندیدا بەوەی بانگەشەی بۆ دەکات، تەبانییە لەگەڵ ئەو وەهمانەی دەربارەی سەردەمە زێڕینەکان و چەرخەکانی ڕۆشنگەری و بەهەشتە زەمینییەکان لە زەینەکاندا هێلانەیانکردوە. چونکە ئەگەر ئەوانە مەیلی ڕەسەن و ڕەگداکوتاو بوونایە، ئەوا بانگەواز و پرۆژە و چاخەکان بەو چارەنووسە بێدەرەتان، یان کۆتاییە کارەساتبارانە نەدەگەیشتن.

لێکدانەوەی ماقوڵ بۆ پێشێلکاری و هەرەسهێنان لەسەر ئاستی بەها و پرنسیپ و نموونە بەرزەکان ئەوەیە، کە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا هۆکارەکانی دژی ڕۆشنگەری، ئەقڵانیەت، دادپەروەری، یەکسانی، ئازادی و ئاشتی هەن و بەبێ ئەوەی بەمێشکماندا بێت لە دنیاکانی ژێرەوە لایەنە شاراوەکان، ناوچە تاریکەکان، یادەوەرییە چنراوەکان بە گرێ و هەستیاری و برینەکان دەکەونە گەڕ و کاردەکەن.

لێرەوە کۆمەڵگە پێویستی بە چاوێکی ڕەخنەگرانەیە بەسەر خۆیەوە، کە کاری لێپێچینەوە و چاودێریکردنی بەردەوام بکات، بۆ بەهێزکردنی ئەو بەهایانەی پەیوەندییان بە ئازادییەکان و مافەکان و بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە هەیە. بەبێ ئەوە خواکان، پێغەمبەرەکان، ستەمکارەکان، جادووگەرەکان و درۆزنەکان زاڵدەبن، بۆ ئەوەی کارەکانی گەندەڵی و پێشێلکاری و ستەمکاری پەرەبستێنن، یان هونەرەکانی بەتارماییکردن و جادووگەری و تاڵانکردن بڵاوبینەوە..

چاوی ڕەخنەگرانە جیاوازیی نێوان دوو جۆر کۆمەڵگەیە: یەکەم ئەوەیە کە تیایدا سەرۆک، ڕژێم، حیزب، دروشم لە دەوڵەت، نیشتمان و میللەتەکان لەپێشترن. وەک باری ئەو وڵاتانەی حەشامات و ڕەوەکان دروستدەکەن، ئەوانەی دەگۆڕێن بۆ ئامرازی ستەمکاری و تیرۆر، بەئەندازەی ئەوەی دەبنە قوربانیی دروشم و سەرکردەکانیان. دووەم ئەو کۆمەڵگانەن کە تیایاندا دەستوور و یاساکان ڕێزیان لێ دەگیرێت و دەرفەت بۆ خەڵک (بەتاک و کۆمەڵ) دەڕەخسێت ئازادییە سیاسییەکان و مافە تاکەکەسی یان ڕووناکبیرییەکانیان بەشێوەیەکی ماقوڵ و قبوڵکراو لەناو یاساو ڕێساکاندا و بە بەکارهێنانی میکانیزمەکانی سیستەمی دیموکراتی و بەشداریکردن لە دابینکردنی بەرژەوەندییەکان یان ئاراستەکردنی چارەنووسەکاندا پیادەبکات.

لەبەرئەوەی کۆمەڵگە ئابرووچوونەکانیەتی و مرۆڤ پارادۆکسەکانێتی و واقیعیش تەڵەکانێتی، بۆیە ڕەخنەگرتن کارێکی وەرزی نییە، بەڵکو ئەرکێکی بەردەوامە کۆمەڵگە لە گشت کایە و ئاست و بازنەکاندا پیادەیدەکات. بۆیە ئەوەی بەردەوام بەهێزنەکرێت دەچێتەوە خۆی و پاشەکشەدەکات. ئەمە ئەو شتەیە ئەو کۆمەڵگانە دەیکەن کە تاکەکان و کۆمەڵەکان تیایاندا بەرپرسیارێتییەکی دووجەمسەر و دوولایەنیان هەیە و هەر یەکێک بەئەندازەی پرسیارکردنی لەخۆی لەوانیتر دەپرسێت، بەئەندازەی پرسیارکردنی لەوانیتریش پرسیار لەخۆی دەکات...

## واقیعی هرۆژمهێن:

واقیع بریتییە لە ئاڵۆزیی زۆری خۆی، بەئەندازەی ئەوەی بزاوتی بەردەوامی خۆیەتی. ئەوەی پێمانوایە نەگۆڕ و نەبزۆکە، لە جوڵە و گۆڕاندایە، جا بەرەو دواوە بێت یان پێشەوە، ئەوەش بەشێوەیەکی کەم، یان لەسەرخۆ، یاخود شاراوە.

بۆیە ئەو ڕووداوانەی کتوپڕن یان ڕاچڵەکین دەخەنەوە، بەرەنجامی ئەو شڵەژان و پارچەپارچەبوون یان تێکشکانانەیە کە دەگۆڕێن بۆ چەند بازدانێکی کتوپڕ، یان تەقینەوەی سەرسوڕمێن، ئەوانەی لەواقیعدا کەوتبوونە گەڕ و کارلێککردن، یان کەڵەکەبوون و پێکهاتن. بەوجۆرە واقیع لە بزاوتێکی بەردەوامدایە، وەک چۆن فیکر لە شڵەژانێکی هەمیشەییدایە. ئەوەی ڕووبەڕووی گۆڕانکارییەکان نەتوانێت خۆی بگۆڕێت، ناتوانێت پرنسیپەکانی خۆی بپارێزێت، بەڵکو نیشانەی نەزانییەتی، هەتاکو بەرەو دواوە بگەڕێتەوە. ئەی چۆن دەبێت کاتێک ئێمە بەهۆی کاریگەریی شۆڕشی زانیارییەکان و کۆمۆنیکاشیۆنەوە دەچینە ناو سەردەمێکەوە، کە سیماکەی سەبارەت بە سمبول، زانیاری، پارە، کەس، سۆزو ئارەزووەکان، بریتین لە خێرابوون و هەڵقوڵان و هەروژمهێنان (٢) و هەڵگەڕانەوە..

ئەوە مانای ئەوە نییە شتەکان ناگەڕێنەوە یان ناگێڕرێنەوە، بەڵام هیچ شتێک وەک خۆی لێ نایەتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی نێگەتیف یان پۆزەتیف، خراپ یان باش، وێرانکەر یان بنیاتنەر دەگەڕێتەوە. ئەمەش باری ئەو ئایینەیە کە گەڕاوەتەوە، وەک هەندێک لە «غەیبزانەکان» مژدەدەن یان هەڕەشەدەکەن. ئەو ئایینەی بەبێ خواناسی دەگەڕێتەوە. ئەمە باری هۆزیشە، بەڵام بەبێ پیاوچاکیی جاهلییەت.

بەو جۆرە گێڕانەوەی ڕابردو و بێسوود و بێبەرهەمە، لەوکاتەدا نابێت کە سەرلەنوێ بخرێتەوەگەڕ، یان بگونجێنرێت، یاخود وەبەربهێنرێت. مەبەستیش لەوە ئەوەیە کە ناکرێت بەشێوازی موحافەزەکار و تەقلیدی ڕووبەڕووی واقیعی «هرۆژمهێن»

ببینەوە، بەڵکو بە لۆژیکی گۆڕانکاریی خوڵقێنەرانە یـان وەبەرهێنانی بنیاتنەرانە ئەوە دەکرێت.

## شوناسی ئاڵۆز:

جیاوازی، پێکهاتەی ئەو جیهانەیە کـە پشتبەستووە بە فـرە توخم و جـۆر، یان ناکۆکیی جەمسەر و دژ بەیەکەکان، جا ئەوە لەسەر ئاستی سروشت بێت یان ئاستی مرۆڤ. هەر هەوڵدانێکیش بۆ سڕینەوەی هەمەڕەنگی، یان ڕەتکردنەوەی جیاوازی ئاکامەکەی سڕینەوەی بوونەوەرو بچووککردنەوەیەتی، یان خنکاندنی زیندوێتی و ئیفلیجکردنی وزەی خوڵقێنەرانەیەتی.

لێرەوە خاوەن فیکری زیندوو و کاری سەرکەوتوو ئەوەیە، کە ڕەچاوی ئەو هەمەڕەنگیو فرەیی و جیاوازی و ناکۆکییەی واقیع لەسەر ئەم یان ئەو ئاست دەکات، بۆ ئەوەی کاریان لەسەر بکات، یان کاریان پێ بکات، ئەوەش بە گۆڕینیان بۆ دەوڵەمەندی و هێز، جا مەسەلەکە پەیوەندیی بە جیهانی سروشتەوە هەبێت، کە لە هەمەڕەنگییەکی بێشوماری توخم و جۆرەکان پێکهاتووە، یان جیهانی مرۆڤ کە بریتییە لە جیاوازیی سەرنجڕاکێشی زاراوە، زمان، ڕەگەز، کولتوور، ئایین و تایەفەکان، ئەمە سەرباری جیاوازیی وڵات، میللەت، دەوڵەت، سیستەم و ڕەگەزەکان، بەڵکو تاقە کەسێک خاوەنی جیهانی تایبەتیی خۆیەتی، بەئەندازەی ئەوەی بێوێنە یان دەگمەنە، وەک ئەوەی لە وەهمەکان و شەبەنگەکانیدا، یان ئارەزوو و چاوچنۆکییەکانیدا، یان هیوا و خەونەکانیدا، یاخود مێردەزمە و تارماییەکانیدا بەدەردەکەوێت... هەموو ئەوانەش چەند هۆکارێکن دەستوەردەدەنە بڕوا و بژار و بڕیارەکانی تاک. لێرەوە هەر چالاکییەکی مرۆڤانە شاراوە و لوغزەکان، یان بەتارماییکردن و وەهمەکانی خۆی هەیە.

بەو جۆرە شوناسی تاک یان کۆمەڵ، جیهانێکی ڕوون و تەبا نییە، بەڵکو پانتاییەکە بۆ فرەیی و ناسیاری، یان سەرچاوەیەکە بۆ شڵەژان و کەرتبوونی نێوان توخم و ڕەهەندەکان، یان ڕووخسار و قۆناغەکان، یاخود مەیل و ئارەزووەکان. ئەمەش سەرچاوەی دەوڵەمەندییە بـۆ کەسـایەتی، بەپێچەوانەی تێڕوانینی کەسـانی تاک ڕەهەند و تاک ڕووخسار.

لێرەوە بواری توانەوەی جیاوازییەکان لەئارادانییە، وەک ئەوەی خاوەن فیکری تاکڕەهەند و هەڵبژاردەخوازی بڕوامەند مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، چونکە بە توانەوە، جیاوازییەکان دەگۆڕێن بۆ تەنگژە یان مینێک کە چاوەڕوانی کاتی تەقینەوە دەکات. شیاو ئەوەیە کار لەسەر جیاوازییەکان بکرێت، هەتاکو بگۆڕێن بۆ

ناوەندێکی چەمکخواز، یان فەزایەکی تاوتوێکردن، یاخود بازارێکی ئاڵوگۆڕکردن.

هەمان شت لەسەر ئاستی ئابووری ڕاستە، چونکە تەنیا تیۆرێکی تاکلایەنە نییە بتوانێت قۆرخی تێگەیشتن و دەستنیشانکردن بکات، یان تاقە مۆدێلێک لەئارادانییە کلیلەکانی پەرەپێدان و بوژانەوە قۆرخبکات. بەوپێیەی تەنیایی یان تاقانەبوون هەژاری و سڕینەوە و ڕیشەکێشکردنە، بەئەندازەی ئەوەی کارگەیەکە بۆ بەرهەمهێنانی قەیرانەکان. لەکاتێکدا فرە تیۆری و فرە مۆدێلی نیشانەی زیندوێتیی فیکر و دەوڵەمەندیی مەعریفەیە، بەئەندازەی ئەوەی سەرچاوەی خستنەوەی کاریگەرێتی و بەرهەمە، لە ڕێگەی کارلێککردنی تێڕوانینە هەمەڕەنگەکان، یان شوناسە جیاوازەکانەوە.

جا لەبەرئەوەی جیهان، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پشێوی و پارچەپارچەبوون، پێکگەیشتن و بەیەکداچوون و تێکهەڵکێشیی زیاتردەبێت، بۆیە ناکرێت یەکێتی پشتگوێ بخەین، بەڵام یەکێتی مانای تەبایی تەواوەتی و یەکگرتنی هەمەلایەن نییە، کە دەبنە مایەی نادیدەیی، یان گۆڕینی جیاوازییەکان بۆ چەند مینێکی کات دیاریکراو لە جەستەی کۆمەڵگەدا.

لێرەوە ئەو یەکە ئاوێتانە پێویستن، کە بریتین لە چەند سیستەمێکی لێککردنەوەو پێکەوەگرێدان، ئەوانەی تایبەتمەندییەکان ناسڕنەوە، بەڵکو دەرفەتی ئەوەیان دەدرێتێ کار لێک بکەن، بۆ ئەوەی دەربکەون و ببوژێنەوە. ئەمجۆرە تێگەیشتنە هەمەڕەنگە ئیشکالیەتئامێزە، شوناس بەڕووی ئەو فرەڕەگکردنەدا دەکاتەوە، کە سەرچاوەی دەوڵەمەندییە، بەئەندازەی ئەوەی توانای دانان بەویتردا دەخوڵقێنێت. چونکە ئەوەی ناڵیاری، پارادۆکس، سەرسمدان و فرەڕەگیی خۆی ببینێت، بیانو بۆ هەڵە و خراپەکاری و جیاوازییەکانی ئەویتر دەبینێتەوە و لەم یان ئەو ڕووەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا یان شاراوە لەگەڵیدا دەکەوێتە گفتوگۆوە.

بەو جۆرە گۆڕان، جا شێوەکەی هەرچۆنێک بێت، پێویستی بە کرانەوەیە بەڕووی ئەو بیرۆکە و چەمک، یان جیهان و خودانەی دووردەخرێنەوە. لێرەوە فرەڕەگکردن دەوڵەمەندی و ساماندارییە، کتومت وەک چۆن ناوەند لەسەر کەنار دەژی، ڕەچەڵەک بە لق دەوڵەمەند دەبێت، نەگۆڕ لە ڕێگەی گۆڕانەوە نوێدەبێتەوە. هەمان شت سەبارەت بە بیریار یان زاناش وایە، چونکە کرانەوەی، بەتایبەتی بە ڕووی دوورخراوە و پەراوێزخراودا، سەرچاوەی گەشەپێدان و دەوڵەمەندکردن و نوێکردنەوەیە.

## نەگۆڕە گۆڕاوەکان:

ئەمجۆرە تێگەیشتنە دەربارەی شوناس ناچارماندەکات چاوبخشێنینەوە بە

مەسەلەی ئەو «نەگۆڕ»انەدا کە لە گوتـاری پارێزەرانی شوناس و پۆلیسی بڕواکاندا دووبارەدەکرێنەوە، سەرەنجامەکەش ئەو هەموو پێشێلکاری و تاوانانەیە. چونکە هیچ شتێک وەک خۆی نامێنێتەوە یان ناگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی خۆی. بەوپێیەی جیهان لە بزاوتی بەردەوامدایە و فیکر لە شڵەژانی هەمیشەییدایە، جا ئەوە بەشێوەیەکی خێرا، یان گەردەلولئاسا، یاخود کتوپڕ ڕوودەدات، یان بەشێوەی کەم، یان خاو، یاخود شاراوە. بۆیە ئەوەی نەتوانێت بگۆڕێت، ناتوانێت نەگۆڕەکانی خۆی بپارێزێت، بەڵکو لێیان لادەدات و پێشـێلیاندەکات، بەئەندازەی ئەوەی گۆڕانکارییەکان دەیخەنە پەراوێزەوە، یان دەبێتە کەرەستەیەکی گۆڕانکارییەکان و ئامێرێک بەدەستی ئەوانیترەوە. بەو جۆرە ئاخاوتن دەربارەی نەگۆڕەکان ئەوپەڕی هەڵخەڵەتاندن و بێئاگاییە، چونکە دەکرێـت بـە لۆژیکی خوڵقاندن و گۆڕانکاری ڕووبەڕووی واقیعی بزۆک ببینـەوە. کەواتە گرەوەکـە بریتیی نییە لە ڕەتکردنەوەی نەگۆڕەکان و دەرچوون لە تەقلید و کەلەپوور، بەڵکو کارکردنە لەسەریان، بەجۆرێک کە چەند پەیوەندیەکی بزۆک، پەرەسەندوو، نوێبوەوە، دەوڵەمەندو کاریگەر لەگەڵیان دروستبکەین، لە ڕێگەی چوونە ناو چەند ناوچەیەکی نوێی بیرکردنەوەوە، یان خوڵقاندنی ڕووبەر و چەند ئاسۆیەکی نوێ بۆ کاری چاکسازی و نوێکردنەوە و پەرەپێدان.

## ڕوانگەی بونخواز:

کرانەوەی زانا یان فەیلەسووف بەڕووی پەراوێزخراو و دوورخراوەدا، بەپلەی یەکەم مانای گۆڕینی تێڕوانینە بەرامبەر بە یەکێک، جا بواری کارکردنی هەرچییەک بێت. ئەوەش بە وازهێنان لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەک پەککەوتەیەک لە ڕووی مەعریفییەوە، یان وەک گەمژەیەک لە ڕووی ڕووناکبیرییەوە، کـە پێویستی بەوەیە کەسانی تر لەبری ئەو بیربکەنەوە و پێشبینی بکەن و تەگبیربکەن. جا ئەوە سەبارەت بە کاروباری تایبەتی بێت، یان سەبارەت بە کاروباری گشتی بێت کە پەیوەندییان بەهەموو خەڵکەوە هەیە.

باشترە بەمەبەستی داهێنان و کاریگەریخستنەوە وەک کەسێک، کە دەتوانێت زیندوێتی بوونخوازی خۆی پیادەبکات و وزەی ئەقڵیی خۆی وەبەربهێنێ، مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، چونکە خەڵک لە بەدەستهێنانی توانای بیرکردنەوە و خەیاڵکردنەوەدا چوون یەکن، بەو پێیەی ئەقڵ ئەو شتەیە کـە بەدادپەروەرانەترین شێوە بەسەر خەڵکدا دابەشکراوە، وەک لە بۆماوەکانی ئیسلام و گوتاری (دیکارتی)دا هاتووە.

جیاوازییەکە لەنێوان یەکێک و ئەویتـردا ئەوەیە، هەیـە بەباشی ئەقڵی خۆی

بەکاربێنێت و وزەکەی بۆ بیرکردنەوەی بنیاتنەرانە و بەرهەمدار وەبەردەهێنێت، بەپێچەوانەشەوە هەیە ئەوە ناکات، نەک لەبەرئەوەی توانای ئەقڵییان نییە، بەڵکو نازانن بەباشی وەبەریبهێنن، ئەوەش لەبەر ئەقڵییەتی دۆگماییانەی ڕەقهەڵاتوو، یان نەریتە فیکرییە ڕێگرەکان، یان شێوازە نەزۆک و سواوەکان، یاخود ئەو وەهم و بڕوایانەی وادەکەن تاک وەک پێنەگەیشتوو ڕەفتاریکات و پێیوابێت کەسانی تر هەن لەخۆی باشتر لە کاروبارەکانی تێدەگەن، ئەمەش وای لێ دەکـات دەستبەرداری تایبەتمەندترین خەسڵەتی مرۆڤ بێت، کە بیرکردنەوەو تەگبیرکردنە.

بۆیە هەر پرۆژە یان کارێکی سەرکەوتوو، فیکرێکی زیندوو و خوڵقێنەر لە پشتییەوەیە، جا ئەوە پەیوەندیی بە قەسیدەیەک، ڕۆمانێک، لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی و تیۆرێکی فەلسەفییەوە هەبێت، یان بە بانقێکی بوژاوە و تیپێکی وەرزشیی سەرکەوتووەوە ... یەکێک لە پارادۆکسەکان ئەوەیە، چەند بیریارێکی پیشەکاری وەها هەن کە بیرۆکەکانی خۆیان نوێناکەنەوە، بەڵکو ئەو قسانە دەربارەی مۆدێرنیتە، ئەقڵانییەت، ڕۆشنگەری، ئازادی و دیموکراسی دووبارەدەکەنەوە، کە دەیان ساڵە بەبێ گەشەپێدان یان دەوڵەمەندکردن دەیانڵێنەوە. بەپێچەوانەشەوە، کارکەری وەها لە کەرتەکانی تردا هەن، کە لە کارەکانیاندا سەرکەوتوودەبن، چونکە بەشێوەیەکی زیندوو و بەپیت و نوێبووەوە و بەبێ تیۆریزەکردن و بانگەشەکردن پەیوەندی لەگەڵ فیکری خۆیاندا دەکەن.

بەو جۆرە، بەبێ گۆڕینی تێڕوانین بەرامبەر بە بکەرەکانی کایە و کەرتەکانی تر لە ڕوانگەیەکی بوونخوازەوە، کە پێیوایە مرۆڤ بریتییە لە توانستە کراوەکان و توانای تیخکردن و تێپەڕاندن و دەستوەردانی لێهاتوانە، بەمەبەستی گۆڕین و گۆڕان بەم یان بەو شێوەیە، دەرفەتی چارەسەرکردنی قەیرانەکان لەگۆڕێ نییە.

## نێوانکاری کارامە:

یەکێک لە کاریگەرییەکانی ئەو تێگەیشتنە، تێکشکاندنی دوانە باوەکانە، بەئەندازەی ئەوەی ژێراوژوورکردنی چەمکەکان، یان گۆڕینی ڕۆڵ و فرمانەکانە لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم، مامەڵەکردنە لەگەڵ تاک- جا لە هەر کایەیەکدا کاریکات- وەک بکەرێکی کارکردو لەو واقیعەدا کە دەکەوێتە ناوییەوە یان لەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژی، بەئەندازەی مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەک شارەزا و بەرهەمهێن، یان داهێنەر لە بواری کارکردنی خۆیدا.

هەموان بەرپرسیارن بەرامبەر بەم مانایە و لێهاتوانە بەشدارن لە چاککردنی

بارەکەیدا، یان چارەسەرکردنی کێشەکەیدا، یاخود بنیاتنانی کۆمەڵگەکەیدا. جا ئەوە لە ڕێگەی چوونە ناو بوارەکانی داهێنان و بەرهەمهێنانەوە بێت، یان لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە بێت لە تاوتوێ و گفتوگۆکاندا دەربارەی مەسەلە تایبەتی یان گشتییەکان. ئەوەی لە بواری بیرکردنەوە و کارامەبوون دووریدەخەینەوە، دووقات نێگەتیڤانە کاردەکات، بەجۆرێک کە کۆششەکان بەفیرۆبچن، یان ئاستەنگ بۆ تەگبیرەکان دروستبن، یاخود پرۆژەکان پەکیان بکەوێت.

دوەم، چەمکی بکەری بەشدار، چەمکەکانی وەک بلیمەت و سەرکردایەتی وەلاوە دەنێت و دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ چەمکەکانی وەک مامناوەندی و ناوەڕاست و نێوانکار، چونکە وەک دەوترێت هیچ کەسێک بەتەنیا و دابڕلو لەوانیتر کارناکات، تەنانەت ئەگەر بنووسێت، نیگاریکێشێت، یان لە ژوورێکی دابڕاوەوە رابمێنێت، لەبەرئەوەی هەرکەسێک لە ناوەندێک یان جیهانێکدا دەژی و تیایدا بیردەکاتەوە و ڕووی تێ دەکات، بەئەندازەی ئەوەی دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە و بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ، بنیاتنەرانە یان وێرانکارانە، پێشکەوتنخوازانە یان پاشکەوتنخوازانە کاری تێدەکات... بەڵکو هیچ کەسێک نییە لەناو کۆمەڵگەیەکدا بژی و حەزی لەوە نەبێت جێگەی دانپیانان و ڕێزگرتن و گرنگیپێدانی ئەوانە نەبێت کە لەگەڵیاندا دەژی و مامەڵەیان لەگەڵ دەکات. با دان بەوەدا بنێین: ئێمە نێوانکاری یەکترین، ئەگەر نەمانەوێ دوژمنی یەکتر بین، ئەوا هەریەکێک نێوانکاری ئەویترە، جا لە موچە و سەرچاوەی بژێویدا بێت، یان لە کایەی کارو شارەزاییدا، یان لەو دەستکەوتانەی بەدەستیاندێنێت، یاخود سەبارەت بەوەی پەیوەندیی بە لێهاتوویی، ڕەوایەتی، مافەکان و شکۆدارییەوە هەیە...

کاتێک چەمکی بکەر، چەمکی بێتوانا یان بلیمەت وەلاوەدەنێت، ئەوا چەمکی ئەو ئیماندارە تێدەپەڕێنێت کە گوێدیرە، یان چەمکی ئەو هاوڵاتییە جێدەهێڵێت کە هەڵبژێرە، چونکە ئەوە تاکی بکەرە ڕۆژانە و مەیدانیانە دەستوەردەدات، بەمەبەستی کارکردن و کاریگەریخستنەوە لەسەر شانۆی کۆمەڵایەتی و لە یەکێک لە ئاستەکاندا.

## تێکشکاندنی نەرجسییەت:

ڕووی سێیەم، تێکشکاندنی ئەقڵییەتی دەستەبژێرانەیە، کە وا لە خاوەنەکانی دەکات پێیانوابێت هوشیاری و مەعریفە قۆرخدەکەن، یان بانگەشەی ئەوە دەکەن کلیلەکانی چارەسەری گشت کێشەکانیان بەدەستەوەیە، جا ئەوە لەسەر ئاستی کەرتێک بێت، یان دەوڵەتێک، یاخود جیهان.

ئەمجۆرە بانگەشەکردنە، کە بە وەهمە نەرجسییەکان مینرێژکراوە، سەرچاوەی

قەیرانەکانە. چونکە لەسەر بنچینەی پەردەپۆشکردن و قۆرخکردن و دوورخستنەوە بنیاتدەنرێت، لەبەرئەوەی بکەرەکان لە کایەکانی کارکردنی خۆیان یان لە دەوروبەر و ژینگەکەی خۆیان دووردەخەنەوە، بەئەندازەی ئەوەی ئەو بیروڕایانەیان فەرامۆشدەکەن کە دەربارەی مەسەلەکانی خۆیان دەیانخەنەڕوو، هەروەها ڕۆڵیان لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەدا فەرامۆشدەکەن کە لەسەر زەمینە و لە مەیدانی کاردا لەگەڵیاندا دەژین.

ئەوەش پارادۆکسەکەیە: کۆمەڵگەیەک کە چەند شارەزا یان بلیمەتێک لەبری ئەو بیردەکەنەوە یان سەرکردایەتیدەکەن، کۆمەڵگەیەکە شایەتیی لەسەر نەزانی و نەزۆکیی خۆی دەدات. چونکە ئەگەر بیرکردنەوەی زیندوو و خوڵقێنەر سیمایەکی مرۆڤ بێت، ئەوا سەبارەت بە بەرژەوەندییەک یان چارەسەرکردنی کێشەیەک هیچ کەسێک لەبری یەکێکی تر بیرناکاتەوە.

ئەگەر بیریارە پیشەکارەکان بەشداربن لەوەی لە واقیع بکۆڵنەوە، ئەوەش لە ڕێگەی ڕۆشناییخستنە سەر کێشەکان و ئاشکراکردنی پەککەوتەیی و دەردەکانیانەوە، ئەوا بیرۆکەکانیان چەند حەقیقەتێکی نێردراو یان ڕەها نین، کە پێویستە کەسانێک هەبن وەریان بگرن و ملکەچیان بن، یان گوێیان لێ بگرن و جێبەجێیان بکەن، بەڵکو پێویستیان بەوەیە کەسانێک هەبن بڕوایان پێ بهێنن و تاوتوێیان بکەن و کار بۆ ئەوە بکەن لە کایەی خۆیان و لەبەر ڕۆشنایی پێوەناڵاندنەکان و ئەزموونی خۆیاندا بیانکەنە واقعێکی هەستپێکراو.

## جیهان و کارگەر:

لێرەشدا باشترە کەسانی جیهانی ئەکادیمی و کارکەران لە ناوەندەکانی توێژینەوەی زانستی و لێکۆڵینەوەی مەعریفیدا بێفیز بن، بەجۆرێک کە دان بەوەدا بنێن کارکەرانی کەرتەکانی تر خاوەن فیکری زیندوو، زانین، زانیاری و ڕۆڵن و پشکیان لە پرۆسەکانی چاکسازی و گەشەپێدان و بنیاتناندا هەیە، جا ئەوە لە کایەی کاری خۆیاندا بێت، یان ئەوەی سنووری تایبەتی تێدەپەڕێنێ و پەیوەندیی بە کۆمەڵگەکانیان یان جیهانی فراوانەوە هەیە.

بەو جۆرە ئێستا وانەکە سەبارەت بە توخنکەوتن یان چارەسەرکردنی ئەو قەیرانانەی زۆردەبن و نوێدەبنەوە ژێراوژووردەبێت، چونکە سەرچاوەی قەیرانەکە لای ئەوانەیە کە بانگەشەی چارەسەرکردنی دەکەن. بۆیە دەرچوون لێی پێویستی بەکرانەوەیە بەڕووی ئەوانەی هەواداری چارەسەر و پێکەوەگرێدان لە پێکهێنانی چارەسەرەکاندا

دووردەخرێنەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە، مەسەلەکە سنووری گۆڕینی تیۆر و مۆدێلەکان تێدەپەڕێنێ، چونکە پێویستی بە ژێراوژووکردنی چەمک و ڕۆڵەکانە، بەجۆرێک کە کەلێنی نێوان زانینە ئەکادیمییە تیۆرییەکان و زانینە پراکتیکییەکان پڕبێتەوە، مەبەست ئەو کەلێنەیە کە کارکەرانی کایەکانی تر دروستیدەکەن.

بۆیە گۆڕانەکە پەی بە ڕێگە و شێواز و میکانیزمەکانی بەرهەمهێنانی زانینە زانستییەکان و تاوتوێکردن و کاریگەرییان دەبات، بەجۆرێک کە ئەو ڕێگە و شێواز و میکانیزمانە پەیوەندییان بە بوونی تێداژیاوو واقیعی هەستپێکراوەوە هەبێت، جا لە ڕووی دارشتنیانەوە بێت، یان لە ڕووی کارپێکردن و گۆڕینیانەوە بێت. بەوجۆرە کاریگەری بەبێ دانپیانانی دوولایەنە، واتە هەریەکێک پشک و ڕۆڵی لە بنیاتنانی کۆمەڵگە و پێشکەوتنی وڵاتەکەیدا هەبێت، لەئارادانابێت.

## تۆڕ و شەریکایەتی:

ڕووی چوارەمی گۆڕانکاری، پەی بە کۆمەڵگە دەبات، وەک ئەوەی لە کرانەوەی بازنە و بوار و ئاستەکان بەڕووی یەکدا بەرجەستەدەبێت، بەجۆرێک کە بەربەستە شاقوڵی و ئاسۆییەکان لە فەزای کۆمەڵایەتیدا تێکبشکێن، جا لەنێوان کایەکانی کارکردن و کەرتەکانی بەرهەمهێناندا بێت، یان لەنێوان دنیای ئەکادیمی و دنیای تیاداژیاودا، یاخود لەنێوان کارگێڕییە حکومییەکان لەلایەک و دامەزراوە شارستانیەکان و چالاکییە ئابوورییەکان لەلایەکی ترەوە، بەجۆرێک کە ئاڵوگۆڕ و کارلێککردنی پێکهاتە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگە و هێز و چالاکییەکانی: دەوڵەت، شارەوانیەکان، حیزبەکان، کۆمپانیاکان، گرتبوونەوە ئەهلییەکان و دامەزراوە مەدەنییەکان بە جیاوازیی ئاراستەی ڕووناکبیری و ئابووری و سیاسیانەوە، ڕوودەدات.

ئەگەر هەر تاکێک، یان کایەیەک، یاخود کەرتێک بایەخبدات بە چاککردن و گەشەپێدانی باروبۆخی خۆی، ئەوا چاککردن و گەشەپێدان کارێکی هاوبەشە. لێرەوە دروشمەکە لە سەردەمی پشت بەیەک بەستن و بەیەکداچوونی بەرژەوەندییەکاندا بریتییە لە: بۆ ئەوەی باشتر بژین، دەبێت بەباشی پێکەوە بژین. ئەمەش کۆمەڵگەی تاوتوێکارە، کە تیایدا چەمکی تۆڕ شوێنی چەمکی دەستەبژێر دەگرێتەوە، گرووپ شوێنی سەرۆک یان فریادڕەس دەگرێتەوە، چونکە ئەو کۆمەڵگەیە وەک تۆڕێکی کارلێککردن پێکدێت و کاردەکات، بەئەندازەی ئەوەی فەزایەک بۆ تاوتوێکردن و گفتوگۆی ئازاد و بەپیت پێکدێنێت.

ئەمەش ئەوەیە کە زاراوەی «شەریکایەتی» بەواتا هەر نوێ و بەجیهانیبووەکەی

گوزارشتی لێ دەکات، جا لەسەر ئاستی دەوڵەت بێت، یان ناوچە، یاخود جیهان بەگشتی. بەوپێیەی مامەڵەکردنە لەگەڵ شوناس و مەسەلە و کێشەکاندا، بە میتۆدی نێوانکاری و ئەقڵیەتی سازشکارانە، یان بە پرنسیپی ڕێژەییبوون و لۆژیکی تاوتوێکردن، یاخود کولتووری هەمەڕەنگ و فرەڕەگکردن...

## ئایین و دەسەڵات:

ڕووی پێنجەم، گۆڕانکارییە لە چەمکی دەسەڵات و میکانیزمەکانیدا، چونکە لەگەڵ چەمکەکانی نێوانکار و بکـەر و شـەریکایەتی و تاوتوێکردندا پەیوەندییە ناوەندییە شاقوڵییەکان لە بەرژەوەندیی پەیوەندییە ئاسۆییە دوولایەنەکاندا پاشەکشەدەکەن، بەئەندازەی ئەوەی کەلێنی نێوان گشتی و تایبەتی، یان ڕادەی سیاسی و کاری کارگێڕی پردەبێتەوە، لێرەوە زاراوەی «حوکمڕانیی باش» لەدایکبوو بۆ گوزارشتکردن لەو گۆڕانکاریانە.

ئێمە لەبەردەم شێوازێکی جیاوازی دەسەڵات و کارگێڕیداین، هەندێک لە خەسڵەتەکانی بریتین لە تێکدانی پەیوەندییەکانی دەسەڵات و تێپەڕاندنی سنووری دەوڵەتەکان یان فراوانبوونی بوارەکانی کارکردن، جا لە ڕووی پەیوەندییەوە بێت بە دەرەوە یان ناوەوە، بەجۆرێک کە دەرفەت بڕەخسێت بۆ بەشداریکردنی گشت بکەرە کۆمەڵایەتیەکان لە خستنەڕووی مەسەلەکان و داڕشتنیاندا، یان گفتوگۆکردن دەربارەی کێشەکان و بەشداریکردن لە چارەسەرکردنیاندا. هەروەها دەرفەت بۆ بەشداریکردنی ئەو بکەرە نێودەوڵەتیانە دەڕەخسێنێت کە دەستوەردانیان زۆربووە و ڕۆڵیان لەسەر شانۆی جیهان بەهێزبووە، وەک ئەوەی لە دامودەزگا و ڕێکخراوە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیەکاندا (مەدەنی و کولتووری و ئابووری...) دەردەکەوێت، کە ئەندامەکان و چالاکوانەکانیان بە نوێنەری حکومەتە جیهانییەکان دەچن و ڕۆڵی هاوڵاتیی کۆسمۆپۆلیتی دەگێڕن.

بەهەرحاڵ، گۆڕانێک بەسەر چەمکی دەسەڵاتدا هاتووە و فراوان و دەوڵەمەند بووە، جا ئەوە لەبەر ڕۆشنایی چەمکەکانی جیهانگیری و حوکمڕانیی باش و شەریکایەتیدا بێت، کە لەگەڵ شۆڕشی زانیاری و کۆمۆنیکاشیۆندا پێکهاتوون، یان لەبەر ڕۆشنایی ئەو کردنەوە فیکریانەدا بێت کە دەریدەخەن (وەک شیکردنەوەکانی میشێل فۆکۆ بەشێوەیەکی تایبەتی دەیکەن) دەسەڵات لە دامودەزگا و دامەزراوەکانی دەوڵەتدا قەتیس ناکرێت، بەڵکو ئەو پەیوەندیانەی کە لە کایە و بازنە و ئاستە جۆربەجۆرەکاندا پیادەدەکرێن و بڵاودەبنەوە، لەوانە بواری ئایینی. ئەم گۆڕانە دەرفەت بۆ تێپەڕاندنی گەلێک دوانە، وەک دوانەی دەوڵەت و ئایین، دەڕەخسێنێت.

بەم مانایە، ئەو ئایینەی گەڕاوەتەوە و هاتۆتە سەر شانۆ دژی دەوڵەت نییە، بەڵکو ئەو دەسەڵات و دەوڵەتانە بنیاتدەنێت کە ستەمکاریی زیاتر بەرهەمدێنن و ژیان دەگۆڕن بۆ دۆزەخ، پێش هاتنی دواڕۆژ. بەو جۆرە مەسەلەکە مەسەلەی هەڵبژاردنی ئایین یان دەوڵەت نییە، بەڵکو ئەوەیە چۆن لە دەسەڵات تێدەگەین و پیادەیدەکەین؟ حکومەتەکان چۆن پێکدێن و چۆن بەرژەوەندییە گشتییەکان بەڕێوەدەبرێن؟

لێرەوە داواکراو لەکارخستنی دەوڵەت نییە، وەک زۆرێک لەو مارکسیستانە نوقلانەیان بۆ لێدەدا و لەناو دۆزەخی فەندەمەنتالیستانە و کارەساتە دلراییەکاندا جارێکی تر داوایانکردەوە. داواکراو ئەوەیە دەوڵەتەکان بە ئەقڵییەتی مۆدێلی ئایدیۆلۆژیانە بەڕێوەنەبرێن، ئەو ئەقڵییەتەی کۆمەڵگە و خەڵک و ژیان دەخاتە خزمەتی دروشم، یان بەخواکردنی سەرۆک، یاخود هەناردەکردنی بڕوا و شۆڕش. چونکە لە هەر شوێنێک مۆدێلە ئایدیۆلۆژییەکان زاڵبووبن، کۆمەڵگەکان گۆڕاون بۆ سەربازگەکان و پرۆژەکانی ریفۆرم و نوێکردنەوەو بنیاتنان شکستیانخواردوە.

سوودبەخش ئەوەیە، دەوڵەتەکان بە ئەقڵییەتی سیاسیی پیشەکار بەڕێوەببرێن، ئەو ئەقڵییەتەی دەخوێنێتەوە و دەستنیشاندەکات بۆ ئەوەی سوود لە دەستدانەکان وەبگرێت و ئامرازەکانی چاککردنی بارودۆخەکان یان چارەسەری کێشەکان بدۆزێتەوە. نموونەکانی وەک (مەهاتیر محەمەد و ئەردۆگان) لەبەردەمماندان، کە کاروبارەکان تیایاندا بە ئەقڵێکی ئاوێتە دەبرێتەڕێوە و تەقلید و ئایینی و نوێکردنەوەی ئابووری، یان شوناسی نەتەوەیی و رەهەندی جیهانی پێکەوە کۆدەکرێتەوە.

لەبەرامبەردا داواکراو لەکارخستنی ئایین نییە، ئەوەش نییە ئایین کۆمەڵگە قوتبدات، بۆ ئەوەی خەڵک بگۆڕێت بۆ قوربانییەکان، وەک ئەوەی تاقیکردنەوەکان لە بەرەی ئاییندا پیشانیدەدەن و توندوتیژی و ماڵوێرانی و بێهودەیی و شێتی زۆردەبن، بەئەندازەی زۆربوونی داخوازی لەسەر کاڵا ئایینییەکان.

بە دەربڕینێکی تر، ئایین وەک دەسەڵاتێکی رەها، یان دەقێکی پیرۆز، یان فەرمانێکی گفتوگۆ لەسەر کراو، یاخود هەڵبژاردنی کەسێک، یان زمانێک، یاخود میللەتێک، بەهۆی چەند وشەیەکی رەواتر و شەریفتر و چاکترەوە، پێویست نییە... ئەوەی پێویستمانە، مامەڵەکردنە بە زمانی بێفیزی و دانپیانان و شەریکایەتی لەگەڵ مەسەلەی ئایینی. بەبێ ئەوە ئایین دەگۆڕێت بۆ میکرۆبێکی رەگەزپەرستانەی کوشندە، کە خەڵک دەکاتە دوژمنی یەکتر، ئەوەش بەجۆرێک خۆزگە بەو تلیاکە بخوازین کە مارکس باسیکردوە.

ئەمەش وام لێ دەکات جارێکی تر لەگەڵ (رێجیس دۆبرییە) ناکۆک بم، کە پێیوایە

ئایینەکان ڤیتامینی لاوازەکانن. من لەگەڵ ئەوەیدام کە کۆمەڵگەکان بەهۆگریوونی شتێک سارێژدەبن کە تێیاندەپەرێنین، بەڵام ئەوەی تاک و توێژ و تایەفەکانی ناو هەر کۆمەڵگەیەک تێدەپەڕێنێ، بەپێویست ئاستێکی پیرۆز، پرنسیپێکی ڕەها، یان ویستێکی سەرەوەیی باڵاڕەو نییە، کە مرۆڤایەتی بە بەڵا و کارەساتەکان نرخەکەی دەدات، وەک ئەوەی جەنگە ئایینیەکان دەیخەنەڕوو، چونکە پیرۆز، ڕەها، تاقو تەنیا و باڵاڕەو، جا دەق بێت یان دروشم، هێز بێت یان دامەزراوە، خەڵک دەگۆڕێت بۆ کۆیلە یان ڕەوە و حەشامات، کەمترین شتێکیش کە دەیکات، ژەهراویکردنی پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکان و وێرانکردنی بنەماکانی ژیانی هاویەشە. ئەوەی لە کۆ بەدەرە، ناوەندێکی تاوتوێکار یان پانتاییەکی گشتییە، جیهانێکی زەمینی یان ئاسۆیەکی ئاوێتەیە، بوارێکی ژیاری یان مەودایەکی گەردوونییە، جەمسەرێکی ڕاکێشەر یان مۆدێلێکی سەرکەوتووە، واتە هەرشتێک کە دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ نێوانکاری و ئاڵوگۆڕکردن و کارلێککردنی نێوان مرۆڤەکان.

## پیرۆزی و کارەسات:

بۆیە ئەوەی کار بە ئەقڵییەتی شەریکایەتی دەکات، کۆششدەکات بۆ تێکشکاندنی لۆژیکی تاکڕەهەند و سەرەوەیی و ڕووەکاتە لۆژیکی هاوتەریبی و هاوسێیەتی، یان ئاڵوگۆڕکردن و کارلێککردن لەنێوان دەوڵەت و بلۆک و جیهانەکاندا، یاخود لەنێوان کایە و کەرت و چالاکییەکاندا...

هەموو ئەوانە پێچەوانەی چەمکەکانی پیرۆزی و خواوەندی و هەڵەنەکردنن، کە هۆ و دەرمانی دەردەکەن. بۆیە دەرفەتی تێگەیشتن لە قەیرانەکان لەئارادانابێت، ئەگەر لۆژیکی بەخواکردن بەهەردوو ڕووەکەی تێک نەشکێنرێ: بەخواکردنی بوونەوەرێکی غەیبی لەلایەن مرۆڤەوە، یان بەخواکردنی مرۆڤ لەلایەن خۆیەوە. ئەم دوانەش دوو دیوی یەک دراوی مرۆڤایەتین، کە لەناو ئەوماڵوێرانییە گەردوونیەدا ڕاستبێژیی لەدەستداوە کە شمشێربەدەستانی ئیمانی ئایینی دروستیدەکەن.

ئەگەر چەمکەکانی بکەر و نێوانکار و شەریک، چەمکەکانی ئیماندار، هاوڵاتی، هەڵبژێر، نوێنەر و زانا، یان فریادڕەسی خاوەنی کلیلەکانی حەقیقەت و پەرەپێدان و ڕێگای ڕاست پیشاندان تێپەڕێنن، ئەوا ناکۆکیشن لەگەڵ چەمکە لاهوتییەکانی وەک خەلیفە و خەلیفەی خوا، کە هەندێک ڕووناکبیری مۆدێرنیست هەوڵدەدەن نوێیبکەنەوە و بەمرۆڤانەی بکەن. ئەمجۆرە چەمکە کێشەکە چارەسەرناکات، چونکە هەوڵدانە بۆ بەلاڕێدابردنی مەسەلەکان، بەئەندازەی ئەوەی کۆششە بۆ بەخواکردن

بەشێوەیەکی تر، کە دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانەوەی واقیع بەشێوەیەکی خراپتر. ئەمەش ئەوەیە کە خەلیفەکانی خوا و نوێنەرەکانی و ئەوانەی بەناوییەوە قسەدەکەن و سێبەری ئەون لەسەر زەوی دەیخەنەڕوو، مەبەست ئەوانەیە کە ناو و سرووتەکانی خوا و وشـە و چەترەکەی بەکاردێنن بۆ پاساوهێنانەوە بۆ گەندەڵی و خوێنڕشتن. بۆیە ئەوەی باشـترە و تێچو و توندوتیژیی کەمترە ئەوەیـە، کـە دان بە کۆتاییهاتن و ڕێژەییبوونی بیروڕاکانمان و دواییهاتنی بارودۆخەکانماندا بنێین، بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی چارەنووسەکانمان و ڕێکخستنی کۆمەڵگەکەمان، بەهۆی دۆزینەوەی ئەو فۆڕم و ڕێسا و ئامرازانەی پێویستیان پێیەتی.

## پیشە و پەیام:

شەریکایەتیش مانای نەهێشتنی چاودێرییە بەسەر شوناس و بەهاکانەوە، بەوپێیەی دابینکردنی بەرژەوەندییەکان و دروستکردنی چارەنووسەکان کارێکی هاوبەشە هەریەکێک لە پێگەو کایەی کاری خۆیەوە بەشداریی تێدا دەکات، ئەوەش بەبێ بانگەشەکردنی لاهوتیانە یان پێغەمبەرانە، جا لەلایەن بانگەشەکاری ئایینییەوە بێت، یان تیۆریستی ناسیونالیستەوە، یاخود ڕووناکبیری مۆدێرنیستەوە..

چونکە پاش ئەو هەموو خراپەکاری و مەترسی و کارەساتانە لە بەرە جۆربەجۆرەکاندا و لەلایەن زۆربەی لایەن و جەمسەرەکانەوە، هەموان ڕاستبێژی و ڕەوایەتیان لەدەستداوە. بۆیە چیتر دوانەی دەستەبژێر و جەماوەر، سەرۆک و حەشامات، ڕێبەر و ڕەوە، زانا و خەڵک، یان فریادڕەس و پەککەوتەی چاوەڕوان سوودبەخش نییە.

پاش کەوتنەخوارەوەی دەمامک و شکستخواردنی تاقە وکیل و چاودێریکردنی پێغەمبەرانەی بەهاو نموونە بەرزەکان لەلایەن تاکێک، کایەیەک، کەرتێک، حیزبێک، یان کۆمەڵگەیەکەوە.. هەمووومان لە پێشێلکردنی ئەوەی داوای دەکەین وەک یەکین. هیچ کەسێک ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات پەیوەندیی بە حەقیقەتەوە هەیە، یان لەگەڵ دادپەروەریدا تەماهیدەکات، یان عاشقی ئازادییە، یاخود لە مەسەلەکەدا دەتوێتەوە.. لەبەرئەوەی مەیلە ئیمپریالیست، ستەمکار، ڕەگەزپەرست، فاشی و هەڵبژاردەخوازەکان ئەو دەردانەن کە ڕەسەنن و لەناو ئەقڵ و دەروونەکاندا ڕەگداکوتاون و هیچ کەسێک لە کاریگەری و ئاسەوارەکانیان قوتاری نابێت. بۆیە پێویستە بەردەوام کار بۆ هەڵوەشاندنەوەو بەگژاچوونەوەیان بکرێت، بەبێ ئەوە لەوە ناگەین چۆن ئەقڵو کارەکانمان کتوپڕ ڕوویەڕووی ئەوەمان دەکەنەوە کە نامانەوێن و حەزیان پێناکەین، یان پێچەوانەی ئەوەن کە ڕایاندەگەیەنینو دەریاندەبڕین! هەروەها تێناگەین چۆن هەڕەشە لە چارەنووسەکانمان

دەکـەیـن، لـەکـاتێکـدا بانگەشـەی داکۆکیکـردن لـە بەرژەوەنـدییـەکانمـان دەکـەیـن!

سەرلەنوێ باشترە بێفیزبین، بەجۆرێک کە دان بەوەدا بنێین هەمووماں خاوەن پیشەین، لەوەشدا فەیلەسووف، بازگان، شاعیر و شۆفێری تەکسی وەک یەکین، ئەوەی کارەکەی خۆی بەباشی بکات، جا پیشەکەی هەرچییەک بێت، بەسوودترە بۆ وڵاتەکەی و پەیوەندیی بە بەهاکانەوە زیاترە لەو ڕووناکبیرەی قسەی بێمانای ئایدیۆلۆژیانە هەڵدەبەستێت، یان ئەو بانگەشەکارەی جادووگەریی فیکری پیادەدەکات.

جا ئەگەر کۆشش و چالاکی و کارەکانی مرۆڤ خاوەن ڕەهەندی سمبولی و مەعنەوی بن، ئەوا هەموان لەمبارەیەوە وەک یەکن. واتە هیچ پیشەیەکی پێغەمبەرانەو ناپێغەمبەرانە لەئارادانییە و هەر بکەرێکی کۆمەڵایەتی پەیوەندیی بە حەقیقەت، دادپەروەری، ئازادی، کەرامەت و مرۆڤایەتیەوە هەیە، بەئەندازەی ئەوەی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ پیشەکەیدا پیادەدەکات، بەمەبەستی خوڵقاندن و نوێکردنەوە و داهێنان. ئەوەی لە کارەکەی خۆیشیدا سەرکەوتوودەبێت و بەشداریدەکات لە بنیاتنانی کۆمەڵگەکەی و چاککردنی جیهانەکەیدا، مافی زیاتر بەدەستدێنێت، بەئەندازەی ئەوەی بەردەوام بەشداریدەکات لە فراوانکردنی ڕووبەری ئازادیدا.

## کاری گەردوونی:

لەکۆتاییدا ئیمرۆ شـەریکایەتی لەسـەر ئاسـتی گەردوونـی بنیاتدەنرێـت، چونکـە چارەنووسەکان و بەرژەوەندییەکان لە سەردەمی ئاڵوگۆڕ و پێکگەیشتنی بەردەوامدا، بەهۆی شۆڕشی دیجیتاڵ و تەکنۆلۆژیا لە بوارەکانی پەیوەندیکردن و زانیاریدا، تێکهەڵکێش بوون.

بۆیە بەئەندازەی بەهێزبوونی ڕێساکانی شەریکایەتی و پێکگەیشتنی دامەزراوەکانی، لۆژیکی پێکدادانی کولتوری و تۆقاندنی ئایدیۆلۆژی، لە بەرژەوەندیی پەیوەندییەکانی کارلێککردنی فیکری و ئاڵوگۆڕی ژیواریدا، بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانەی شارستانیانە تێکدەشکێت. بەجۆرێک کە هەریەکێک پشک و بەرپرسیارێتیی لە دروستکردنی ژیوار، زانیاری، مەعریفە، یان سامان و بەها، یاخود کارگێڕی و کاڵادا هەبێت. ئەمەش ئەوەیە کە لە جیهانی عەرەبدا لەوانە چاوەڕواندەکرێت کە چاودێریی کاروبارەکانی نەتەوە و شوناس دەکەن: دەستهەڵگرتن لە دووبارەکردنەوەی چەمکی هەڵمەتی داگیرکاریی کولتووری و ڕزگاربوون لە بەڕەگەزکردن و بەئیسلامکردنی ئەقڵەکان لەنێوان ئەقڵی عەرەبی و ئیسلامی و خۆرئاواییدا، بەمەبەستی خستنەگەڕی ئەقڵەکان، بەهۆی بەرهەمهێنانی ئەو زانین و بیرۆکانەی کە بەشداریدەکەن لە ڕکابەریی فیکریی چالاکی سەر گۆڕەپانی جیهاندا.

شەریکایەتیش خاوەن ئاستی هەمەجۆرە. جا ئەگەر شەریکایەتییەک لەنێوان دەوڵەت و حکومەتەکان، یان کۆمپانیا و رێکخراوەکاندا هەبێت، ئەوا باشترە شەریکایەتییەکی جیهانی لەلایەن هەموو ئەوانەوە بنیاتبنرێت کە بەرژەوەندییان لە بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی قۆرخکردن، تاکڕەوی، ستەمکاری، گەندەڵی و تیرۆردایە. ئەوەی شمشێربەدەستانی شوناسە ئایینی و ناسیونالیستەکان پیادەیدەکەن بۆ شاردنەوەی کێشەکان و ساختەکردنی ڕاستییەکان و هەڵهاتن لە گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتیی لەسەر هەڵە و تاوانکارییەکان.

ئەو هەڕەشەیەی چاوی بڕیوەتە کۆمەڵگەکان لە ناوەوە دێت، بەئەندازەی ئەوەی لە دەرەوە دێت. لێرەوە ئێستا دابەشکردنەکانی شوناسە کولتووری و کۆمەڵگەییەکان لەسەر بنچینەی ڕەگەز و ئایینەکان تێدەپەڕێنین، پاش ئەوەی شوناسە گەردوونی و ئایینیەکان بوونەتە کێشە بۆ خودی خاوەنەکانیان. شوناسێکی جیهانی لەم سەردەمە گەردوونیەدا پێکدێت، هەموان بە جیاوازیی پرۆژەو ئینتیماکانەوە پیادەیدەکەن و تیایدا فەندەمەنتالیستەکان و عەلمانییەکان، موحافەزەکار و لیبرالیستەکان وەک یەکن. جیاوازی لەنێوان یەکێک و ئەویتردا، لە چۆنیەتی پیادەکردنی هەریەکێکە بۆ شوناسەکەی. هەیە تایبەتمەندیی خۆی بەشێوەیەکی شارستانیانە و تاوتوێکار و بنیاتنەرانە پیادەدەکات، یان بەپێچەوانەوە بەشێوەیەک پیادەیدەکات، کە بە تیاچوون و ماڵوێرانی بۆ هەموان دەگەڕێتەوە.

## پاراستن و چاودێریکردن:

بەوە دەگەینە دوا مەسەلە: چاودێریکردن و پاراستن سەبارەت بە ژینگە و سروشت. ئەم مەسەلەیە، لەناو ئەو مەترسی و کارەساتانەی لە پیسیی ژینگەوە سەرچاوەدەگرن و هەڕەشە لە ژیانی سەر زەوی دەکەن، بۆتە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ.

لە ڕابردووی سەرەتاییدا مەترسی لەسەر مرۆڤ لەلایەن ئاژەڵە دڕندەکانەوە بوو، بەڵام ئیمڕۆ بارەکە ئاوەژوویۆتەوە و مەترسی لەسەر ئاژەڵەکان لەلایەن مرۆڤی شارستانی و شارەکییەوەیە، بەهۆی دەستکردەکان و پاشماوەکانیەوە، ئای چەند مایەی سەرسوڕمانە.

ئەوەتا دڕندەی مرۆیی، بە دەربڕینەکەی (ڕامبۆ)، کە چاوچنۆکی و ڕق و ململانێکان لەسەر دەستکەوت و پێگەکان دروستیدەکەن و گەیشتۆتە ڕادەی ئێسقان شکاندن، تەنیا بە جەنگ و سوتاندن و وێرانکارییەکانیەوە لەسەر زەوی ڕاناوەستێت، بەڵکو هەوڵدەدات ئاگر لە سەر ڕووی مانگیش هەڵگیرسێنێت.

لێرەوە ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیی پیسبوون پێویستی بە کارکردنە لەسەر تێکشکاندنی ناوەندیبوون و نەرجسیبوون و بەخواکردنی مرۆڤ، واتە ئەوەی ئەو خراپەکاری و درندایەتییە بەرهەمدێنێت، بۆ کارکردن بە زەینی چاودێریکردن و پاراستنی سروشت و بوونەوەرەکانی.

## نەرمەهێز:

هەموو ئەوانە پێویستیان بە گۆڕینی شێوازی کارکردن و بەرگریکردنە لە کایەکانی پێشبڕکێ و کێبڕکێدا، بەجۆرێک کە شێوازەکانی توندوتیژیی مادی و سمبولی لەو مەسەلانەدا وەلاوەبنرێن کە داوایاندەکەین، یان بەرگرییان لێ دەکەین، یاخود دووریاندەخەینەوە و ڕەخنەیان لێ دەگرین و پەیوەندییان بە مەسەلە گشتییەکانەوە هەیە و تایبەت نین بە توێژێکی تایبەتی.

ئەی مەسەلەکە چۆن دەبێت ئەگەر لایەنگرانی بەرگریکردن یان بەرەنگاربوونەوە، بۆ داکۆکیکردن لە مافەکان، یان خۆپاراستن لە خراپەکارییەکان ڕاستبێژیی خۆیان لەدەستدابێت، ئەوەش لەبەر ڕۆشنایی تێکشکان و هەرەسهێنانەکان، یان لە ژێر کاریگەریی ئابڕووچوون و کارەساتەکاندا کە کاردەکەن بۆ شکاندنی ئەو ئەفسانە یان بتانەی لە مێشکەکاندا هێلانەیانکردوە، یان ڕەفتارەکانیان کۆنترۆڵکردوە.

باشترین شت دیالۆگی هێمنانە و گفتوگۆکردنی ئەقڵانیانەیە، لە ڕوانگەی تایبەتمەندیی کراوە و شوناسی فرەڕەگ و شەریکایەتیکردنی گەردوونیەوە، وێڕای نەرمەهێز کە ئێمڕۆ بۆتە داخوازییەکی زۆر پێویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژیی هەڵکشاو. دروشمی نەرمەهێز بەشداریکردنی ژنانە، بەوپێیەی توخمی نەرم پێکدێنن، بەجۆرێک کە ڕۆڵی خۆیان بگێڕن و پشکیان لە دروستکردنی چارەنووسەکاندا هەبێت، ئەوەش بە تێکشکاندنی لۆژیکی نێرسالارانەی تاکلایەنە و نێرێتیی پەککەوتە... ژنان لەم بارەیەوە لێهاتوویی خۆیان سەلماندوە، چونکە لێهاتووییان لە ڕاییکردنی کارەکان و بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییەکان و دروستکردنی ژیاندا لەوەی پیاو کەمترنییە.

## پەراوێزەکان:

١- ئەمە نموونەیەکە لەسەر ئەوەی ئەو چەمکە کۆن یان نوێیەی یەکێک لە کەسێکەوەی وەردەگرێت کە دایهێناوەو دایتاشیوە، دەشێت کاری لەسەر بکرێت و وەبەرپهێنرێت. وەک ئەوەی من لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم چەمکە دەیکەم، جا لە خوێندنەوەی قەیرانی شوناسدا بێت، یان لە هەڵوەشاندنەوەی پرنسیپی لێبوردەییدا. لێرەدا هێما بۆ ئەوە دەکەم، لەوانەیە

(شارل تایلۆر)ی فەیلەسووفی کەندەی یەکێک لەو هاوچەرخانە بێت کە تاوتوێی ئەو زاراوەیەی کردوە. هەروەها فەیلەسووفی ئەڵمانی (ئاکسل هۆنت) دەرکەوتووترینی ئەوانەیە کە کاریان لەسەر چەمکەکە کردوە، لە ڕێگەی ئەو بیرۆکە و چەمکانەوە کە تیۆرەکەی لەبارەی ڕەخنەی کۆمەڵایەتییەوە پێکدێنێ، ئەوەی ئەو تیۆرە ڕەخنەگرییە تێدەپەڕێنێ کە (ئەدۆرنۆ) و (دۆرکەهایمەر) دایانڕشتوە و (هابرماس) لە ئەڵمانیا یان (ڕیکۆر) لە فەرەنسا گەشەیانپێداوە. چونکە لەگەڵیدا و لە پشتی دەستوور و یاسا و ڕێساکانی مافەکانی مرۆڤەوە، دانپیانان پرنسیپی دامەزرێنەری سیستەمی کۆمەڵایەتییە. هەروەها لەگەڵ تیۆری (هۆنت)دا لە ڕەخنەی کۆمەڵگەوە هەنگاو بەرەو کۆمەڵناسییەکانی ڕەخنە دەنێین. لەمبارەیەوە بڕوانە ئەو ژمارەیەی گۆڤاری ئیسپری (Esprit) بۆ کارەکانی (هۆنت)ی تەرخانکردوە. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢- پێدەچێت پێویستم بەوە نەبێت هێما بۆ زاراوەی مرۆژمهێن بکەم، کە (زگمۆنت بومان)ی کۆمەڵناس دایڕشتوە، ئەوەش لە کاتی خوێندنەوەکەیدا بۆ گۆڕانکارییەکانی جیهانی بەجیهانیکراودا، چونکە لە جێگەیەکی تردا هێمام بۆ کردوە، بەتایبەتی کە زاراوەکە بەربڵاوبووەو تاوتوێی پێ دەکرێت.

## کاروباری گشتی چۆن بەڕێوەدەبرێت؟

ئەوەی بیریکاتەوە و کاریکات، بەتایبەتی ئەگەر بایەخ بە کاروباری گشتی بدات، پێویستە ڕەوتی بوونخوازی و هەلومەرجی مێژوویی بارودۆخی جیهان، بە تەقینەوە و وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکانیەوە، ڕەچاوبکات، هەتاکو بتوانێت بەچاکی پێشهاتەکان بخوێنێتەوە و قەیرانەکان چارەسەربکات.

چونکە کۆمەڵگەکان ئیمڕۆ کەوتوونەتە ناو واقعێکی گەردوونییەوە، کە لە ڕووی چەمک، پێوانە، بزوێنەر، هێز و یاریکەرەکانیەوە لەسەر شانۆکەی نوێ و جیاوازە، بەئەندازەی ئەوەی کەوتۆنەتە ناو ئاسۆیەکی ژیواریی بەجیهانی و بەگەردوونی بووەوە، جا بەهۆی کەرەستە بێهاوتا و تۆڕەکانی بۆشاییەوە بێت، یان بەهۆی شێواز و شێوەکانیەوە بێت لە بەرهەمهێنان و بەرخۆریدا، وێڕای سیستەمەکانی پەیوەندیکردن و پێکگەیشتنی سنووربڕی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەکان.

ئەوەش لەو مەرجەعیەتانەی مانا و هێلانەی هێز، یان نەخشانەی مەعریفە و بزوێنەرانەی کارکردن، یاخود سیستەمانەی بەرژەوەندی و ستراتیژانەی دەستوەرداندا بەرجەستەدەبێت، کە سەرهەڵدەدەن و پێکدێن، یان شەقڵدەگرن و کاردەکەن، یاخود بەیەکدادەچن و تێکهەڵکێش دەبن. بەوجۆرە ئێمە لەبەردەم بکەرێکی مرۆیی نوێداین، کە کراوەیە بەڕووی فرە شێواز و مۆدێل و مەزهەبدا، بەئەندازەی ئەوەی بەشێوەیەکی ئاوێتە، فرەڕەگەز و نیشتەجێبوون، یان زمان و کولتوور شوناسی خۆی پیادەدەکات. ئەمەش وامان لێ دەکات سەردەمی پیشەسازی و بازرگانیی قورس جێبهێڵین و ڕوویکەینە سەردەمی دیجیتاڵ و بەرهەمهێنانی نەرم، لە مۆدێرنیتەوە بە شەپۆلەکانی سەرەتایەوە هەنگاوهەڵهێنین بەرەو شەپۆلە نوێکان بە زمان و سمبول و ناونیشانەکانیانەوە و بە دینامیکیەتە فیکری و گێڕانەوەخوازییە ئەقڵانییەکانیان و هەستیارییە جوانکارییەکانیانەوە. لێرەوە زاراوەکانی وەک مۆدێرنیتەی بێهاوتا یان هرۆژمهێن و پۆست مۆدێرنیتە لەدایکبوون.

پێدەچێت تایبەتمەندترین شتێک کە باری جیهانیی لە ساتەوەختی هەنوکە و قۆناغی ئێستادا پێی جیکارەبکرێت ئەوەیە، کە مرۆڤایەتی لە کەشوهەوای قەیراندا

دەژی. جا ئەگەر جیهان، وەک ئەزموونەکان دەیسەلمێنن، ماوە نا ماوە رووبەرووی خولە قەیرانێک ببێتەوە، ئەوا قەیرانەکانی لە جیهانێکدا کە خاوەن خەسڵەتی هرووژمهێنان و خێراییە، بە ریتمێکی خێرا و لەسەر ئاستێک زیاتر روودەدەن. ئەمەش وادەکات قەیرانەکە ئاوێتە و نوێبوەوە بێت، بەئەندازەی ئەوەی جیهانی و بەجیهانیکراو دەبێت، وەک ئەوەی هەرەسهێنانە داراییەکان و کارەساتە ژینگەییەکان و خراپەکارییە تیرۆریستیەکان دەیخەنەروو.

لێرەوە چیتر بەرێوەبردنی هەسارەکە و چارەسەرکردنی خولەقەیرانەکانی بەو ئەقڵیەت، شێواز، مۆدێل و تیۆرە باوانە سوودی نییە، کە هیچ قەیرانێک چارەسەرناکەن، یان بەرژەوەندییەک ناهێننەدی، یاخود مەترسییەک دوورناخەنەوە، بەڵکو زیان بەو بەرژەوەندیانە دەگەیەنن کە بانگەشەی دابینکردنیان دەکەن، یان هەرەشە لەو چارەنووسانە دەکەن کە بانگەشەی بەچاکی بەرێوەبردنی دەکەن.

گرەوکردن لەناو ئەو هەموو ترس و مەترسی و کارەساتانەی چاوپانبڕیوەتە چارەنووسەکان ئەوەیە، کە بزانین چۆن ژیانێکی دروست و هاوبەش دروستدەکەین؟ چۆن بەرژەوەندیی گشتی بەرێوەدەبەین؟

لەوانەیە یەکێک قەسیدەیەک، یان رۆمانێک، یان تیۆرێک، یاخود کارێکی هونەری دابهێنێت، لەوانەشە جەنگێکی سەرکەوتوو بەرپابکات بۆ پیادەکردنی ئەستێرەبوون و نەرجسییەت و بەخوابوون و بەرەریبوونی خۆی، بەڵام سەنگی مەحەک ئەوەیە چۆن مەسەلەی پێکەوەژیان بهێنینەدی؟ چۆن زمانێکی هاوبەش، یان ناوەندێک بۆ تاوتوێکردن، یان رووبەرێک بۆ ئاڵوگۆڕکردن لەم یان ئەو بواردا بخوڵقێنین؟

ئەوەش پێویستی بە گۆرانکارییەکە، کە پەی بە بیرۆکەکان، رۆڵەکان، فرمانەکان، وێنەکان ژیان، شێوازەکانی ژیان بەسەربردن و رێساکانی مامەڵەکردن بەرێت، بەجۆرێک کە چەمکەکانی رەچەڵەک، بێگەردی، تاکرەهەندی، پیرۆزی، بەخواکردن، دەستەبژێر، پاڵەوانبازی، قۆرخکردن و سەربازگە... تێپەرێنرێن و رووبکرێتە چەمکە نوێیکانی وەک نێوانکار، دانپیانان، فرەیی، فرەرەگکردن، شەپۆل، رێژەییبوون، زیندوێتی، تۆڕ، تاوتوێکردن، شەریکایەتی و نەرمەهێز...

لەپێش ئەوەشدا پیادەکردنی خۆپارێزی پێویستە، ئەویش بە دەستبەرداربوونی بانگەشەکانی بەخوابوون و بەدەستەوەگرتن، کە دروشمەکان و دەقەکان دەگۆڕن بۆ ئەو بتانەی دەپەرسترێن، یان ئەو زاتانەی پیرۆزدەکرێن، یان ئەو ئەژدیها فیکرییانەی ستەمکاری و گەندەڵی دەخەنەوە، یان درەندەیی وماڵوێرانی بەرهەمدێنن.

ئێمە لە رووی پەیوەندیمانەوە بە ماناو بەها، یان حەقیقەت و دادپەروەرییەوە لەوە

نزمترین، کە بانگەشەی بۆ دەکەین. ئەم دانپیانانە مەرجێکە بۆ قبوڵکردنی ئەویتر، وەک لەتە بوونخوازەکەی تر و مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەک شەریکێکی کاریگەر لە بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییەکان و دروستکردنی چارەنووسەکاندا. بەئەندازەی ئەوەی دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ دەستدانی پێکهێنانی چەند ڕووبەرێکی هاوبەش، بۆ پێکگەیشتنی کۆمەڵگەیی و ئاڵوگۆڕی مرۆڤانە.

ئەمە تەحەددا گەورەکەیە: چۆن وابکەین ژیان لەسەر زەوی و نێوان خەڵک کەمتر تووشی بێدەرەتانی و هەژاری و شڵەژان و توندوتیژی بێت، هەتاکو دڵنیاتر و ئاسانتر بێت و باشتر پێکگەیشتن و هاوکاریکردن مەیسەربکات، جا ئەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵ بێت، یان دەوڵەت، یاخود جیهان بەگشتی؟

# ناواخن

## دەروازە: دەستدان و گرەوکردن



## دەستپێک: بەخوابوون و دڕندەبوون



## بەشی یەکەم: پەتاکان و دەردەکان



## بەشی دووەم: گرەوەکانی نوێکردنەوە



## بەشی سێیەم: پەرەپێدانسازی



## پوختە: بێفیزی/ نێوانکاری/ تێکهەڵکێشی



## کۆتایی: پرسیارەکانی چارەنووسەکان

## هەندێک لە بەرهەمەکانی نووسەر


1. التأويل والحقيقة، دار التنوير، طبعة ثالثة، 2007.
2. مداخلات، دار الحداثة، 1985.
3. لعبة المعنى، المركز الثقافي العربي، 1991.
4. الحب والفناء، الدار العربية للعلوم ناشرون/منشورات الاختلاف، طبعة ثانية، 2009.
5. نقد النص، المركز الثقافي العربي، طبعة خامسة، 2008
6. نقد الحقيقة، المركز الثقافي العربي، طبعة رابعة، 2005.
7. الممنوع والممتنع، نقد الذات المفكرة، المركز الثقافي العربي، طبعة رابعة، 2005.
8. أسئلة الحقيقة ورهانات الفكر، دار الطليعة، 1994.
9. خطاب الهوية، سيرة فكرية، الدار العربية للعلوم ناشرون/منشورات الاختلاف، طبعة ثانية، 2008.
10. أوهام النخبة، أو نقد المثقف، المركز الثقافي العربي، طبعة رابعة، 2008.
11. الاستلاب والارتداد، المركز الثقافي العربي، 1997.
12. الفكر والحدث، دار الكنوز الأدبية، 1997.
13. الماهية والعلاقة، نحو منطق تحويلي، المركز الثقافي العربي، 1998.
14. حديث النهايات، فتوحات العولمة ومأزق الهوية، المركز الثقافي العربي، طبعة ثالثة، 2008.
15. الأختام الأصولية والشعائر التقدمية، المركز الثقافي العربي، 2001.
16. أصنام النظرية وأطياف الحرية، المركز الثقافي العربي، 2001.
17. العالم ومأزقه، نحو عقل تداولي، المركز الثقافي العربي، طبعة ثانية، 2007.
18. أزمنة الحداثة الفائقة: الإصلاح، الإرهاب، الشراكة، المركز الثقافي العربي، طبعة ثانية، 2008.
19. الإنسان الأدنى، امراض الدين واعطال الحداثة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، طبعة ثانية، 2010.
20. هكذا أقرأ، ما بعد التفكيك، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، طبعة ثانية، 2010.
21. تواطؤ الأضداد، الدار العربية للعلوم ناشرون/منشورات الاختلاف، طبعة ثانية، 2010.

# بەرژەوەندییەکان و چارەنووسەکان

## دروستکردنی ژیانی هاوبەش

عەلی حەرب
نووسەر و فەیلەسووفێکی لوبنانییە

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

گرەوکردن لەناو ئەو هەموو ترس و مەترسی و کارەساتانەی چاویانبڕیوەتە چارەنووسەکان ئەوەیە، کە بزانین چۆن ژیانێکی دروست و هاوبەش دروستدەکەین؟ چۆن بەرژەوەندیی گشتی بەڕێوەدەبەین؟

لەوانەیە یەکێک قەسیدەیەک، یان ڕۆمانێک، یان تیۆرێک، یاخود کارێکی هونەری دابهێنێت، لەوانەشە جەنگێکی سەرکەوتوو بەرپابکات بۆ پیادەکردنی ئەستێرەبوون و نەرجسییەت و بەخوابوون و بەریەرییبوونی خۆی، بەڵام سەنگی مەحەک ئەوەیە چۆن مەسەلەی پێکەوەژیان بهێنینەدی؟ چۆن زمانێکی هاوبەش، یان ناوەندێک بۆ تاوتوێکردن، یان ڕووبەرێک بۆ ئاڵوگۆڕکردن لەم یان ئەو بواردا بخوڵقێنین؟

ئەوەش پێویستی بە گۆڕانکارییەکە، کە پەی بە بیرۆکەکان، ڕۆڵەکان، فرمانەکان، وێنەکانی ژیان، شێوازەکانی ژیان بەسەربردن و ڕێساکانی مامەڵەکردن بەرێت، بەجۆرێک کە چەمکەکانی ڕەچەڵەک، بێگەردی، تاکڕەهەندی، پیرۆزی، بەخواکردن، دەستەبژێر، پاڵەوانبازی، قۆرخکردن و سەریازگە ... تێپەڕێنرێن و ڕوویکرێتە چەمکە نوێیەکانی وەک نێوانکار، دانپیانان، فرەیی، فرەڕەگکردن، شەپۆل، ڕێژەییبوون، زیندوێتی، تۆڕ، تاوتوێکردن، شەریکایەتی و نەرمەهێز...

لەپێش ئەوەشدا پیادەکردنی خۆپارێزی پێویستە، ئەویش بە دەستبەرداربوونی بانگەشەکانی بەخوابوون و جڵەوکردن، کە دروشمەکان و دەقەکان دەگۆڕن بۆ ئەو بتانەی دەپەرسترێن، یان ئەو زاتانەی پیرۆزدەکرێن، یان ئەو ئەژدیها فیکرییانەی ستەمکاری و گەندەڵی دەخەنەوە، یان دڕەندەیی وماڵوێرانی بەرهەمدێنن.

ئێمە لە ڕووی پەیوەندیمانەوە بە ماناو بەها، یان حەقیقەت و دادپەروەرییەوە لەوە نزمترین، کە بانگەشەی بۆ دەکەین. ئەم دانپیانانە مەرجێکە بۆ قبوڵکردنی ئەویتر، وەک لەتە بوونخوازەکەی تر و مامەڵەکردن لەگەڵیدا وەک شەریکێکی کاریگەر لە بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییەکان و دروستکردنی چارەنووسەکاندا. بەئەندازەی ئەوەی دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ دەستدانی پێکهێنانی چەند ڕووبەرێکی هاوبەش، بۆ پێکگەیشتنی کۆمەڵگەیی و ئاڵوگۆڕی مرۆڤانە.

ئەمە تەحەددا گەورەکەیە: چۆن وابکەین ژیان لەسەر زەوی و نێوان خەڵک کەمتر تووشی بێدەرەتانی و هەژاری و شڵەژان و توندوتیژی بێت، هەتاکو دڵنیاتر و ئاسانتر بێت و باشتر پێکگەیشتن و هاوکاریکردن مەیسەربکات، جا ئەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵ بێت، یان دەوڵەت، یاخود جیهان بەگشتی؟

MUKIRYANI
ەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PU
WWW.mukiryani.com
٢٠١٢